وەرزنامەیەکی فیکریی ئەدەبی سەربەخۆیە

سەنتەری نما لەهەولێر دەریدەکات

**ژمارە 5ی بەهاری 2001**


---




ناونیشان: کتێبخانەی زانکۆ / هەولێر

کتێبخانەی بەستە/ سلێمانی

کتێبخانەی شێرکۆ/ رواندز

## لەم ژمارەیەدا



---

*جگە لەکاڵوڕۆژنە بابەتەکان ڕاوبۆچوونی نوسەرەکانیان دەردەبڕن.

*ئەو بابەتەی بڵاوناکرێتەوە خاوەنەکەی بۆی هەیە داوای بکاتەوە.

# کلاَورۆژنە

باروو هەل و مەرجی سیاسی ئەم دواییەی کوردستان بەهەرشێوەیەك بێت رامان دەکێشێتە نێو قسەکردن و ئاشکرێ ئێمە وەك گۆڤارێکی فیکریی لەکوردستاندا، چاو لەبەرامبەر واقیع و پێشهاتەکانی بنوقێنین، بەتایبەتی کە لەم دواییانەدا هاوکێشە سیاسییەکان بەرەو ئەگەری جوولاَن دەچن، بەوەی لەلایەك تەوژمێکی بێئومێد و لەسەرخۆ وەبەر ئاشتی نێوان هێزە سیاسییەکانی بەشەرهاتووی کوردستان هاتۆتەوەو سەرجەمی ئەو بارەش پەیوەندییەکی راستەوخۆی بە مانەوەو نەمانەوەی ئەو دەڤەرە ئازادەوە هەیە،کە کۆمەلَگای تازە گەشەسەندووی کوردیمان دەیەوێ لەسایەی ئازادیی بەدەست هاتوویدا بیر لەژیان و گوزەرانی خۆی بکاتەوەو هەناسەیەك لەدەروازەکانی ئومێدی بدات و خەونی لەدەستدانی ئەم دەستکەوتەش زیندەبەچالَ بکات، وەلێ ئەوەی لەم ماوەیەدا دێتە بەر دیدی ئێمەی ئەوەکانی ئازادی، چەندین هاوکێشەی ترسناکی سیاسی و سەربازین، لەدەوروبەری هەرێمی کوردستان وجێگای پرسیاریشە کە بلێێن ئاخۆ کەی حزبە سیاسییەکان لەرێگای ریفراندۆم لەنێو خەلَکدا ئامادەو رای زۆرینە بۆ بریارە سیاسییە چارەنووسسازەکان وەردەگرن، ئاخۆ گفتوگۆ لەگەل رژێمی عێراقی، پێویستی بە راپرسی خەلَکەوە هەیە، یان بەوەی کۆمەلاَنی خەلَك لەسەر دەمی کاربەدەستانی رژێم بیزانن؟ لێرەوە دەلێین ئەو بارودۆخەی ئێستا لەئارادایەو کەوتۆتە بەر منگەمنگی سیاسەت و سەرکردایەتی سیاسی کوردی و لەوانەیە هێزە سیاسییەکانی کوردستان بەشێوەیەك لەشێوەکان موزایەدە لەسەر خەلَکی کوردستان بکەن و لەبەرامبەر یەکیشدا لەجیاتی پەلەکردن لەئاشتی یاری زەمەنی مردنی ئەو ئازادییە بەرێوەببەن، پێویستە لەوە تێبگەین کە دۆزی کورد تەنها دۆزی سەرکردایەتی سیاسی کوردستان نییە، هەر دانوستانێکیش ئەگەر سەرجەمی ئازادییەکانی خەلَکی کورد لەمافی چارەخۆنوسین لەرێگای ریفراندۆمێك کە دەتەوەیەکگرتووەکان سەرپەرشتی بکات بەدەست نەهێنێ، ئەگەرێکە ئەمانباتەوە بەردابەش بوونی کۆمەلَگای کوردی لەلایەنی سیاسی و مەسەلەی هەلَبژاردنی ژیان لەگەل کێدا؟ بۆیە ئەو مەسەلەیە بەهیچ شێوەیەك کەمتر نییە لەچەندین سالَ خەباتی سیاسی و

چەکداری کورد لەپێناو ئەو ئازادییەی ئێستا هەیە لەگەڵ هەموو کەم و کورتی و لایەنە جوان و ناجابیەکانیشی، کە پاراستنی ئەرکی زیندەتری دەوێت. لێرەوە گەرەکە بڵێین دانوستانی سیاسی لەگەڵ ناوەندێکی دیموکراتیدا کاتێك دەکرێ بوونی هەبێ بۆ کارکردن لەسەر خواستی لەبەدەستهێنانی مافی فیدراڵی لە کوردستان و، بەپێی گونجان لەگەڵ ئەو سیستەمەی کە لە عێراقی ئایندەدا حوکمدەکات، بەپێچەوانەوە ئەگەر سەرکردایەتی سیاسی ئێستای کورد، باوەڕی بەهەر شێوەیەکی گەڕانەوەو دانوستانی جیا لەمە هەبێ لەگەڵ ڕژێمی ئێستای بەعس لەعێراق، ئەوا سەددەرسەد ئەو بۆچوونە جێگای قەبوڵ نییەو دژبەخواستی زیاتر لە 80٪ ی خەڵکی کوردستانە. ئەمەش لەو پێودانگەوە قەبوڵ نییە کە ئەگەر سەرکردایەتی سیاسی خۆی بەخاوەنی شۆڕش و ئازادی وەدەست هاتووی ئەم دەساڵە بزانێ ئەبێ درك بەوەش بکات کە ئەوەکانی ئەم سەردەمەی ئێستای کوردستان کە ڕۆڵیان لە بەکۆمەڵگا بوون و گەشەسەندنی کوردستان هەیە بەهیچ شێوەیەك ناتوانن، لەگەڵ ڕژێمی ئەنفالچی و کیمیاباران و جینوسایددا، هەڵبکەن و مەبدەئی پێکەوەژیان هەڵبژێرن ، بۆیە واباشە بیر لەمقاوەمەت لەهەموو لایەنەکانەوە بکرێتەوە بۆ ڕاوەستاوی ئەوبارە ئازادییەی کە هەیە لەبەرامبەر هەر هەرەشەیەکی حکومەتەکانی داگیرکەری کوردستان.

ئەمەو لەلایەکی دیکەوە هاوکێشە سیاسیەکان ئاماژە بەو ئەگەرو ترسەی سەرەوە دەکەن کە ئێستا ئێوەندی سیاسی و ڕاگەیاندنی کوردی گرتۆتەوەو ڕژێمی دیکتاتۆری عێراقیش کەوتۆتە هەڕەشە لەو هەرێمەی ئێمە، لەبەرامبەریشدا یەکگرتووی گوتاری سیاسی بوونی نییەو هەر حیزبەو بەپێی بەرژەوەندییەکانی خۆی وەڵامی ئەو هەرەشانە دەداتەوەو دۆزەکە لەسیاسەتی حیزب بەولاوە هیچیتر تێناپەڕێنن، کە بێشك ئەم مەسەلەیە، کاریگەری سلبی لەڕووی نەبوونی هێزێکی یەکگرتوو لەبەردەم ئەگەرەکان دەبێ و بێ ئومێدی دەخاتە ئەو متمانەیەی کە کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان بە ئیدارە کوردییەکانیان داوە، بۆیە لەدوای ئەم ئاماژە کردنە ئەم بابەتە گرنگە بەچەند پرسیارێك جێدەهێڵین کە: ئاخۆ کەی ئیدارە کوردییەکان هەست بەهەڕەشە بەردەوامەکانی ڕژێمی عێراقی و داگیرکەرە هەرێمیەکان دەکەن؟ کەی سەرکردایەتی سیاسی لەمەسەلە چارەنوسسازەکان فێردەبێ بەمانایەکی دیموکراسیانە ریفراندۆم لەگەڵ خەڵکی خۆیان بکەن؟ ئەو ئازادییەی ئێستا هەیە هی حزبە یان هی خەڵك؟ ئاخۆ خەڵکی کوردستان دوای دەساڵ گۆڕان و بەرهەم هێنانی کەلتوور و ژیارێکی جیاو زیندووکردنەوەی ڕۆحی نیشتیمانی و نەتەوەیی خۆی ئامادەیە ئەو ئازادییە بەئاسانی تەسلیم · حیزب وبەرنامە بێ بەرنامەکانی بکەن؟ ئەی کە هێزێکی نیشتیمانی یەکگرتوو

ئەبێ دیفاع لەخاکی وڵات بکات، دەبێ چاوەڕێی چ ئەگەرێك بکەین؟ ئاخۆ تەسلیم بوونی سەرکردایەتی کورد بە بیرکردنەوە لەدانوستانە بێئەنجامەکان لەگەڵ ڕژێمە یەك بەدوای یەکەکانی عێراقی عەرەبی، تەسلیم بوونی ئیرادەی خەڵکە بەهیزب؟ لەگەڵ چ ڕژێمێك ئەکرێ کورد بژێت، ڕژێمێکی دیموکراتی کە دان بە مافی نەتەوەیی کورد دابنێت یان ڕژێمێك کە پێیوابێ " گەلی عێراق یەك گەلن و یەك مێژوون و یەك شارشتانیەتن؟ ئەی سەرکردایەتی سیاسی نازانێ کورد نەتەوەی جیایە لەعەرەب و کەلتوور و شارستانیەت و مێژووی جیاوازی هەیە؟ ئەی نازانێ مێژووی ئێمە هەمیشە لەسەر دەستی ئەوانەی ئەمڕۆ پێیان وایە ئێمە یەك نەتەوەین ڕەش و تاریك کراوە، مێژووی ئازارو ئەهامەتیەکانە؟ نازانێ مێژووی ئەوان مێژووییەکە لەسەر داگیرکاری و لەناوبردنی ڕەگەزی ئێمە بونیادنراوە؟ بۆیە کورد لەم قۆناغەدا پێویستی بە بیرکردنەوە هەیە لە چارەسەری مەنتقی و واقیع بینانە لەبەرامبەر دوژمنەکەی و بەرپرسیارێتی مێژوویی بەرامبەر بەگەلی کوردستان پێویستیشە سامانی بەهەدەر چووی کورد لە مقاوەمەتی پارێزگاری لەئازادی و خاك سەرف بکرێت و لەپێناو گەشەی ژێرخان و سەرخانی ئابووری کوردستان بخەبتێن و مەسەلەو کێشە سیاسی و ناکۆکیەکانی ناوخۆ تاتەکرێ وەلا بنێن و لەبازنەی ستراتیژیەتی دوژمنەکە کار بۆ ڕزگاری نیشتیمانی و نەتەوەیی بکەین، تاوەکو کۆمەڵگای ئێمەش بزانێت کە حیزبە سیاسیەکان ئەگەر خاوەنی بەرنامەو پرۆژەی سیاسیی ڕزگارین، پێویستەکات پەلە لە ئاشتی و پێکەوەژیان بکەین و ڕێگا لەدابەش بوونی سیاسی و کۆمەڵایەتی کۆمەڵگاکەمان بگرین، لەبەردەم مەسەلەو پێشهاتە چارەنووسسازەکان.

(نما)

## سوپاس و پێزانین

بەناوی گۆڤاری نماو دەستەی نوسەرانی سوپاسێکی پڕ بایەخی بەرێز کاک(رەوشت رەشید) دەکەین کە لەساڵی یەکەمی دەرچوونی گۆڤارەکەمان ئەرکی بەرێوەبەری نوسینی گرتەدەست و بێ کەم وکوڕی بەرێوەی برد، ئێستاش کە گەڕی دووەمی دەرچوونی گۆڤاری نمایە لەسەر داواو بەرەزامەندی خۆی و لەبەر سەرقاڵبوونی بەخوێندنی دوا قۆناغی کۆلێژی پزیشکی، ئەم ئەرکەی دایەوە دەست گۆڤاری نما . سەنتەری نماو سەرجەم ئۆرگانەکانیشی وەك رێزلێنان لە بەرێزی و ماندووەی وەك خاوەنێکی پرۆژەکە پێی باش بوو وەك راوێژکاری نما ،کەشایەنی زیاتریشە بەشداربو درێژە پێدەری سەرکەوتنەکانی نما بێت و بەقەد تەمەنی جوانیەکانی پرۆژەکەو خۆشەویستی تایبەتی سەرنوسەری گۆڤاری نما رێز لەماندووبوونیەکانی دەگرین.

### سوپاس و رێزمان بۆ:

(کاك فەرۆخ نیعمەت پوور و محەمەد نووری ئەحمەد) کە تاوەکو ژمارەی چوارەمی گۆڤارەکەمان لەگەڵماندا وەك دەستەی نووسەران بەشداربو پشتیوان بوون، لێرەوە سوپاسی ئەرك و ماندووبوونیان دەکەین. جیالەمەش لەسەرداوای ئێمەو رەزامەندی دەربڕینمان هەر (دەست لەکارکێشانەوەیەك) کرابێت لەرێکەوتی گەیشتنی قەبوڵ بووەو نما بەپێویستی نەزانیوە بەرەسمی وەڵام بداتەوەو کاتی خۆی بەو بابەتانە بەفیڕۆ بدات.

سەنتەری نما
بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی و ئەدەبی
لە هەولێر

# جاك دريداو تيۆرى هەڵوەشاندنەوە

ن : خالدە حامد تسكام

و: نوورى بێخاڵى

**لە دواى** بونيادگەرى،هەڵوەشاندنەوە بە گرنگترين بزاڤى نێو رەخنەى ئەدەبى دادەنرێ،رەنگبێ بزاڤێك لەناو رەخنەى ئەدەبيدا نەبێت وەك ئەوەى هەڵوەشاندنەوە لەم ساڵانەى دواييدا كردى،بەجۆرێك شەپۆڵەكانى خەڵكى سەرسام كرد،ئەمەو وێراى ئەوەى كەلەمەر بزاڤێكى دى زياتر گفتوگۆو وتوێژى وروژاند.بۆ نموونە لەلايەك دەبينين هەندێك لە رابەرو كۆڵەگەكانى رەخنە،وەكو(ج.هيليس ميلەرو پۆڵ دى مان و جيفرى هارتمان و هارۆڵد بلوّم) وێراى جياوازى شێوازى كاركردنيان لەسەر هەردوو ئاستى بەرجەستەكردن و تيۆرى،بەڵام هەڵوەشانەوەيين،لەلايەكى تر زۆر لەو رەخنەگرانەش دەبينين كەلە خانەى رەخنەى كلاسيكيدان،بێزارى خۆيان لەو بزاڤە دەردەبڕن و،ئەو تيۆرە بەشتێكى پوچ و دڕندەو تێكدەر دەزانن،ئەمە لەكاتێكدايە كە هيچ ناوەندێكى فكريش چ لە ئەورووپا يان ئەمريكا سەبارەت بەبەهاى ئەو تيۆرە نوێيەى رەخنە لە گفتوگۆ خاڵى نەبوون.

ئايا بەراستى هەڵوەشاندنەوە وێرانكەرە؟ئەگەر وەڵامەكە نەرێيە ئەمە چۆنەو بۆ وايە؟ئەگەريش وەڵامەكەى نەرێيە،ئەو ترسە لەپاى چى؟ديارە دواى تێگەيشتن و هەڵسەنگاندنى چەمكە بنەڕەتيەكانى هەڵوەشاندنەوە نەبێت ناتوانرێ وەڵامى ئەو پرسيارانە بدرێتەوە.پێدەچێ باشترين بابەتيش كەلێيەوە دەست پێبكەين بۆ بەدواداچوونى مەبەستەكەمان،پەرتووكى (زانستى نووسين–of grammatology)بێت.ئەو پەرتووكەى كە بەزمانى هەڵوەشاندنەوە دادەنرێت و،ئەو كارە ديارو ناسراوەيە كەفەيلەسوف و رەخنەگرى فەرەنسى(دريدا)جێبەجێى كردووە.

پێم وایە ئەمە لێکۆڵینەوەیەکە دەیەوێ دریداو تیۆرەکەی لە هەڵوەشاندنەوە بخوێنێتەوە،ڕووبەڕووی دوو ئاستەنگی سەرەکی دەبێتەوە.یەکەمیان دەرهاویشتەی شێوازی خودی دریدایە کەبە ورووژاندنی سەرسامی دەناسرێتەوە.ئەمە وێرای ئەو چەمکانەی بەکاریدەهێنێ.دووەمیان زنجیرە راوبۆچونێکی رەخنەیین کە بەچەند تەئویلێکی ناتەواو، یان تەئویلی خراپی misinterp retations intereretations شیمانەکراو دادەنرێن. ئەمەو سەرەڕای تیشك خستنە سەر چەند چەمکێکی گران کە دریدا پێکیهێناون. کەدواتر خۆم بەر لەدەست پێکردنی پێشەکی وەسفیو هەڵسەنگاندنی چەمکەکانی هەڵوەشاندنەوە کار لەسەر بەدیارخستنی هەندێك لەو لێکدانەوە رەخنەییانە دەکەم.

(م.ه.ئەبرامن) جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە دیارترین بەش لەتیۆری دریدا بریتییە لە:

1-دریدا لێکۆڵینەوەی خۆی لەزمانەوە دەگوازێتەوە بۆ نوسین، واتا دەقی نوسراو یان چاپکراو.

2- دریدا دەق بەرێگایەکی دیاریکراوی نائاسایی وێنا دەکات.

(ئەبرامن) بەتەنها مەبەستی سادەکردنەوەی پێگەی دریدا نەبووە، وەکو هەڵوەشێنەرێك لەرێگای هاوتاکردنی لەگەڵ بونیادگەرە فەرنسیەکانی تر، بەڵکو تا ئاستێکی زۆر ئەوە بینراوە،لەکاتێکدا هەوڵی پێناسەکردنی هەندێ وشەی بنەڕەتی‌داوە لەرەخنەی هەڵوەشاندنەوەدا.وەکو (نوسین-ecriture)و (دەق- text)، ئەوەشی روونکردۆتەوە کە نوسین لای دریدا دەقی نوسراو یان چاپکراو دەگەیەنێ،چەمکی دەقیش بەشێوەیەکی نائاسایی چەمکێکی سنورداره.

لەدرێژەی هەڵسەندگاندن و قسەکردنم لەسەر دریدا، دەیسەلمێنم کە ئەو شتەی ئەبرامز هێناویەتە ئارا،شتێك نییە جگە لەکۆمەڵێك تەئویلی خراپ،کە تیایدا ماهیەتی هەڵوەشاندنەوەمان بۆ باس ناکات،بەڵکو باسی کۆمەڵێ شت دەکات کە هیچ پەیوەندیەك بەهەڵوەشاندنەوەیان نابەستێتەوە.

یەکێکی تر کە قسە لەسەر دریدا دەکات ، نیوتن گارفەرە، گارفەر جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە دریدا یەکێکە لەفەیلەسوفەکانی زمانو، پێ لەسەر پێشینەی رەوانبێژی بەسەر

لۆژيك دادەگرێت: دريدا دەچێتە ژێر ئالاّى ئەو بزاڤەى وا دەروانێتە ئەو كاريگەرييەى كە دەربڕينەكان( utterances) لەگوتارى پراكتيكدا هەيانە، بەو پێيە نوێنەرى زمان و مانايە،ئەوەى دەبێتە هۆى ئەو پرۆسەيەش ئەوەيە كە لۆژيك بەهەڵێنجراوى هەندێ (ئيعتباراتى)رەوانبێژى دەزانێ.

ئەو بيانووەى كە دەڵێت هەڵوەشاندنەوە كايەيەكى ئەبيستمۆلۆژيى رەوانبێژييە، پاڵپشتى لەلايەن هيليس ميللەر- بەدەست هێناوە كە دەڵێ: هەڵوەشانەوە بريتييە لە گەڕان بەدواى ئەو ميراتەى كە مەجاز و چەمك وگێڕانەوە يەك بۆ ئەويتر جێدەهێڵن، لەبەر ئەوە هەڵوەشاندنەوە كايەيەكى ئەبيستمۆلۆژى رەوانبێژييە. موراى كريگەر پێيوايە كە دريدا بونياگەرێكى رەخنەييەو بەسەر ئەو تيۆرەدا سەركەوتووەو شەكەتى كردووە، لەوانەيە لەكاريشى خستبێ، لەدرێژى قسەكانىدا دەڵێت : ئەو هێرشەى دريدا كرد، جۆرو شێوازێكى نوێكەرترە لەو هێرشە كلاسيكيەى كە ئافلاتوون كردييە سەر شاعير ، بەوپێيەى دروستكەرى ئەفسانەكانە.

هەروها-فريدريك جێمسۆن- جەخت لەسەر ئەوەدەكاتەوە كە هەزرى دريدا، وەهمى دەربازكردنى ميتافيزيك و هەڵاتن لەنموونەى كۆن بەمەبەستى دۆزينەوەى نوێ‌و شتى نەدۆزراوە رەت دەكاتەوە.

دەكرێ ئەو قسانە چاوكى چاوبەستكردن بن، ئەگەر وەك بەيانێك يا هەڵسەنگاندنێكى ساغ بۆ تيۆرى دريدا سەيريان بكەين، ئەمە وێراى ئەو سوودەى لەبەردەوامى لێكۆڵينەوە لەهەڵوەشاندنەوەدا هەيە.كەواتا كاتێك ئێمە دريدا دەخەينە ريزى فەيلەسوفەكانى زمان كە پێيان وايە لۆژيك هەڵێنجراوى رەوانبێژييە، ئەوا بەم تێكەيشتنە رێگا لەبەردەم تواناى درككردن بەنوێگەرى بيرۆكەكانى دريدا دەگرين،بەهەمان شێوە بەراورد كردنى دريدا بەئافلاتوون و، جەخت كردنەوە لەسەر ئەوەى كە دريدا ململانێى كۆن لەگەڵ ئەفسانە(myth) دووبارە دەكاتەوە، زيان گەياندنە بەپێگەى دريداو جەختكردنەوەيە لەسەرئەوەى كە دريدا شتێكى ئەنجام نەداوە جگە لەگواستنەوەى گرنگى ( قسە) بۆ (نوسين)، ئەم تەسككردنەوەيەى دەقيش لەخانەيەكى تايبەتدا، لەراستيدا خراپ لێكدانەوەيە،بۆيە

پێویسته مرۆڤ لەکاتی نزیککردنەوەی ئەو سەرچاوە لاوەکیانەی هەوڵی تێگەیشتنی دریداو تیۆری هەڵوەشاندنەوە دەدەن وریا بێت. بۆیە دەبینین لەم نێوەدا رەخنەگرەکان بەسەر دوو گرووپدا دابەش بوون.. یان ئەوەتا لەتێگەیشتنی دریدا کورتی دێنن یان ئەوەتا بیرۆکەکانی بەخراپی دەخوێننەوە،بۆیە لەو حاڵەتەدا ناکرێ پشت بەمادەو سەرچاوەی لاوەکی ببەسترێت و بەرێچکەو رێگایەك دابنرێت کە دەمانگەیەنێتە دونیای هەڵوەشاندنەوە.بەلاّم لەگەڵ ئەمەشدا هەندێ رەخنەگری وەك (هارۆلد بلۆمو هیلیس میللەرو پۆڵ دی مانو جێفری هارتمان) هەن کە لەئاستی رەسەنێتی دریدا دان، بەلاّم هەریەکەیان قوتابخانەیەك دادەمێن کە بەدەگمەن وەك یەکەم گەورە مامۆستای هەڵوەشاندنەوە (دریدا) دەخوێننەوە.

لەبەرئەوە تێگشیشتن لەدریدا بەیەکەم هەنگاو دادەنرێت لەسەر رێگای تێگەیشتنی هەڵوەشاندنەوە . کەواتە گومانیشی تێدا نییە کەهەنگاوی یەکەم پێویستی بەوە هەیە لەبیرۆکەکانی دریدا نزیك بینەوە.

دەتوانین بڵێن کە تیۆری هەڵوەشاندنەوە پێویستی بەشیکردنەوەی زۆر و نوێ هەیە ، هەر هەوڵێکیش کە هەر رەخنەگرێك بیدات و بیەوێت ئەو تیۆرە شیبکاتەوە، پێویستی بەپێناسەکردنی هەڵوەشاندنەوە نییە. چونکە تیۆرێکی بەم چەشنەئاڵۆز و بەیەکدا چووە پێناسەی گەرەك نییە. بەپێچەوانەوە لەتوانای مرۆڤدا هەیە کە هەوڵی راڤەکردنی ئەو چەمکە بنەڕەتیانە بدات کە دریدا بۆ وێرانکردنی رەخنەی کلاسیکی و ئاسانکردنی کاری هەڵوەشاندنەوە دایڕشتووە.. ئەمەش یەکەم هەنگاو دەبێت کە لەم خوێندنەوەیەمدا ئەنجامی دەدەم و، دەمەوێ دوای وەسفکردن و راڤەکردنی ئەو چەمکانەی دریدا هێناویەتە ئارا، وەلاّمی ئەو پرسیارە بدەمەوە کە دەڵێ:هەڵوەشانەوە چۆن دەتوانێ سەرلەنوێ رەخنەی ئەدەبی ناراستەبکات؟ دوای ئەوە لەقۆناغەکانی کۆتایی شیکردنەوەکەمدا ئەوە رووندەکەمەوە کە ئەو شتەی کە بەپوچ وەسفکراوە بەو شێوەیە نییە، بەڵکو هەڵوەشانەوە چەندین ناوەرۆکی رۆحی هەیە.

شایەنی وەبیر هێنانەوەیە(نوسین و قسەکردن ) دوو پەیڤی تەوەرین کە دەتوانرێ بەهۆیانەوە تێگەیشتنمان بۆ ئەو تیۆرە دەست پێبکات.ئەم دوو پەیڤەش لە چەمکە

کلاسیکیەکانی زمان مانایەکی تایبەت بەخۆیانەوە دەبینن و، ئەو چەمکانە باس لەپێشینەی قسەکردن لەسەر نوسین دەکەن و وشەی گوتراو (دەنگ-phone) وشەیەکی دەرەکی نییەو توانای سڕینەوەی خودی هەیە، وەك چۆن وشەی گوتراو بەوێنەی دەنگی بیستراو پێناسەکراوە، وەزیفەکەی ئامادەکردنی ئەو چەمکەیە کە وێنەی دەنگی بەرامبەر دەبێتەوە،وشەی گوتراویش یان وێنەی دەنگی، لەکاتی ئامادەکردنی چەمکەکەدا لەبارێك هەڵدەوەشێتەوەو لەبەر ئەمەو بەو پێیەی کە دالە(signi fier) خودی خۆی لەبەردەوامی دەستنیشان کردنی مەدلول( cignified) دەسڕێتەوە، ئەو مەدلولەی کە لەهەر شتێکی تر گرنگترەو، لەدرێژەی وێنەی دەنگی (دال) نەبێت ناتوانرێ ئەو مەدلولە وێنا بکرێ. بۆیە لەو نێوەدا دەکرێ تێبینی شتێك بکەین کە لەم پەیوەندییەدا بە سیانەیەك(تالوت) دەچێت:زەینی مرۆیی، دال(وێنەی دەنگی)، مەدلول(چەمك).

ئێستا دەپرسین ئەو پێگەیە چییە کە وشەی گوتراو لەتێکەیشتنی کلاسیکی زماندا داگیری دەکات؟ بەگوێرەی تێکەیشتنی کلاسیکی وشەی وترلو بەنواندنی نوسراوی وشەکە دەناسرێ. بەم پێیە دەبێتە دالی وشە گوتراوەکە، بەمەش دەبێت دالی مەدلول وسەبارەت بە وشەی گوتراو بەلاوەکی دادەنرێت و، وشەی نوسراو جگە لەنواندنی وشەی گوتراو ناتوانێ هیچ رۆڵێکی تر ببینێ. ئەمە لەکاتێکدایە کە گوتراو دالە.بۆنموونە ئەگەر چەمکی گوڵ یان خونچە ئامادەبکەم، ئەو کاتە پێویستە دەنگی گوڵەکە دەربڕم، دالەکەش وێنەی دەنگی و بیسراوەکەیە. بەڵام کاتێ وشەی خونچە دەنوسم، جگە لەوێنەی دەنگی لەچوارچێوەی بونیادێکی نوسراوەوە( griaphic structure ) شتێکیتر ناکەم، ئەم وێنە نوسراوەش بەهیچ پەیوەستێك بە چەمکەکە نابەسترێتەوە ، بگرە وێنەی نوسراو ناتوانێ ببێتە چەمك، چونکە بونیادێکی دیتراوی وێنەی دەنگی نەك تەنها نەبینراوە، بەڵکو شتێکە هاوشێوەی رەنگە. ئەمەش سەبارەت بەوێنەی دەنگی شتێکی لاوەکییەو دەکرێ فەرامۆش بکرێ لەوە زیاتریش پێویستە بەتەواوەتی فەرامۆش بکرێت.

لێرەدا پێویستە ئاماژەی بەوە بکەین کە ئەو بەڵگە کلاسیکیانەی وێنێکی لاوەکیان بۆ پەیڤی نوسراوو پێگەیەکی سەرەکی بۆپەیڤی گوتراو دارشتووە، بەڵگەی میتافیزیکی و

لاهوتێن. دریداش لەدرێژەی قسەکانیدا لەسەر ئەو بنەمایە میتافیزیکییەی کە پەیڤی گوتراو جەختی لەسەر دەکاتەوە نوسیویەتی و دەڵێ:

چەمکی خودا ناوەکەی تری لۆگۆسە( logos)، بەو پێیەی ئامادەگیەکی خوییە، دەکرێ بێکۆتایی و ئامادەگیەکی خودیش بێت، هەروەها دەکرێ لەئەنجامی دەنگ بەو پێیەی خاسیەتێکی خودییەوە بهێنرێتە بوون، جۆشی دال ناکرێ لەدەرەوەی خودی خۆی ئەو داڵە بخوازێ کە دەیژێنێتەوەو کاری لێدەکات. هەمان حاڵەتیش لەگەڵ ئەزموونی دەنگدا دەشێت، بەجۆرێك ئەو ئەزمونە دەژێت بەوسیفەتەی نزیك بوونەوەیەکە لەنوسین و خۆی رادەگەیەنێ. بەمانایەکی تر دوور خستنەوەی ئەو داڵە هەست پێکراوە شوێنییە کە ئاستەنگ دەخاتە بەردەم ئامادەگی خودی.

دریدا جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە هەردوو چەمکی قسەو نوسینە کلاسیکیەکان سەنترال لۆگۆسن( logocentric). ئەمەش چەمکێکی ترە کە دریدا بەکاریدەهێنێ بەمانای ئەو شتەی کە بەشێوەیەکی میتافیزیکی یان لاهوتی ئاراستەکراوە.بۆئەوەی وردتر قسەبکەم دەمەوێ ئەوە روون بکەمەوە کە میتافیزیك هەردوو چەمکی قسەو نوسینی پێك هێناوەو بەمەرجی داناون وجڵەوکێشی کردوون، لەراستیشدا سنترالیزمی لۆگۆسی، فۆنۆ سێنتراڵە phono centrism ئەو باوەڕەی کە دەڵی دەنگ، واقیعی بالاکردن نزیك دەکاتەوە. لەتیۆری دریدادا ئەو دەبینین کە سەنترالیزمی لۆگۆسی و فۆنۆسێنتراڵ دوو چەمکی جیاوازن و باس لەیەك دیاردە دەکەن: کە ئەویش پێکگەیشتنی میتافیزیکی (metaphysical genesis) چەمکەکانی قسەو تێگەیشتنە. سەنتەرالیزمی لۆگۆسی و فۆنۆ سەنتراڵ جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە.لەبەر ئەوەی ئەو دوو چەمکە لەو باوەڕەوە قسە دەکەن کە دەڵی: دەنگ میانگیری نێوان عەقڵی مرۆیی و واقیعی باڵاکردوو دەکات. دەتوانین بڵێین ئەو بەڵگەیە نزیککردنەوەیەکە لەتێگەیشتنی هیندی بۆ دەسەڵاتی(مانتراس mantras)و ، دەتوانین( مانترا mantra) بەوە پێناسە بکەین کەبریتییە لە: دەنگێك یان زنجیرە دەنگێك . ئێمە پێمان وایە دەنگ دەسەلاتی هەیە،چونکە دەبینین لەتوانایدا هەیە دەسەڵاتی باڵاکردوو بوروژێنێ، لەو روانگەیەی گرنگی بەلەرینەوەی ئەو وشانە دەدات کە دەریان دەبڕین. چۆن بۆ دەنگی

وشەيەكى دياريكراو كە بە (mantra) ناوزەدى دەكەين دەكرێ دەسەڵاتى هەبێت ؟ لەوەڵامدا دەڵێين مانترا ئەو خەسڵەتەى هەيە.چونكە دەبينين دەنگ وەك ميانگيريەكى عەقڵ و دەسەڵاتى باڵاكردوو كاردەكات و لێرەشدا هەوڵى جەختكردنەوە نادەم لەسەر ئەوەى كە تێگەيشتنى كلاسيكى رۆژئاوايى تايبەت بەسەنتراليزمى لۆگۆسى و فۆنۆسێنتراڵ هەمان ئەو تێگەيشتنەيە كە تايبەتە بە مانترا، بەڵكو جەخت لەسەر لايەنە وێكچووەكانى ئەو دوو چەمكە دەكەمەوە.

هەروەها لە هەڵوەشاندنەوەدا تێبينى رەگەزێكى تر دەكەين كە گرافۆسێنتراڵە(grapho centrism)، ئەويش چەمكێكى گرنگەو بەر لەوەى‌بێتە ناو قوڵايى تيۆرى دريدا پێويستى بەراڤەكردن هەيە. دەكرێ بەوە دەست بەقسە بكەين كە نوسين، نوسراوەييە(graphic) وگرافيم(graphame) پيتێكى ئەبجەدييە، يان كۆمەڵە پيتێكە كە دەكرێ ئامارژەبن بۆ فۆنيم(phoneme) .دەكرێ فۆنيميش بەوە پێناسە بكەين كە بچوكترين يەكەى قسەكردنە، دەربراوێك يان پەيڤێك لەيەكێكى تر لەنێو زماندا جيادەكاتەوە. ئەمەو ئەگەر بزانين كە نوسين نوسراوەييە ، ئەوا دەتوانين بڵێين گرافيم بەو پێيەى تێگەيشتنى كلاسيكى باسى دەكات، داڵێكى رووتە.مەبەستيش لەمەدا ئەمەيە كە نوسين و يەكەى نوسين جگە لەنواندنى وێنەى دەنگى هيچ پەيوەندييەكى ترى نييە. لەبەر ئەم هۆيەش دەتوانين بڵێين كە مەبەست لە گرافۆ سەنتراڵ گواستنەوەى گرنگييە لەقسەكردنەوە بۆ نوسين. ئەمەش ئاوەژووكردنەوەى ئەو تێگەيشتنە كلاسيكيەيە كە باس لەپێشينەى قسەكردن يان پەيڤى دەربڕاو بەسەر نوسين و پەيڤى نوسراودەكات.

هەندێك لەرەخنەگران پێيان وايە كە تيۆرى هەڵوەشانەوەى دريدا بريتييە لە گواستنەوەى گرنگى لە سەنتراليزمى لۆگۆس بۆ گرافۆ سێنتراڵ. ئەمەش سەرنجێكى بێتاوان نييە، بۆيە بەر لەچوونە ناو راڤەكردن پێويستە گوزارست لەواتاكەى بكرێت. بۆيە پێموايە باشترين رێگا بۆ روونكردنەوەى ئەم پرسە دەكرێ لەرێى پێوانە(قياس) هەوڵى سادەكردنەوەى شتەكە بدرێت، جا ئەگەر لەتوانا دابێت نوسين و قسەكردن و تێگەيشتنەكەيان لەگەڵ جەستەو گيان و واقيعى باڵاكردوودا بەراورد بكرێت، ئەوا ئەو كاتە

پێداگرتنمان لەسەر قسەکردن پێداگرتنە لەسەر گیان-ڕوح(پێداگرتنیش لەسەر قسەکردن پێداگرتنە لەسەر فۆنۆسینترال وسینترالیزمی لۆگۆس)، لەکاتێکدا پێداگرتن لەسەر نوسین پێداگرتنە لەسەر جەستە(ئەم حاڵەتەش واتا گرافۆ سێنترال).ئەگەر هەڵوەشانەوە بریتی بێت لە گرافۆ سێنترال ئەو کاتە دەکرێ بەوە پێناسەی هەڵوەشاندنەوە بکەین کە بریتییە لە رەتکردنەوەی پێشینەیی ڕوح ودەسەلاتی میانڕەو دژایەتیکردنی شتە مۆراڵییەکان و ئاوێتە بوون لەژیانی دونیایی. ئەمەش بەمانای ونبوونی خودا دێت. کەواتە ئایا جێی باوەڕ پێکردنە بڵێین هەڵوەشاندنەوە عەدەمە (nihilistic)؟ دەکرێ بڵێین هەموو جەخت کردنەوەکانی ئەم بوارە ڕاستن وەڵامی ئەم پرسیارەش لەبری هەموو ئەو شتانەی کە دریدا دەیڵێت و مەبەستی سەرکییەکەی هەڵوەشاندنەوەیە، ئەرێیە(بەڵێ). دواتر دوای خوێندنەوەی چەمکەکانی دریدا لەم بوارە کە بەسیفەتی ئامێری هەڵوەشاندنەوە کاردەکەن لەشوێنێکی تر دەگەڕێمەوە سەر ئەم کێشەیە.

دوای ئەوەی دریدا بنەرەتی میتافیزیکی ولاهوتی بۆ هەردوو چەمکی قسەکردن و نوسین دەخاتەڕوو، دێت بۆ پشکنینی پرسی وەسفی زمانی(liguistic) زمانو ئەو چەمکانەی وەسفەکە هەوڵی بیناکردنیان دەدات . لەڕاستیشدا دریدا وەکو پەرچەکرداری ئەو تیۆرەی (سۆرسێر) دێت کە دەڵێت: نیشانەی (sign) زمانی، یەکەیدالو مەدلولەو، زمانییە نوێیەکان(اللسانیات الحدیثە) کە پێ لەسەر چەکی دال و مەدلول دادەگرن، ئەو بونیادگەرییەش کە قەرزاری ئەو چەمکەیە، بانگەشەی ئەوە دەکات کە خوێندنی زمان و کاری رەخنەییان کردۆتە دوو مەیدانی ئەبیستمۆلۆژیوزانستی.دریداش ئەوەی روونکردۆتەوە کە ئەو بانگەشەیە تەنها فریودانێکەو بەس، چونکە چەمکی دال و مەدلولی زمان کە لەزمانییەکانەوە بۆمان هاتووە وێنەیەکی تریقسەکردنو نوسینی کلاسیکیەو ، دریدا لەکاتی خستنەڕووی پەیوەندی دوولایەنەی میتافیزیك و لاهوت، سەرنجی ئەوەی داوە کە:چەمکی هێما لەخودی خۆیدا جیاوازی نێوان دال و مەدلول دەبەخشێ، ئەگەرچی بەشێوەیەك نیشان بدرێن کە دوو ڕووی یەك دراون. بۆیە ئەو تێکەیشتنە لەچوارچێوەی چەمکی سەنترالیزمی لۆگۆسیدا دەمێنێتەوە کە لەحەقیقەتی خۆیدا بریتییە لە فۆنۆسێنترال:

نزيككردنـەوەى رەهايـە بـۆ دەنـگ و كەينونـە(being) ،هـەروەها بۆدەنگ‌ومانـاى كەينونـە وميتاليەتى مانا.

لەبەر ئەم هۆيـە ئەونەسـەقەى زمـان كـەدەلێت:زمانييـەكان ئەمـەيان بەزانسـتى كـردووە بونيادگەريش بەجۆشەوە خواستويەتى،لەو روانگەيـەى كە روانگەيەكە بـۆ رەخنـە.ئەمـەى پێشو هـەمان نەسـەقە كۆنەكەيـەن واتـا نەسـەقى سـەنتراليزمى لۆگۆسـى كـە بەرهـەمى ميتافيزيكە. شتێكى ئاشكرايە كە دريدا ميتـافيزيك و زمانييـەكانى خسـتۆتە يـەك چێـوە، ئەمەش بەم مانايە دێت كە ميتـافيزيك دەرفـەتى لەبـەردەم زمـان خۆشـكردووە بـۆ ئـەوەى ديارەدەى‌زمان لەبەر رۆشـنايى جەمسـەرگيرى دوانـەيى وێنابكـات. بەومانايـەى كـە چەمكـە ميتافيزيكيـەكان..چـەمكى واقيعـى وميتـالى ،چـەمكى جەسـتەو رۆح،چـەمكى چاكـەو شـەڕ..دەرفـەتيان لەبـەردەم زمـان خۆشـكردووەو توانـاى ئـەوەيان داوەتـێ لەبەرۆشـنايى جەمسەر گيرى دوانەيى وێناى خۆى بكات. ئەو زمانييە زبرەى (الحده اللسانيه) كە دەڵێ وێنەى بيستراو چەمك ئامادە دەكات (واتا دال ومەدلول ئامادە دەكات) بريتييە لەپێداگرتن لەسەر پێشينەى وشەى گوتراو لەسەر وشەى نوسراو. ئەو فەرامۆش كردنەى كە بەرهەمى هـەڵاتنى فەلسـەفى و ميتافيزكيە لـەرووكارى دەرەكـى و بيـنراو و بـەرەندەكراوى وشـەى نوسـراو، لەمەشـدا دەردەكـەوێت كـە ميتـافيزك لەلايـەن (سۆسـێر) لەپشـت تێگەيشـتنى كلاسـيكى بـۆ زمـان‌و چـەمكى هێمـاى زمـانى بەشـێوەى هـێزێكى سـەرجدارى بـەهێز شاردراوەتەوە.

دريدا چەمكى نوسينى بە( تێگەيشتنى بـازاڕى بۆنوسـين) نـاوزەدكردووە، ئـەو شـتەى تێگەيستنى كلاسـيكى زمـان و زمانييـەكانى نـوێ پشـت گوێيـان خسـت و وەك چـەمكێكى لاوەكيان سەيركرد، واتا شتێكە بۆ دەرخستنى ئەو دەنگەى كە نوسين بەرجەستەى دەكات نەبێ، بوون و ئامادەگى نييە.لەم رووەوە درێژە پێدەدات و دەڵێ: ئەو باوەڕەى كـە لـەنێو كـەلپورى رۆژئـاواوە لەسـەر نوسـين بـاوە ئەوەيـە كـە نوسـين (پيسـت)و(كۆڵينـى بينراو)و(جەستەومادده)ى عەقڵە. ئەمەش بەدياريكراوى چـەمكى بـازاڕى نوسـينە.وێـراى ئـەوەى كـە ئـەمان دەزانـى، بـەڵام دريـدا ئـەو چەمكـە بازاڕيـەى تێگەيشـتنمانى بـۆ زمـان

ناراستەكردو بەتەواوى ستريەوەو نەيهێشت. هەروەكو چۆن ئەداى ئێمەى لەگۆڕەپانى ڕەخنەدا ناراستەكرد، ئەويش لەڕێگاى هاندانمان بۆ ئەو باوەڕەى كە دەڵێ: هەر شتێك ئەو كاتە مانايەك دەبەخشێت كە پەيوەست بێت بەبيرۆكەيەكەوەو لەبەرامبەريشدا بە بيرۆكەيەكى ديكە بەسترابێتەوە. بەم شێوەيە هەموو ئەو بيرۆكانە لەنێو خودى بيرۆكەى خۆمان دەربارەى كەينونەى بالاكردوو كۆدەبنەوە.. هەر لەبەر ئەمەشە كە بيرۆكەمان دەربارەى كەينونەى بالاكردوو لەشوێنى بيرۆكەيەك لەهزرماندا حوكم بەسەر بيركردنەوەمان سەبارەت بەزمان و ڕەخنە دەكات.

هەر بەم چەشنە ڕەخنەگرتن لەچيرۆكێك بوو بەدۆزينەوەى ماناكەى... ئەو مانايەى كە بەبيرۆكەيەك يان چەمكێك دادەنرێت كە لەتواناىدا هەيە بەبيرۆكەيەكى ديكە ببەسترێتەوە، دواتر پرۆسەى بەيەك بەستنەوەى بيرۆكەكان لە تێگەيشتنماندا بۆ كەينونەى بالاكردوو كۆدەبێتەوە. جێى باسە سەرجەم وردەكارى بيرۆكەكان كە دەكرێ لەچوار چێوەيەك دابڕێنرێن ناوەندێك كۆيان دەكاتەوە كە گوزارشت لەبيرۆكەى ئێمە دەكات بۆ كەينونەى ئەوجگەرا. شيمانەى ئەسەقەكەش ئيلهام بەخشە بەبوونى كۆشتێك .دەكرێ پرەنسيپى نێوكۆيش بەوە پێناسە بكەين كە ئەو بيرۆكەيەى كەينونەيەيە كەبريتييە لەداهێنانى ميتافيزيك.هەوڵى دريدا بۆ ڕزگاركردنى تێگەيشتنمان بۆ زمان وكارى ڕەخنە لەوكاريگەرييە نێو كۆييەى دەردەكەوت كەميتافيزيك پيادەى كردوو ، لەڕێگاى دارشتنەوەى دوو چەمكى نوێ گەيشتە ئەو پرۆسەى ڕزگاركردنە كە دەكرێ تێگەيشتنى كۆنى زمان وڕێگاى كۆنى ڕەخنە پوچەڵ بكەنەوە، بەلام زەينى ئێمە لەونێوەدا بۆ مەرجدارييەكانى تێگەيشتنى كلاسيكى زمان مليداو سەرەوت،ئينجا بەو تێگەيشتنە هوشيار بووبين يان نا. كاتێك بانگەشەى ئەوە دەكەين كە بيرۆكەى نوێمان دارشتووە، ئەوە لەراستيدا جگە لەدووبارە گواستنەوەى بيرۆكەكان هيچى زياترمان نەكردووە. بۆنموونە ئەو چەمكە زمانەوانيانەى كە سۆسێر دايهێنان و لەبارەيانەوە ئەوە دەگوترێت كە شۆڕشيان لە تێگەيشتن بۆ زمان بەرپاكرد، ئەمانە بەرهەمێكى ميتافيزيكين. كاتێك دەڵێين ئەسەقى نوێى زمان زانستييە ، ئەوا ئێمە خودى خۆمان دووبارە دەكەينەوە، چونكە ئەوەى راستى بێت كاتێك زەين و ناوەزمان

بێلایەن دەبن ئەو کاتە لەتوانادایە بیرۆکەی نوێ لەدایك ببن. مەبەستی دریدا لەپشت نمایشکردنی بنەڕەتی میتافیزیکی زمان ورەخنە هاندانی زەینمانە بۆ بێلایەنی، چونکە ئێمە درك بەوە دەکەین کە دیاردەیەکی تەواو سروشتی وەك زمان لەناخی خۆیدا تۆویی میتافیزیك هەڵدەگرێت و، بگرە ئەو ڕاڤەکردنە زانستیەی سۆسێریش بۆ زمان، لەراستیدا بۆتە قوربانی میتافیزیك.

دوای خستنەرووی ئەو بنەما میتافیزیکیەی کە زمانی پێیەوە بەندە، ئێستا لەتوانادایە لەدارشتنەوەی چەمکە تایبەتیەکان تێکەیشتنێکی نوێ بۆزمان بەرهەم بێنین، کە ئەم هەنگاوانەش بونیادی هەڵوەشاندنەوە پێکدەهێنن. لێرەوە دەست دەکەم بەوەسفکردن و هەڵسەنگاندنی چەمکەکانی هەڵوەشاندنەوە.

چەمکی نوێی نوسین کە دریدا دایرشتووە پشت بەسێ وشەی یەکجار ئاڵۆز دەبەستێت، کە ئەوانیش بریتین لە: جیاوازی(difference)،مۆرك(trace) ،نوسینی رەسەن(arche-writing).
لێرەدا بەزۆرترین توانا کە سنورەکانی ئەم پرۆژەیە ڕێگای دەدەن کار بۆ ڕاڤەکردنی هەریەکێك لەم چەمکانە دەکەم و ، ئەوەش روون دەکەمەوە کە چۆن ئەم چەمکانە کاری هەڵوەشانەوە ئەنجام دەدەن. جیاوازی ئاماژە بەدوو کار دەکات(actions) کە بریتین لە:

1–جیاواز بوون، واتا جیاواز بن نەك وێکچوو( differ) .

2–دواخستن، یان دوابخرێ deffer .

پێویستە تێبینی ئەوە بکرێ کە یەکەمیان چەمکێکی شوێنی(مەکانی–spatial) یەو دووەمیان کاتی(زەمانی–temporal)یە، دریدا وای دەبینێ کە هەر هێمایەکیش ئەو وەزیفە دوولایەنە رادەپەرێنێ(واتە جیاوازی و دواخستن)، لەبەر ئەوەی بونیادی وشە پەیوەستە بەجیاوازی دواخستن، نەك بەدال و مەدلول، واتا بونیادی هێما ئەو جیاوازیەیە کە بەو مانایە دێت هێمای شتێك لەهێمای شتێکی‌تر ناچێت و بەشێوەیەکی رەها نائامادەیە لەهێماکەدا. دەکرێ ئەوەی باسمانکرد بەم نمونەیە روون بکرێتەوە: ئێمە جیاوازی لە نێوان هەردوو وشەی(three)و(tree) دەکەین، کە یەکەمیان بەمانای(3)سێ و ئەوەی تریان بەمانای

(دال) دێت. ئەم دوو وشەیە لەقسەکردن و نوسیندا تەواو جیاوازن و لە ئەسەقیش شوناسی خۆیان ئاشکرا دەکەن(identity). ئەم جیاوازییەش بەیەکێك لەهێزەکانی ناو هەر هێمایەك دادەنرێ و، هێزەکەی تریش توانای هێماکەیە بۆ دواخستن. بۆ نموونە :وشەی(خونچە) لەنێو چامەیەکی شیعریدا سەرەتا جگە لەماناکەی هیچی‌تر ئاشکرا ناکات، ئەو کاتە ئەبێت کە درك بەوە دەکرێ ئەوە ئەو خونچەیە نییە کە لە واقیعدا دەیبینین. بەڵکو مانایەکی دیکەی هەیەو پێویستە بدۆزرێتەوە. هەر لەبەر ئەوەیە هێما نیوەی تەواوەو نیوەکەی تر ناتەواو، پێویستیشە ئەو راستییە لەسەرەتای تێگەیشتنمان بزانرێ، وەکو چۆن سۆسێریش جەختی لەسەر ئەوە کردۆتەوە کە هێما بریتی نییە لە دال و مەدلول، بەڵکو بریتییە لە جیاوازی+ دواخستن و، بێگومان هەریەکە لە سۆسێرو دریدا بەدوو تێڕوانینی جیا سەیری هێما دەکەن، سۆسێر وەك( یەکێتی /اتحاد و دواتریش وەك جیاوازی/ اختلاف).

جا لەبەر ئەوەی هێما ناتەواوە، بۆیە پێویستە وا تێبگەین لەژێر فەوتان و سڕانەوەدایە (undey erasure) . ئەمەش چەمکێکە دریدا وەك ئامارەیەك بۆ ناتەواوی هێماکان دایڕشتووە. لەبەر ئەمە هەر هێمایەك ئەم ئامارەیە لەخۆ دەگرێ. بۆ نموونە کە وشەی(بینراو-مرنی)ی بەکارهێناوە هیچ ئامارەیەکی روونی نەبووە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا بۆخۆی هێمایە، بەڵام ئەگەر لەگۆشەی هەڵوەشاندنەوە سەیری بکەین، ئەوا لەو کاتەدا هێمایەکی سڕاوەو فەوتاو دەخاتەروو، پێویستە بیزکەی سڕینەوەی هێما بەشێوەیەکی پیتی وەرنەگرین، بەڵکو تەنها لەروونکی ئیجابییەوە سەیری بکەین. ئەم سڕانەوەیە ناتەواوی هێماکان و بگرە دابڕانیان دەردەخات.واتە بەجۆرێکە ناتوانین بڵێین هیچ هێمایەك دالی شتێکی ئەزەلیە، چونکە هیچ بەهایەکی رەهای نییە، وەك چۆن شتێکی بالاکردووشی لەخۆنەگرتووە..هێما شتێکی سیاقییە( contextual) وسەرابی مەدلول دروست دەکات و، باشترین شتیش کە جێبەجێی بکات ئەوەیە کە بۆگەڕان بەدوای ئەو شتەی پێویستی پێیەتی ئاراستەمان دەکات و،ئەوەشمان بیر دەخاتەوە کە ئەو بەشێك نییە لەو شتەدا، لەبەر ئەوەش هێما مۆرکێکە، نەك نواندنی شتێکی بینراو یان نوسراوی هەستپێکراوی وێنەی دەنگی، بەڵکو ئەو مۆرکەیە کە دریدا بەشتێکی ناسروشتی وەسفی دەکات(یانە بەمانی هۆسرلی،

ئامارەو هێمای سروشتی یان نیشانەر index نیە)، بەڵکو زیاتر لەوە رۆشنبیرییەو، ئەوەندە ماددی نییە،هێندەی دەروونییە، هێندە بایۆلۆژی نییە ئەوەندەی زێتر رۆحییە.

ئەوەی لە هێمادا هەیە، ئەو شتەیە کە زەینی مرۆڤ بە ئاراستەی خۆی دەجوڵێنێ، لەبەر ئەوە، ئەوەی لە هێمادا ئامادەگی هەیە مۆرکی ئەوە هەڵدەگرێ کە تیایدا ئامادەگی نییە، هێما دەتوانێ زەین کۆت بکات، چونکە لە توانایدا هەیە ئەوشتەمان بیر بخاتەوە کە تیایدا نییە، لەرێگەی ئەو بیرخستنەوەیەش دەتوانێ زەین بجوڵێنێ. بەمجۆرە دەتوانین بڵێین هێما مۆرکە( العلامە اثر). لەو مۆرکەشیدا دوو هێز هەڵدەگرێ کە ئەوانیش (جیاوازی‌و دواخستن)ن. بەم پێودانگە شتێکی ئاسایی بوو کە چەمکی نوسین لەگەڵ دەرکەوتنی چەمکەکانی(جیاوازی‌و دواخستن) گۆڕانی بەسەردا دێت. ئەمە ئەگەر بێت و بکرێت لەسەر پێناسەکەی خۆی بمێنێتەوە کە بریتییە لە (پیت حرف) و ( کۆڵینی بینراو)و(جەستەومادده)ی دەرەکی عەقڵ. لەکاتی هەوڵدانی دریدا بۆ پێناسەکانی چەمکی نوسین ئەو شتەی روونکردۆتەوە کە: بەشێوەیەکی گشتی نوسین، هەڵکۆڵینە .. جائەمە بەنووسینی پیت بێت یان شتێکی تر، تەنانەت ئەگەر ئەوەی لە بۆشایشدا (شوێن) پەرش دەکرێت سەبارەت بەدەنگ نامۆبێت.

بەومانایە بێت دەتوانین وێنەگرتنی سینەمایی و سەماو باڵێ و مۆسیقا و پەیکەر تاشی‌و هەموو ئەم شتانە بەنوسین بژمێرین. هەروەها دریدا لەکاتی بەرفراوانکردنی چەمکی نوسین تێبینی ئەوەی کردووە کە: لەوانەیە مرۆڤ قسە لە نوسینی وەرزشی (وەرزش بەگشتی) یان نووسینی سەربازی یان سیاسی بکات، ئەم باسکردنەش لەژێر رۆشنایی ئەو تەکنیکانە دابێت کەحوکمی ئەو بوارانە دەکەن. ئەمەش بەتەنها وەسفی ئەسەقی ئەو مانایە ناکات کە بەشێوەیەکی لاوەکی بەو چالاکیانە پەیوەستە ، بەڵکو ماهیەتی خودو ناوەڕۆکی ئەم چالاکیانەش وەسف دەکات.

کەواتە لە دووتوێی ئەم مانایە دابێت زمان لەخودی خۆیدا نوسینە. هەروەها (گیتاری سبیفاك) سەرنجی ئەوەی داوەکە: شتێك هەیە لەناوخۆدا مۆرکی گۆڕانێکی ئەزەلی هەڵدەگرێت، کە ئەویش بونیادی دەروونیە، یان بونیادی هێما، دریداش ئەم بونیادە

بە(نووسین) نـاوەزد دەكـات. هـەروەها- سـيبڤاك- لـەكاتی خسـتنەرووی روونكردنەوەكـەی سەبارەت بەچەمكی نوسین ئەو تێبینیەی باسكردووە كەبەردەوام نوسین ناوی ئەو بونیادەیە كە مۆرك تیایدا نیشـتەجێیە، ئـەم تێگەیشـتنەش بـۆ نوسـین لـە تێگەیشـتنی ئەزمونگـەری بەرفراوانترە كە لەسەر كرۆكی ماددی ئاماژە بەچوارچێوەی مانای ئەزمونگەری دەكات.

دریـدا نـاوی(نوسـنی رەسـەن)ی بۆجیاوازیكردن لـەنێوان ئـەم چـەمكی نوسـینەو چـەمكی بازاڕیو تەسكی نوسین بەكارهێناوە، نوسینی كەوانەییش لەگوزارشتە نوسراوو نانوسراوی كاردەكاتو، نوسینیش بە مانا تەسكەكەی بە نوسـینێك(graphis) دەژمێردرێ كە پشت بەو چەمكی گرافیم دەبەستێ كە لەحەقیقەتدا دالێكی رووتە. بەلأم لەتیۆری هەڵوەشاندنەوەدا كە دریـدا رەهـەندەكانی دیـاریكردووە، سـیفەتی نوسـین مانایـەكی جیـاوازی لـەوەی كـە لەبەكارهێنانی كلاسیكیدا باو بوو وەرگرت. دەتوانین كە شێوەی نوسین(gtaphe) مۆركێكی دامەزرێنراوە.

ئاراستەی گرافۆسـەنترالیزمی تیـۆری هەڵوەشـاندنەوە مانایـەكی تێكچـڕاوی بـەرفراوانی بەخۆوەبینی، ئەمەش بەهۆی مۆركی دامەزرێنراو بوو. بۆیە ئەو گۆڕانەی دریـدا هێنایـە ئـارا، ئەوەندەی پەیوەندی بە تێگەیشتنی كلاسیكی ئەو چەمكانەوە هەبووە، هێنـدە گـۆڕان نەبوو ئەو گرنگییەی كە چەمكی نوسین هەیبوو. بـە جۆرێـك گرافۆسـێنتڕاڵ بـەو مانایـەی دریـدا دیـاری كـردووە، ئاماژەیـە بـۆ ئـەو ئاراسـتەیەی كـە بەچەشـنێك زەیـن دەیگرێتەبـەر بـۆ پێناكردنی مۆرك لە تەواوی جۆری ئەو پێناسانەی كە هوشیاریو درككردن بەرێوە دەبات. ئەمەش مۆرك لەوێنەی پۆرترێت (وێنەی كەسی) وپۆسـتەر و نـاوی ناسراوو پـەیڤی گوتراو نوسراو دەردەكەوێ. لێرەدا گرافۆ سێنتڕاڵ رەنگدانـەوەی دركردنێكـی باشـی وەزیفـەی مۆركە. بۆیە كە وێنەی كەسێك دەكێشم یان ئیدراكم وەك ئارەزوویەكی خۆم بۆ تێگەیشتنی مانای ئەو وێنەیە دەكەوێتەكار. پرۆسەی هەڵیسانی زەین مـاددی نییـە، چونكە زەین بۆ گەڕان بەدوای شتێكی دوور كە لەوێنەكەدا بوونی هەیە دەجولێ(واتەگەڕان بەدوای شتێك لەپشـت مۆركـە دیۆمەزمەییـەكانی وێنـەدا). ئەمەیـە وەزیفـەی جیـاوازی لـەكاتێكدا ئـەو وێنیپەنجە دیۆمەزمەییە خودی خۆی مۆركە. چونكە مۆرك(اثر) لەخودی خۆیدا ئامادە نییە.

لەم نێوەدا دەكرێ گرافۆسێنتراڵ بەوە پێناسە بكەین كە ... دەرخستنە هەستیە نوێیەیە كە شتێك.. یاداشتێكی نادیار مۆركی خۆی لەسەر ئەو بابەتانە جێهێشتووە كە جوڵەی دیاریكراو لەزەیندا دروست دەكەن و، مۆركیش لەمیانی جیاوازی و دواخستن دەستبەكار دەكات(جیاوازی+دواخستن= جیاوازی).

چەمكی كلاسیكی زمان بەسیفەتی ئەفسانە نمایش دەكرێ.. بەجۆرێك كە لەناوخودی خۆیدا شتێكی شاراوەی هەیە.. وەكو نزیكی دەنگ لە مەدلول وشتی لەم بابەتە، لەم نێوەدا تێبنی ئەوە دەكەین كە رەگەزە شاراوەكە رەگەزی میتافیزیكە، چونكە لەرابردوودا میتافیزیك تێگەیشتنمانی بۆ زمان كۆنترۆڵ كردبوو.. دریدا بۆ ئەوەی تێگەیشتنێكی وا بۆ زمان بێنێتە ئارا كە لەچەمكی میتافیزیك رزگاری بێت ، هەندێك چەمكی نوێی دارشت. لەبەر ئەوە رزگاركردنی چەمكی زمان لە میتافیزیك بەلادانی شاراوەیی وسەرسورمان دەژمێردرێ. چونكە بەتەواوی لەرەگەزی شاراوە رزگار دەبێت، لادانی شاراوەیش لەحەقیقەتی خۆیدا بریتییە لەلادانی ئەفسانەگەرایی(رووكاری ئەفسانەیی).. قسەیەكی راستیشە ئەگەر بڵێین تیۆری هەڵوەشاندنەوە بەلادانی شاراوەیی و ئەفسانەگەرایی لەسەر چەمكی كلاسیكی زمان دەسپێدەكات.

ئەو خوێندنەوەیەی ئێمە بۆ هەڵوەشاندنەوە بەسێ قۆناغدا رەتبووە، قۆناغی یەكەم بریتییە لە تیشك خستنەسەر هەردوو چەمكی قسەو نوسین، كە ئەمەیش دوو پرسی سەرەكی لەخۆگرتووە: ئەو فاكتەرەی لەپشت ئەو باوەڕەوەیە كە باس لە پێشینەیی قسەكردن لەسەر نوسین دەكات، لەگەڵ ئەو رەهەندەی كە میتا فیزیك لەكاریگەریەكانی خۆیدا پێكەیشتووە. لەقۆناغی دووەمیشدا خوێندنەوەمان بۆ ئەو بانگەشە زمانییە كردووە كە دەڵێ: زمانییە نوێیەكان(اللسانیات الحدیثە) رووكارێكی زانستیان بۆ خوێندنەوەی زمان زیادكردوەو كردویانەتە بوارێكی زانستی. ئەو دوو پرسە سەرەكیەش كە لەم قۆناغەدا باسمان كردوون لەو جەختكردنەوەیەدا خۆی دەبینێتەوە كە باس لە چەمكی زمانی بۆ هێما دەكەم. كەئەمەش وێنەیەكی تری تێگەیشتنی كلاسیكیە بۆ چەمكەكانی قسەكردن و نوسین، هەروەها جەختكردنەوە لەسەر ئەوەی كە زمانیە نوێیەكانیش قوربانیەكی تری میتافیزیكێن.

قۆناغی سێیەمیش لە وەسف و هەڵسەنگاندنی دریدا و چەمکە ڕەخنەییەکانی تیۆرەکەی پێك دێت: جیاوازیو مۆرك و نوسینی ڕەسەن. لەگەڵ ئیشك خستنەسەر چەمکی گرافۆ سەنتراڵ لەروانینی دریداوە.

کەواتە بەگوێرەی قسەکانی پێشو دەکرێ بڵێین کە ئێستا تێگەیشتنمان بۆ چەمکی زمان گۆڕان کەواتە بۆمان هەیە بپرسین: چارەنووسی ڕەخنە چییە؟ وەڵامی ئەم پرسیارە بەگریمانە دەست پێدەکات، بەوەی ئەدەب شێوەیەکە لە شێوەکانی نوسین و، چامەی شیعری یان چیرۆك یان هەرکارێکی ئەدەبی بونیادی مۆرك /پاشماوەکانە. ئەو مۆرکانەی بەو شوێنپەنجە دێومەزمەییانە پێناسەدەکرێن کەماهیەتیان نازانین.لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە لەکەینونەو بوونیان دڵنیاین، بەڵام بەپلەی یەکەم ڕەخنە بەوە دەناسرێتەوە کە لێکۆڵینەوەیە لەوشە.. دێر.. دەق..یان هەرشتێك کە زەین لەخاڵێکی دەرککردنی هەستی دیاریکراو بۆ دنیاکانی لێکۆڵینەوە دەجوڵێنێ، ئەمەش وەکو پاڵنانێکی بەهێز بۆ تەئویلکردن، کەواتە ڕەخنە بەگومان دەسپێدەکات،ئەو گومانەش پشت بە بڕوا بوون دەبەستێت. بەم جۆرە ڕەخنە گومان لەروخساری هێما دەکات جا هەرچییەك بێت (وشە-دێر- چیرۆك-پەیکەر-وێنە-پۆرترێت..هتد). ئەمەش لەبەر ئەوەی قەناعەتێك لەخۆی دەگرێ کەئەوەی دەرەدەکەوێ و دەیبینین تەواوی شتەکە نییە، بەڵکو شتێکی تریش هەیە، بۆیە ئێمە بەشتەکان کۆتایی ناهێنین وەك هەن، بەڵکو حەز دەکەین لێیان بکۆڵینەوەو تا دورترین سنوورەکان تیایاندا قوڵبینەوە، ئەمەش بۆ دۆزینەوەی نهێنییەکانیان، چونکە هەست دەکەین شتێکی ون یان نادیار هەیەو بەهەست درکی پێدەکەین، ئەو هەست کردنە ئەزەلیەش بەوەی شتێکی ون یان نادیار هەیە، نوسینی ڕەسەنە. ئەدەبیش بەیەکێك لەجۆرەکانی گوزارشتکردن لەم نوسینە دەژمێردرێ، لەهەمان کاتدا هەریەکە لەنیگارکێشان ومۆسیقاش بەجۆری سەربەخۆ دەژمێردرێن. نوسینی ڕەسەنیش بەشێوەی مۆرکێك لەسەر بابەتەکان کاردەکات، ئەو مۆرکانەش وەکو شوێنپێ وان..بۆ نموونە لەپرسیارێکدا دەڵێین: کێیە لەسەر ئەم ڕۆیشتووە؟ ئەوە یەکێك ڕۆیشتووەو لەدوای خۆی شوێنپێیەکانی لەهەموو شوێنێك جێهێشتووە، ئەو شوێنپێیانەی جێماون ئەوەمان بیردەخاتەوە کەوا کەسێك لەم شوێنە ڕۆیشتووە، بەڵام

بۆخۆی ون ونادیاره. بۆیه دهكرێ نوسینی رهسهن بهوه پێناسه بكهین كه بریتییه له: درككردنمان به حهقیقهتێك كه ون ونادیاره و بهدوای خۆیدا ههست كردن بهناسۆری دێنێ، ئهو ناسۆرییهی لهو ئهزموونانهمان دێت تیایاندا ههست بهكهم توانایی خۆمان دهكهین لهنهدۆزینهوهی شته ونهكان.. كهچی ههموو ئهو نیشانانهی لهدوای خۆی جێماون شوێنهوارن، ههر ئهو مۆرك وشوێنهوارانهش وێرای نادیاری بوونهكه، جهخت لهسهر ئامادهگی و بوونی ئهو نادیاره دهكهنهوه، لهراستیدا ئهمه هەڵوێستێكی سهیرو نامۆیه! (لهوانهیه دهستنیشان كردن.. واته زیادكردنی سیفهتی كهسایهتی بۆ ناعاقڵ.. شێوهیهك لهشێوهكانی ئاسان یان سادهكردنهوهبێت بهڵام لهگهڵ ئهمهشدا یارمهتی تێگهیشتن دهدات.)

رهخنهی كلاسیكی وا راهاتووه لهگهڵ بیرۆكهیهك ولهرێگهی رووبهرووبوونهوه لهگهڵ كاری ئهدهبی دهربكهوێت. بۆیه رهخنهگرتن لهچامهیهكی شیعری بهگهڕان بهدوای دۆزینهوهی ماناكهی دادهنرێت، لهبهرئهوه مانا بیرۆكهییهكه یاخود چهمكێكه دهتوانرێ بهبیرۆكهیهكی‌تر یان چهمكێكی‌تر ببهستێرێتهوه، ئهو پرۆسهی گرێدانه بهردهوام بێت تا بهیهكگرتنی بیرۆكهگهلێك لهبیرۆكهی كهینونه، یان حهقیقهتی باڵاكردوو. بهڵام ئێمه درك بهو حهقیقهته ناكهین كه ئهو شتهی ناومان ناوه(مانا)، لهحهقیقهتی خۆیدا بیرۆكهیهكه میتافیزیك وهك رێگه دهربازێك بۆخۆی دهزانێ و، خودی بونیادگهریش كه لهبارهیهوه دهگوترێ بهردهوامی (سهیرورره)یهكی شۆرشگێرییه، لهچنگی میتافیزیك رزگار نهبووه، ئهو قسهیهش كه دهڵێ بونیادگهری ئهسهقییه،واتا نێوهندێك لهشوێنێكدا ههیه.. ئهو نێوهندهش، ئهو چهمكه نێوهندییه كه دهكرێ بدۆزرێتهوه، بهو پێودانگهی چهمكی كهینونه یان دهسهڵاتی باڵاكردووه..چهمكی ئهسهقیش ئهوه دهردهخات كه ههموو شتێك لهسهر باشترین شێوهیه، یان بهلای كهمی توانای تێگهیشتنی ههیه، بهم چهشنه لهههر شوێنێك ئهسهقێك ههبێت لهرزۆكیو تێكهڵكردن و ئاڵۆزی نامێنێت.

ههڵوهشاندنهوه جهخت لهسهر ئهو شتانه دهكاتهوه كه تهنها وههمن و بهس، چونكه ههر شتێك كه پێمان وایه راسته یاخود كهینونهیه، بهتهنها به ئامرازكردنهو بهس. ئهم وشانهش ئاماژهن بۆ ئهوهی كه له لێكۆڵینهوهكهمان دهربارهی مانا سهركهوتووبین. ئهمهش بهو مانایه

دێت كە لێكۆڵەرەوان لە قۆناغێك لەقۆناغەكانى مێژووى لێكۆڵینەوەى مانا ئەو راستیەیان راگەیاندووە، كەلەبەر هەر هۆیەك بووبێت نەیانتوانیوە بگەنە دراخاڵو ئامانجى لێكۆڵینەوەكە، بۆیە پێویست ناكات بەلێكۆڵینەوەى تر خەریكبین نە نیازى تێپەراندنى ئەو خاڵە، ئەمەش بەمەبەستى پاراستنى خاڵى كۆتایى لەسوكایەتى پێكردنى هەوڵەكان كە لەوانەیە لە لێكۆڵینەوەكانى ئایندە ئاراستە بكرێت و، بمانەوێت جۆرێك لەپیرۆزى بدەینە ئەو خاڵە و ناوى بنێین بەراستى(trutn) یان كەینونە(being) یان هەرشتێكى تر.لەم نێوەدا لێكۆڵینەوە لەخاڵى كۆتایى و چەمكى پیرۆز وەكو نێوەندێكى رەخنە بەهەردوو جۆرى كلاسیكى و بونیادگەرى لەگۆڕپانەكەدا كارى كردووە. بۆیە لەم نێوەدا چالاكى رەخنەیى ئێمەو تێگەیشتنمان بۆزمان لەسەر بنەماى فریودانێكى گەورە بەرێوەچووە.

لەكۆتاییدا پێویستە بگەرێمەوە سەركێشەى رەخنە.. رەخنە بەماناكلاسیكیەكەى خۆى پیادەكارى نموونەیەك بوو بە مەبەستى تێگیشتنى كارى ئەدەبى، رەنگبێ ئەو نموونەیەش (فەلسەفى-ئایینى-زمانى ..تاد) بوایە. پێدەچى ئەو كاتە رەخنەگر هێندە وشیار نەبووبێتن ئەمەش لەو راستیەدا دەردەكەوێ كە تەنها نموونەیەكى دیاریكراوى وەرگرتووە، بۆیە ئەو شتەى پێى دەڵێن هەڵسەنگاندنى خودى لەحەقیقەتدا خودى نییە، چونكە ئێمە بەدواى شتێكدا دەگەرێین كەوا لەكارى ئەدەبیدا بەشتێكى دیكە لەبەردەوامى ئەو تێگەیشتنەدا بوونى هەبێت كە دەبێتە هۆى هەڵسەنگاندن. كە دەكرێ ئەم شتەش نەسەقى ئەدەبى بێت كە تواناى بەرهەمهێنانى ماناى بەخشیوەتە وشەو كار(actions) دیار دەكات. بۆنموونە ئەگەر هەوڵى راڤەكردنى چامەى شیعرى(the lake of innisfree) بدەم، دەتوانم لەمیانى بەیەكەوە گرێدانى ناوەرۆكى چامەكە بەو زانیارییە فەراهەمكراوانەى پەیوەستن بەژیانى شاعیرەكە ئەنجامى بدەم.. ئەو زانیاریانەى تایبەتن بەسەلیقە و حەزو رامانى شاعیر لەوسروشتەى كە بەردەوامو بەخێرایى لەگۆڕان دایە. هەروەها لەخێرایى شتەجوانەكان و، هەلاتن لەدەستكەوتە ماددییەكان و خۆشەویستى ئەو بۆ ژیان دەسپێدەكەم، پاشان دەست بدەمە گرێدانى بیرۆكەكانى ناوچامەكە بەو بیرۆكە دەرەكیانەى كە بەسیفەتى نەسەقێك خۆیان دەنوێنن بۆ بەیەكەوە گرێدانى بیرۆكەكان لەناو چامە شیعرییەكەدا. بۆیە كاتێ بەپرۆسەى

بەیەکەوە گرێدانی بیرۆکەکان لەو شتەی لەدەرەوەی چامەکەدا هەیە هەڵدەستم، ئەوا ئەو بیرۆکانەی کە تەژی چامەکەیە، تەنها دەبنە خاوەن یەك ماناو بەس.

وێڕای ئەمە دەست دەکەم بەلێکۆڵینەوە لەهۆی خەمۆکی شاعیرو خۆشەویستی ئەو بۆ ژیانو، ئەو هۆیانەی هانی دەدەن رقی لەدەسکەوتە ماددییەکان بێتەوە. لەم جۆرە رەخنەیەدا سەرنج دەدەین، کە ناکرێ تەنها جەخت لەسەر خودی نەسەقەکە بکەینەوە، چونکە جەخت کردنەوە لەسەر نەسەق بۆ خوێندنەوەی خودی نەسەقەکە بەرەو بونیادگەریمان دەبات. بۆ نموونە مەبەستی ئەدەبی لەجێهێشتنی نیشتمانی سەرەکیو رووکردنە دوورگە چییە؟ئاخۆ لەم نێوەدا مەبەستی تر هەیە ؟ لەوەڵامی ئەم پرسیارەدا بەدڵنیاییەوە دەڵێین بەڵێ، بۆ نموونە هەندێ لەکەسایەتییە کۆمیدییەکانی (شکسپیر) دەبینین کە شار جێدەهێڵنو روودەکەنە ئەو دارستانەی تیایدا ململانێکان چارەسەر دەکرێنو، پڕن لەپەند.هەروەکو لەشانۆگەرییەکانی (کما تحبهاو حلم لیلە منتصف صیف). هەر لەسەر ئەم رێچکەیە ژمارەیەك کەسایەتی لەنێو(چامەی شیعری و رۆمان)ەکان دەبینین کە رووەو دوورگە دابڕاوەکان، شارەکان جێدەهێڵن. نموونەی ئەمەش (برۆسبیسۆ)یە لەشانۆگەری (رەشەبا)و کەسایەتی (جیلیفر) لەرۆمانی (گەشتەکانی جیلیفر). لەبەر ئەوە کە(ییتس)ی شاعیر لەپەنابردنە بەر دوورگەی( fnnisffree) باس لە حەزی نووسەران دەکات بۆ ئەم دابڕانە. رەنگە ئێمەش بڕوا بەمە دەهێنین کە وازیان لەشار و دیمەنەجوانەکانو پەنابردنە بەر دوورگە مانایەکی شیعری گەورە لەخۆی دەگرێ. بۆیە لەبەرڕوونی بڕوایەکی ئەدەبی یان رێککەوتنێکی ئەدەبی بەوەی کە ئەم بیرۆکەیە مانایەکی هەیە، سەرنج دەدەین لەتوانای شیکردنەوەی بونیادگەری‌دا هەیە،کەلەپێناو خوێندنەوەی نەسەقی شیعری جەخت لەسەر رەگەزەکانی تری شیعر بکاتەوە. لەنموونەی یەکەمدا، واتا پیادەکردنە نابونیادییەکە، کۆمەڵێ نموونەی دیاریکراوی ناسراوی نێو ئەدەب بەرەندە(بەرجەستە) کراون، بەڵام لەنموونەی دووەمدا ، واتە نموونەی راڤەکردنی بونیادگەریانە چامە شیعرییەکەو رەگەزەکانی لەخوێندنەوەی نەسەقی شیعریی یان خوێندنەوەی نموونە ناسراوەکانی ئەدەب بەکارهێنراون. لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە هەڵوەشاندنەوە هیچ کام لەم دوو

حاڵەتە ناگەیەنێ.هەڵوەشاندنەوە هیچ نموونەیەك ناداتە رەخنەگر، هیچ نموونەیەكیش لەسەر دەقە ئەدەبییەكان بەرجەستە ناكات، بەڵكو ئەو سەرجەم نموونە ئامادەكان ویرانیدەكات و، هیچ نموونەیەكیش پێشكەش ناكات، لەبەر ئەوە نووسینی هەڵوەشاندنەوەیی سەرسوڕمانێیا زۆری ناوەتەوە. بەپێچەوانەی رەخنەی بونیادگەری، هەڵوەشاندنەوە بڕوای بەبوونی ئەسەقێك نییە كە بتوانێ لێی تێبگەین. لەم نێوەدا دوای ئەوەی كێشە ئەدەبی و زەینیەئاڵۆزەكان رووبەرووی بونیادگەری بووەوە كە لەپێش كارە ئەدەبیەكانەوەن، بونیادگەری رادەگەیەنێ كە دەكرێ ئاڵۆزی شیبكرێتەوەو تێیبگەین، هەروەها بانگەشەی ئەوەش دەكات كە ئەمەش لەئەسەقێكی ئەدەبیدا هەیەو لەتوانایدایە ئاڵۆزیەكان راڤەبكات ئەمەش جەختكردنەوەی ئەو ئیرادەیە كە بونیادگەرێك والێدەكات ئەو بانگەشەیە بكات، چونكە بونیادگەری جەخت لەسەر ئەوە دەكاتەوە مرۆڤ ئیرادەو توانای چارەسەركردنی هەر شتێكی ئاڵۆزی هەیە، بەپێچەوانەی ئەمەش، هەڵوەشاندنەوە لەتواناكارییەكانی ئەسەق دەكۆڵێتەوەو، پرسیار لەو ئەسەقەو ئەو چۆنیەتیە دەكات كە دابونەریت و تایبەتمەندییە ئەدەبیەكان هێناویانەتە بوون. ئەو رووبەرووبوونەی لەنێوان هوشیاری مرۆیی و ئەسەقی هێماشدا هەیە، سەرچاوە لەو ئاڵۆزییە وەردەگرێت كە تێگەیشتنی ئەستەمە. لەبەر ئەوەو بەو پێیەی (دیفید ئەلسۆن) باسی لێوەدەكات، هەڵوەشاندنەوە جەخت لەسەر زەرووردتی پێداچوونەوە بە بیرۆكەكان و تەواویكێشەی زمان دەكاتەوە. بۆیە رەنگە بۆ بەكارهێنانی رەچەڵەكی وشەكان(etymology) و دەروونناسی پێویست بە بوارێكی نوێی مەعریفی بكات. لێرەوەیە كەتێبینی دەكەین هەڵوەشاندنەوە قێز لەمیتافیزیك و فەلسەفە دەكاتەوە، لەو دیدگایەی دوو جۆری درككردنی فریودەرن ،هەروەها ئەو زمانیانەی كە میتافیزیكیان لەو نموونانەی خۆیان حەشارداوە كە تاریكن لەزمان لەگەڵ هەڵوەشاندنەوە ناگونجێن. هەروەها هەڵوەشاندنەوە پەنا بۆ ئەو بونیادگەرییە نابات كە بەتوندی پێ لەسەر زمانیەكان دادەگرێت.

لێرەوەیە پێدەچێت تیۆری هەڵوەشاندنەوە بوارێك بێت چەندین رێساو سیستم و زمانی تایبەت حوكمی تێدا بكەن، كە ئەمەش وا دەكات تێگەیشتنی لای ئەوانەی لەسەرەتای

خوێندنەوەیدان گرانبێت، بەڵام حەقیقەتەکە پێچەوانەیە، چونکە ئێمە زیاتر لەتیۆرە ڕەخنەییە کلاسیکییەکان کۆمەڵێ ڕێساو سیستەمو زمانی تایبەت دەبینین، وەك لەنێو هەڵوەشاندنەوە. لەم حاڵەتەدا ئەوەی کە سەرەتای خوێندنەوەی بێت بۆ هەڵوەشاندنەوە ڕووبەڕووی هەندێ چەمك و زاراوەی تەکنیکی دەبێتەوە، لەوانە (کەسایەتی ،گرێ، بابەت، وێنە، هێما، شیعری لیریك، چامەی شیعری و.. تاد) کە هێندە بەکار دەهێنرێن، دواتر دەبنە شتێکی سروشتی. سەرەڕای ئەوە ئەگەر ئێمە لەو چەمکانە نەگەین کە وەکو (جیاوازی، مۆرك، نوسینی ڕەسەن)ن، ئەوا ناتوانین لە هیچ کارێکی نوسراو کەدەچێتە ژێر ئاڵای ئەو تیۆر تێبگەین، چونکە تێگەیشتنی شتی نوێ ئەستەمە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا مرۆڤ زۆر سود لەفێربوونی ئەو تیۆرە وەردەگرێ. بەتایبەتی ئەگەر پێش وەخت هەوڵو کۆششێکی باشی لەگەڵ دابێت. ئەم سودەش خۆی لەوەدا دەبینێتەوە کە ئێمە پرسیار لە پەیوەندی تێگەیشتنی مرۆڤو جیهانەکەی بە ئەپیستمۆلۆژیاوە دەکەینو، هەڵوەشاندنەوەش تیشکێکی نوێ دەخاتە سەر چالاکیە هزرییەکانمانو، پێمان ڕادەگەیەنێ کەدەسەڵاتی ئەدەب نە لە دەسەڵاتی ئەدەب خۆیو، لەدەسەڵاتی زمان هاتووە، چونکە لەمەدا دەسەڵاتی زمان وەکو هەریەکە لە(مۆسیقاو نیگارکێشانو پەیکەرتاشیو سروتەکانو..تاد)وایە، کە بۆ هەستکردنێکی سەرەتایی ڕەسەن بەشتێکی ون یان نادیارو درککردنی مرۆڤ دەگەرێتەوە.

سەرچاوە :

گۆڤاری(الاداب الاجنبیە) ژ: 104 ی پاییزی 2000

تێبینی:

1- بەپێویست دەزانراوە پەراوێزەکان وەربگێردرێن.

2-سینترالیزمی لۆگۆسیلە: التمرکز حول اللوغوس .

3- فۆنۆ سێنترال: التمرکز حول الصوت

4- گرافۆ سێنترال: التمرکز حول الکتابە

# بۆدریار و ئەوجەنگەی هەرگیز رووی نەدا

ن: کریستۆفەر نوریس

و : ڕێبین رەسول ئیسماعیل

## کەنداوی واقیع

**تاچ رادەیەک** دەشێت هزرڤانێک ڕۆبچێتە نێو مەڵەو لەسەر ئەوەش بەردەوام بێت کە سەرنجێکی جیدییانە بۆلای خۆی کێش بکات؟ ئەو حاڵەتەی کە(جان بۆدریار) پێشکەشی دەکات حاڵەتێکی بەسوودە بۆ ئەزموون وەرگرتن، (بۆدریار) لەنێو دیمەنی ئێستای هزری (پۆست مۆدێرنیست) کەسایەتیەکی ناسراوەو بڵاوکەرەوەی هزرێکە لەهەموو هزرەکانی‌دی بێهودەییترەو ئێستا لەنێو نێوەندی قوتابیانی خۆیدا پێگەیەکی سەرنج راکێش داگیردەکات، ئەو قوتابیانەی دەچنە ڕیزی مۆدێلی هزری فەرەنسی.

چەند ڕۆژێک بەر لەهەڵگیرسانی جەنگی کەنداو(بۆدریار) وتارێک لەسەر لاپەرەکانی رۆژنامەی (گاردیان) بلاو دەکاتەوەو تیایدا ئەوە رادەگەیەنێت کە ئەم جەنگە هەرگیز روونادات، چونکە وەکو ئەوەی دیارە تەنها شتێکی دروستکراوەو دەرەنجامی ساختەکاری دەزگاکانی راگەیاندنی گشتیە و گوتاری وازی جەنگە یان سیناریۆیەکی خەیاڵییە کە سەرجەم سنورەکانی جیهانی واقیعی یا گریمانی راستەقینە تێپەر دەکات.

لەماوەی چل ساڵی رابردوودا سیاسەتی بەرپەرچدانەوە کارێکی وای کردووە بەشێوەیەک جەنگ بۆتە شتێکی ئەستەم، تەنها ئەوەنەبێت کە بەشێکە لە دیاردەیەکی گوتاربێژی، یا

جۆرێکە لە گۆڕینـەوەی هەڕەشـەی ئیسـتیفزازی بـە جۆرێـك سروشـتی زیـادەرۆییکردن لـە دەربڕینی زارەکیانە دەبێتە هۆی ئەوەی لەدەرەنجامدا ببێتە هۆی روونەدانی رووداوێکی لەم جـۆرە، جگـە لـەوەش جـەنگ تەنـها وەکـو نمایشـێك و نواندنێـك یـا جـەنگێکی وەهمـی سـەرکەوتنی بـەندە بـە رادەی توانـای کـارگێڕی وگونجـاندن وهەڵسـوراندنی ئـەوەی بـەڕای گشتی ناوزەد دەکرێت.ئەوەش تەنها کاردانەوەیەکی پێنجەوانەییە لەئاست گوتار و وێنەی میکانیزمی کۆنترۆڵکردنی راگەیاندن کە وەهمی پاڵپشتیحردنی گشتی جەماوەر لەجـەنگ دەردەخات، ئەوەش لەسایەی پێشکەش کردنی پێشینەییانەی هەموو وەڵام وهەڵوێستێکی راستەقینە.

جەنگ بەرپا نابێت، بەم شێوەیە (بۆدریار) بەلووت بەرزییەوە بۆ چوونی خۆی راگەیاند، ئێستا قسەکردن لەسەر جەنگ بۆتە ئەلتـەرناتیڤی خـودی رووداوەکـە، دەربـارەی رووداو و چرکەساتی دەستپێکردنی وەکو ئەوەی رۆژێك لەرۆژان زاراوەی (جەنگ) دەلالـەتی لێ بەکرد، زۆر بەسادەیی ئێمە هەستی جیاکردنەوە یاخاڵی، جیاوازیمان لەدەست داوە، ئێمە لەنێوان جەنگی وشەو ئەو وەهمەی دەزگا راگەیاندنەکاندایین کە وەکو گریمانێك بەرهەمیان هێناوە ، ئـەوەش بـەو مەبەسـتەی بۆشـتی راستەقینە نامادەمان بکات، لەگەڵ خودی ئەو شـتەی کـە بۆخۆی روونادات تەنها لەنێو خـەیاڵی تەماشاکەری تەلەفزیۆندا نـەبێت، ئـەو بینەرانـەی کـە دووچـاری سەرسـوڕمان هـاتوون، ئەوانـەی بۆخۆیـان بـەجۆرەها وێنـەو یـاری ڤیدیۆیـی بۆردومانکران کاتێك شاشـەکانیانی لـەکاتی هەڵمـەتی کۆکردنـەوەی هێزەکانی بەر لەجـەنگ داپۆشی. ئەی باشە واقیعی حاڵ ئەوکاتەی جەنگ دەسپێدەکات- ئەوە نییە کە هـەر هـەموو لەسـەرۆك وڵاتـان وبینـەرانی بەرنامـەی سـەرەکی سیاسـەتمەداران و ژەنەراڵـەکانی هێڵـی پێشـەوە، شارەزاو پسـپۆڕانی پنتـاگۆن و کەسـانی تریـش، ئـەی هـەر هـەموویان پشـت بـە زانیاری هەڵچنراو و ناراستەوخۆ نابەستن کـە گوایـە رووداوەکـان دەگوازرێتـەوە؟ لـەبارێکی ئاوادا(بۆدریار) مەسەلەکە بەعەقڵانی دەکات، ئێمـە دەتوانـین دەسـبەرداری هـەموو قسـە و دیالۆگێکی وەهمی بین دەربارەی جیاوازی لـەنێوان جـەنگی وەهمی و جـەنگی راستەقینەو

دان بەوە دابنێین کە واقیع وەکو پێشوتر نەماوە، ئەم راستییەی (واقیعی بێت یان خەیاڵی) کە خۆی لەدواوەی دیاردەکاندا حەشارداوە.

بەم شێوەیە (بۆدریار) ناکەوێتە نێو رووداوەکە- ئەورووداوەی کە روونادات، وەکو ئەوەی ئەو پێیوایە- کەواتە جەنگی کەنداو بەشێوەیەکی وا گەورە نابێت تادەگاتە ئەو خاڵەی وشەکانی جەنگ رێگایەك بۆکردەی بەریەککەوتن نادۆزنەوە، تەنانەت ئەگەر ئەوە رووبداو جەنگیش هەڵگیرسایەوە کە ناتوانێت لەشوێنی خۆیدا بەووردی پێشبینی ئەوە بکات کە ئەو شتانەی دەیبینێت یا گوێی لێدەبێت یان دەیان خوێنێتەوە تەنهاو تەنها نواندنێکی ساختەکارانەو خایاڵکراوی ئەوشتە، راستەقینەیەو مکانیزمی پروپاگەندەو شێوازە جیاجیاکانی لەخشتەبردن و فریودانی راگەیاندنی بەشداریان لەدارشتنیدا کردووە.

لەواقیعدا ئەوە سادەییە گەر مرۆڤ بتوانێت لەنێو ئەم چوارچێوەیەدا بیربکاتەوە، وەکو ئەوەی جیاوازییەکی کاریگەر مەعریفە راستگۆو دژەکانی ئەوانەی ستراتیژیەتی دەست بەسەراگرتنی راگەیاندن و را وەرگرتنەکانی رای گشتیو دیالۆگە پەرلەمانیەکانو زۆری تر لەیەکتر جیادەکاتەوە. چونکە ئەم کارتێکەرە راگەیاندنییە راستەقینەیە- توانای ئەوەی هەیە کار لەناراستەی رووداوە رۆژانەییەکان بکات- هەروەکو هەمووشتێکی تر دەشێت( بەپێی توانای خۆمان لە سەر مەعریفە) بەراستی روویدابێت، یا ئەوەتا ئێستا لە روودانـدا بێت، لە دەرەوەی بازنەی داپۆشینی چڕکراوەی تەلەفزیۆنیدا. زۆر بەکورتی گریان بۆ کەمی زانیاری واقیعی بابەتی و بێلایەن بێسوودە ئەو کاتەی ئێمە هیچ پێوەرێکمان لەبەردەستدانیە- یا هیچ شتێکمان بۆ بەراوردکردن لەبەردەستدا نییە، تاوەکو رێگا بەچاودێرە شاردزاکانی نێوانیان بدات و بگەن بەتێروانینێکی رەخنەیی( شوێنگەی ستراتیژی ئێمە شاشەی تەلەفزیۆنە، ئەویش رۆژانە دەکەوێتە ژێر بۆردومان).

خودی ئەوە تەنها لەسەر ئەو ملیۆنەها بینەرە ناسەپێت کە لەشاشەی تەلەفزیۆنەوە دەڕواننە رووداوەکان، بەڵکو بەسەر کەسایەتیەکانی نێو دەسەلات و ئەو کەسانەی لەپێگەی هزریشدان دەسەپێت، ئەوانەی زۆرجار وا وەهم دەکەین- وەکو دیارە بەهەڵەدا دەچین-(ناگاداری) زۆر شتی نهێنین کە لەلای زۆرینەی هەرە زۆری هاوولاتیانی داماو

ئاشکرانییە. چونکە حاڵەتی ئەوانەش هەروەکو حاڵەتی ئێمە وایە، ئەوانیش دیل و کۆیلەی وەکو خەڵکانیتر- سیستەمێکن کە پێیان وایە ئەوان بۆ خۆیان فرمانەکانی دەگرنە دەست و ئاراستەی دەکەن، بەمانای چەمك وپراکتیك کردنی وشەکە، بەلام لەراستیدا خودی ئەوانیش بەکۆمەڵێکی بێکۆتایی لەوێنەی ساختە وهەواڵی بەپەلەی پێشوتر ئامادەکراو بۆردوومان دەکرێن، باشە ئەی ئێمە ئەم زانیارییانە لەسەرچاوەی (باوەرپێکراو)ی وەکو دەزگای(cnn) وەرناگرین! بەڕادەیەك یاریزانە سەرەکییەکانی ئەم مەسەلەیەش جۆرج بۆش، جۆن مێجەر،ستراتیژزانانی پنتاگۆن و کەسانی تریش- زۆر لەراستیەکان ئەوانەن لەمەیدانی جەنگدا روودەدەن هەر لەم کەناڵە تەلەفزیۆنیانە وەرناگرن،(بێگومان) دوای ئەوەی هەموو ئەو ماددانەی دەگاتە شاشەکەی دەخرێتە ژێر چاودێری ئەمنی وتەکنیکی مەیدانی راستەوخۆن هەرچەندە بیر و بۆچوون و مەزەندەکانیان دەربارەی رووداوەکان راستەقینەش نەبن.

بەلام وەك دیارە هەموو ئەو بڕیارانەی داڕێژراون و ئەو وشانەیهێزی ئەم بۆچوونانە دەردەخەن و ئاشکرا دەکرێن دواتر بەردەوام بەشێوەیەکی حەقیقی بەتەنها کار لە(رای گشتی) ناکەن بەڵکو کار لەرەفتار وئەنجامدانی ستراتیژیەتی جەنگیش دەکەن لەنێو(جیهانی حەقیقیدا) هەموو ئەوانە بەڵگەن- ئەگەر پێویستیمان بە بەڵگە هەبێت- لەسەر ئەوەی کە ئێمە چووینە نێو قۆناغێك لەگوێ پێنەدان، بازماندا بەرەو ئەو قۆناغەی کە پەرینەوە بەرەو جەنگ وەکو جۆرێك لەنارووداو وایە، - شتێك یا ئەوەتا روونادات- وەکو ئەوەی بۆدریار بڕوای وایە- یا روودانی شتێکی نەزانراوە مادام ئێمە لەسەردەمانێکی زۆرەوە هەموو شێوازەکانی لەیەکتر جیاکردنەوەی (واقیع) و دژە خەیاڵکراوەکانیمان لەدەست داوە. لەسەرەتا ئێمە بانگەشەی رەگەزی ئامنمان دەکرد. بەلام ئێستا باس لەجەنگی ئامن دەکەین. (بەم شێوەیە جەنگێکی وەکو جەنگی کەنداو لەسەر پێوەری رێختەردا زیاتر لەدووپلە یان سێ پلە تۆمار ناکات، ئەوە جەنگێکی حەقیقی نییە، جەنگێکە بێ نیشانە و ئاماژەی جەنگ: (جۆرە جەنگێکە دەلالەت لەوە دەکات کە تۆ لەسەرت نییە لەرووی هیچ جەنگێکدا

بووەستێت، ئەوەش وادەکات جەنگ وا(وێنابکرێت) وەکو ئەوەی لەقوڵایی کوێنێکی تاریکدا روودەدات.)

بەکورتی سەرجەم هەڵمەتەکە ئیمتیازێکی تەواوی راگەیاندنییە، بەردەوامبوون و درێژکردنەوەی تەکنەلۆژیای یاری جەنگی ڤیدیۆیە بەلام بەشێوازی ئەڵتەرناتیڤ، سیناریۆی(بان واقیع)ی( ئەمە گوتەیەکی بۆدریارە)، چونکە راستی بە موفرەداتی گوتاربێژیو ئەنجامدانی رووتی ئەمکردەیە پێناسە دەکرێت واتا تەنها ئەو شتەی لەحاڵەتی ئێستادا حیسابی بۆ دەکرێت و بەپێی ئەو مەرجانەی داکۆك بوونی راگەیاندنی بەردەست دەیسەپێنێت.

ئێمەش ناتوانین نارەزایی لەبەرامبەر شێوازی ئەم زەمەنە خاوەن شکۆیەدا دەربڕین (راستی بەردەوام یەکەم قوربانی جەنگە) وحکومەتیش زانیاریەکان پەردەپۆش دەکات- یا پشت بە شێوازی درۆوەلەسە و پڕوپاگەندە دەبەستێت- بەمەبەستی پەراوێزکردنی دەنگە جیاکان و دواتریش رێگە گرتن لە ئەنجامدانی دیالۆگێکی میللی رۆشن دەربارەی ئەم شتانەی روو دەدەن. چونکە لەحاڵەتێکی ئاوا ئەوە ئاشکرا دەبێت کە ئێمە کەوتووینەتە نێو داوی پرەنسیپەکانی یاری پۆست مۆدێرنێستی چونکە لەواقیعدا شتەکان لەرۆژگاری ئەمرۆماندا گوازراونەتەوە بۆ خاڵێك کە لەگەڵیدا بەها کۆنە هەڵخەڵەتێنەرەکانی سەردەمی رۆشنگەری وەکو سەکۆی کۆتایی کاریگەری خۆی لەدەستدا، ئەو بەهایانەی رۆژێك لەرۆژان بەلایەنی کەم لەنێو هەندێك لەسێنتەرەکاندا بالا دەست بوون.

هەرکەسێ سروش لەو پێوەرانە وەربگرێت بێگومان کەوتۆتە نێو چنگی نارەزوویێکی نوستالیژیانەی گوتاری رەها کە بەناوی راستیەوە قسە دەکات جا ئەفلاتوونی یا کانتی یا مارکسی یا هەرشتێکی تر بێت- ئەو گوتارە پەناگەیەکی فریودەری پێدەدات و تیایدا دوور دەستە دەبێت لەمەعریفەی ئەوەی کە ئەمرۆ ئێمە ببین سەرچاوە یان پرەنسیپێکی واین کە بتوانێت بەهاناماەنەوە بێت بۆ مەسەلەی لەیەکتر جیاکردنەوەی راستی و ساختە، لەلاوازترین حاڵەتیشدا، ئێستا ناتوانین بڵێین- بەلایەنی کەم دەربارەی ئەوەی کە پەیوەستە بەوەی لەم رۆژگارەدا روودەدات- کەجەنگ لەکەنداودا بەراستی دەستیپێکرووە: بەبەراورد لەگەڵ

شێوەو روخسارە قسەلۆکیە فرەو جیاوازەکاندا. سیناریۆیە خەیاڵکراوەکان، دەست نیشانکردنی شێوازەکانی راگەیاندنی گشتی بۆ ئەم جەنگە و شتی تر.

چونکە هەر بانگەشەکردنێکی لەم جۆرە بەردەوام هاوشێوەی ئەنتۆلۆژیایەکی واقیعی دەبێت کە تائێستاش دیلی هەندێك فرەجۆری دوولایەنی راستیە/ساختە یان راستەقینە/ خەیاڵ. لەتێروانینی بۆدریارەوە لەنێو هزری پۆست مۆدێرنیستیدا ئەم زاراوانە بەو ئامارژە باڵا دەستانە بۆ واقیع دەگوێزرێنەوە (بان واقیع) کاریگەریەکەشی لەوەدایە کە دەتوانێت هەموو جیاوازییەك بەلاوە بنێت یا بیسرێتەوە لەنێوان حەقیقەت ونەوشتەی- لەبەر زۆر هۆکاری کردارەکیانە-(لەرێگا بڕوا پێکردنەوە گونجاوە). لەگەڵ ئەوەشدا رەنگە ئێمە لەرێگای راست لابدەین ئەگەر زۆربەی هەرە زۆری پێشبینیەکانی بۆدریارمان بەرەهایی بەهەڵەداناو بڕوامان کرد کە جەنگی کەنداویش بەپراکتیك وەکو راستیەکی بێ غوبار دەستی پێکردووە، بەم شێوەیەش بەچاوی پڕ گومانەوە بڕوانینە سەرجەم هزرەکانی، چونکە مرۆڤ بەردەوام لەتوانایدایە بەهانە بە بەهانە وەڵام بداتەوەو لەبانگەشە کردنێکی لەم جۆرانەدا پرسیار دەربارەی ئەوەش بکات کەدەشێت بەرووداو دابنرێت بەتایبەتیش ئەگەر مەعریفەی ئێمە بۆ ئەم رووداوانەی لەژێر وتووێژ و دیالۆگدان مەعریفەیەکی ساختە بێت و بەگشتی پشتی بەچەندین شێوەی جۆراو جۆری وەهمی راگەیاندنی بەستبێت: ئەو راگەیاندنانەی بەشێوەیەکی بەتوانا دروست دەکرێن. بەهەرحاڵ دیارە ئەوە هێڵی کشانەوەو تێکشکانی کۆتاییەتی لەرووی ئەم وەڵامە روونەی کە رووداوەکانی دواتر خستیانەروو.لەوەش زیاتر ئەو دێت بەکورتی ئەم قۆناغانەمان بۆ ئاشکرا دەکات کە لەسایەیانەوە بەپەلە پەرینەوە بەرەو (کەنداوی واقیع) و ئێستا، ئەم حاڵەتە لە بوون لەنێو گەرداوێکی ئەبەدیانەدایە(بازنەی ئاوابوون) لەنێوان وەهمی یاری جەنگ و خودی رووداوی نامەعقوڵدا( خەونمان بەجەنگێکی ساف) بۆدریار دەنوسێت،(جەنگی ستراتیژیەتێکی ئاسمان خاڵی لەوردەکاری رۆچوونە نێو سیاسەت وناوەخۆ) ئەوە قۆناغی گواستنەوە بوو لە شێوەیەك لەسیناریۆی شێت( بەرپەرچدانەوە یان کاول بوونی هەردوولا) بەرەو فانتازیایەکی تری سوریالی تر و سەرسورهێنەر تر لەدەسپێشخەرییەکەی (رێگان) دەربارەی جەنگی ئەستێرەکان.بەڵام ئێمە

ئەمرۆ  بۆدریار دەڵێت- لەنێو  ئەم قۆناغەدا دەژین و بەرەو حاڵەتێکی ترلە ئیستیفزازێکی هێمن وجێگیر تێپەر دەبین حاڵەتی ناموبالات و خۆ لەگێلی دانی بەکۆمەڵ ئەو کاتەی کە جەنگ تەنها وشەیەکە، دەلالەتێکی نقومبوو بەتاڵ لەهەموو بارگەیەکی دەلالی کە پەیوەست بێت بەجیهانی راستەقینە( پێویستە لەسەرمان وشیاربین) بۆدریار دەنوسێت(بەهۆی نەبوونی هیچ راگەیاندنێك دەربارەی دەسپێکردنی جەنگ، جەنگی راستەقینەش بەبێ راگەیاندن بوونی نابێت- ئەوە چرکە ساتی گواستنەوەیە لە وشەوە بۆ کردار).بەئامادەنەبوونی راگەیاندنێکی ئاشکرای لەو شێوەیە- وەکو ئەوەی گوتارەکەی ئەو بۆی دەچێت- زۆر بەسادەیی ئێمە توانای مەعریفەی ئەوەمان نییە کە ئایا جەنگ بەکردارەکیانە دەستپێکردووە یان ئەوەتا ئێمە ( ئەوەش زیاتر دەشێت) تەنها نواندنێکی ساختەو بەردەوامی کەرنەڤاڵی یاری جەنگ بەدی دەکەین چونکە حەقیقەتەکەی لەو توانایەی دایە لەسەر کۆپیکردنی هەموو نمونە پێویستەکان لەکاردانەوەی شێوازەکانی راگەیاندن. سەبارەت بەو کەسانەی بەدوای نوسینەکانی پێشوتری(بۆدریار)ەوە چووینەوە ئەوا ئەم رایە جێگای سەرسوڕمان نییە، ئەو پێیوایە ئێمە لەنێو فەلەکی کۆمەڵێك دیاردەی خەیاڵی یافریودەردا گوزەران دەکەین و  پێیوایە کەوا حەقیقەت بۆ یەکجاری لە دەستچوو، وەکو چۆن عەقڵی رۆشنگەری لەدەست چووە، یاوەکو هزرە لەنێو چووەکان و ونبوون، واقیع ئەمرۆ مەرجدارە بەهەمەکێتی بەسەمای(وێنەی ساختە)ی زۆر یا کارتێکەرەکانی واقیع و رەخنەگرتن لەدیاردە ساختەکانیش بێسوودە.

(جا ئەم رەخنەیە لەروانگەیەکی  ئەپیستمۆلۆژی یا کۆمەڵایەتی  سیاسی)یەوەش بێت، چونکە ئێمە بمانەوێت و نەمانەوێت تەنها خاوەنی ئەم دیاردانەین، بۆیە واچاکترە لەمە بەدواوە ئاشتی لەگەڵ واقیعێکدا مۆر بکەین کەبە( بارودۆخی پۆست مۆدێرنیستی) ناو دەبرێت، لەبری ئەوەی خۆمان پەیوەستی ئەو  جۆرە گوتارە کۆن و بەسەرچووانەی گوتەی حەقیقەت بکەین کە ئەمرۆ وای لێهاتووە هیچ راستگۆییەکی گوتاری و دەلالی نەماوە.

ماوەیەکی زۆرە - نزیکەی زیاتر لەدوو هەزارساڵ دەبێت- بیرۆکەیەکی وا لەنێو فەلسەفەکاران و هزرڤانە ئەخلاقییەکان و تیۆریستە کۆمەڵایەتیەکان و کەسانیتر بڵاوبۆتەوە

کـە دەشـێت حەقیقـەت لەسایەیکوشـتنی هـزری رەخنـەیی تونـددا هەسـت پێبکرێـتو بەوسیفەتەی کردارێکە بوار بـەهزرڤان دەدات لـەدەرەنجامی کۆتـاییدا بجوڵێـت وجیـاوازی لەنێوان گریمانی راستگۆ (یان بـەها راسـتەکان) و جۆرهـا شـێوەی وەهـم بکـات، وشـیاری ساختە، بەهەڵە داچوونی ئایدیۆلۆژیو شتی تر هەر لەئەفلاتوونەوە تادەگاتە کانت، هیگل، مارکس وئەوانـەی دوای ئەوانـەش هـاتن، ئـەو بیروبۆچوونـە بـەتوندی جێگیربوو سـەرەڕای هـەموو ئـەم بـەلاوەنان و بەلادا چوونـەی دووچاری سیسـتەمە مەعریفییـەکان هـات کـە بۆتـە مۆرکێك بەمێژووی هـزری خۆرئاواوە نووساوە،بەڵام ئێسـتا کەبۆتـە بیروبۆچوونێکی کۆنـی بـەلاوەنراو وەکـو ئـەوەی بۆدریـار بـۆی دەچێـت، چونکـە ئێمـە هـەموو هسـتکردنێکمان بـەجیاوازی جیـاوازی ئـەنتۆلۆژی یـا ئەبیسـتمۆلۆژی لەدەسـتداوە،جیـاوازی لـەنێوان هەقیقەتو جۆرەها وێنـەی ساختە، هاوشێوەو ئەلتەرناتیڤی فانتازیی کە لـەم سـەردەمەی ئێستاماندا ئازناویان بەدەست هێناوە، بەم شێوەیە جەنگی کەنداو وا پۆلێن دەکرێت وەکو نموونەیەك کە دەخرێتە سەر کەتەلۆگی فرەو فراوانی (بۆدریار) دەربارەی واقیعی(بان واقیع) لەنێو هـزری پۆست مۆدێرنیستیدا. جەنگ تەنـها ململانێیەکە لەسـەر ئـەم ئاسـتەدا سـەری هـەڵداوە، ئاسـتی سـاختەکاری سـتراتیژی شـێوەیەك لەشـێوەکانی پێـوە بوونـی بینـەر کـە دەکشێت و بالادەست دەبێت هەر لـەیاری جەنگی خایاڵیەوە بۆ داپۆشینی چڕی رووداوێك کە لەبنچینەدا دەچێتە نێو خانەی(جیهانی حـەقیقی) و ئێمـەش وا لێدەکات توانای ئـەوەمان نەبێت ئەم دوو نموونەیە لەیەکتر جیابکەینەوە.

## "بەهەڵە لەدریدا تێگەیشتین "

گومـان لـەوەدا نییە کە گریمـانی لـەم جۆرە دەچێتـە خانـەی قسـەی پڕو پـووچ- گوتـاری پۆست مۆدێرنیستی دەربارەی بابەتی ئالۆز و بەکاربراو- ئەمـەش مەسـەلەیەکە دەبێت لای هـەموو خوێنـەرێك کـە شەپۆلی ئێسـتای هزری لولی ئـەداوە روون و ئاشـکرابێت. من رەخنـەم ئاراستەی ئەم سەرلێشێوانە فەلسەفیانەی بۆدریار کردووەبۆیە ئێرە شـوێنێکی گونجاونییـە بۆ ئەوەی وردتر ودرێژتر ئەو شتانەی راڤەبکەم.کە لەزۆربـەی گریمانـەکانیاندا هەڵـەن، بـەڵام

واباشترە لێرەدا ئەو خاڵە سەرەکیانەی باسیان دەکات دووبارە بکەمەوە بۆئەوەی بەشێوەیەکی باشتر تێیان بگەین، یەکەم: بۆچی وتارەکەی دەربارەی جەنگی کەنداو لەم کاتەدا بڵاوکرایەوە و بۆچی ئەم هەموو وتووێژە جدییەی ئەنگێزەکرد؟

دووەم بۆدریار- لەپاڵ ئەو رەوتە پۆست مۆدێرنیستیەی کە لەبڕی ئەوان قسەدەکات- چۆن توانی ئەو باڵادەستیە و تاکگەراییە لەنێو هزری ئێستادا بەدەست بێنێت؟ لەبەر ئەوەی شتێکی قوڵ هەیە دووچاری دڵە راوکێمان دەکات بۆزانینی ئەو هۆکارە پاڵی بەرۆژنامەی (گاردیان)ەوەنا تاوەکو ئەم وتارە بۆ وتووێژکردن وەکو نموونەیەك بۆ راوبۆچوونی پێشکەوتنخوازانە لەنێو دەستەیەکی باش لە نێوخوێنەرانیدا، ئەوانەی کە بایەخ بەم مەسەلانە دەدەن، هەڵبژێرێت.

جگە لەوەش ئامارەی تریش زۆرن- بۆنموونە لەسەر لاپەڕەی( maixism today ‚new le ft review)، و بڵاوکراوەی ناودارتریش- وادەردەخەن کە هزرەکانی بۆدریار بەبەربلاوی بڵاوبوونەتەوەو بەجیددیش وەرگیراون( ئەگەر ئەڵێین پێڕەو دەکرێن) لەلایەن تیۆریست و نووسەریناسراوادا. بەکورتی، ئەو هزرڤانێکە بێگومان مافی ئەوەی هەیە لەسەری رابوەستێن تەنانەت ئەگەر- من دەمەوێ گریمان بکەم- ئەم پایە بەرزەی ئێستایو کاریگەریەکەی تەنها نیشانەیە لەسەر بڵاوبوونەوەی قەیرانێکی هزری کەتیایدا (پۆست مۆدێرنیستی زاراوەیەکی دەستنیشانکراوی بەسوودە.

سەرەکیترین ئاڵۆزی لەهزری بۆدریار لەو مەیلەیەتی بۆ یەکسانی کردن لەنێوان ئەوەی کە ئێستاو تەنها بەشێوەیەکی زۆر بەپەلە( لەرێگای بڕواکردنەوە دەشێت) و لەگەڵ ئەو سنوورانەی دەشێت لەسایەی هەڵوێستێکی رەخنەیی ئاڵودەیە بەدوای حەقیقەتدا. بێگومان ئەوەش لەگەڵ نموونەیەکی فراوانتر لە تیۆرەکانی مەعریفەی پراگماتی پشت ئەستوور بە بیرۆکەی کۆڕا(اجماع) کۆکە، تیۆری دوا کە گریمانی ئەوە دەکات گوایە حەقیقەت لەهەر باروودۆخێکی بیندراودا بریتییە لەکۆمەڵێك بەهاو بەوبۆچوون لەنێو کۆمەڵگایەکی تەئویلگەرای دیاریکراودا روویداوەو بڵاوبۆتەوە، هزری لەم شێوەیە دەنگدانەوەیەکی باش لەنێوەندی فەلسەفەکارانی( دوای شیکار)ی وەکو ریتشارد رورتی و هەندێك لەرەخنەگرانی

ئەدەب ئەوانەی خاوەنی بیرو بۆچوونی هاوشێوەن وەکو(ستانلی فیش) و هەندێکی تر ئەوانەی گەرەکیانە رۆڵی فەلسەفە یان تیۆر کەمتر و سنووردارتر بکەن ئەوەش لەسایەی گریمانەکانیان گوایە مەرجی حەقیقەت لەنێو گوتاردا تەنها زێدەرۆییەکی بەتاڵەو چەمك و بونیادەکانی بریتین لەکۆمەڵێك خوازەی پاك وسافکراو یا میاتی میتافیزیکی بەسالاچووە، کەواتە پێویستە لەسەرمان ئەو کۆششە فەلسەفیەخوازراوو کلاسیکیە لەگەڵ ئەم پراکتیك کردنەی ئێستاشی لەبواری سۆسیۆلۆژیا، یاسابەندی یاسایی، رەخنەی ئەدەبی و سەرجەم زانستە مرۆڤایەتییەکانیش هەر بەلاوەی بنێین، جگە لەوەش پۆست بونیادگەری هەڵسا بەهاندانی بیرۆکەی ئەوەی کە کەتولر(واقیع) تەنها وتەنها دیاردەیەکی گوتاربێژیەو دەرەنجامی چەندین کۆدی جیاواز و یاسا و یاری زمانەوانین یان سیستەمی ئاماژەیی وان کە بەتەنها لەتوانایاندایە ئەوشێواز وریگایانەمان نیشان بدەن بۆ تەنویلکردنی ئەزموون لەروانگەی (فۆکۆ) بۆ رێرەوتی مەعریفە/هێزی پاڵپشتیکراو: هەروەها بەو مێژووگەراییە نوێیەی کەوا باس لەمێژوو دەکات وەکو ئەوەی مەیدانێکی ئەکتێڤکراو بێت بۆکۆمەڵی گوتاری ئایدیۆلۆژی ناکۆك و دژیەك، جگە لەبەهەڵە خوێندنەوەی کارەکانی دریداو گریمانەکردنی- بەشێوەیەکی-ئەرسیسی کەم وێنە- گوایە ئەو جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە هیچ شتێك ناکەوێتە دەرەوەی دەق- تۆ هەموو ئەو تیۆرە بەربڵاوانە بخەرە نێو یەك شت(لەگەڵ ئەوەی کە بە(خولانەوەی زمانەوانی) بانگەشە دەکرێت و گەیشتۆتە کۆمەڵێك کایەی مەعریفەی هاوشێوە).

ئەوکات لەوە دەگەیت کە بۆدریار توانی کۆمەڵێکی باش لەخوێنەران بۆخۆی کێش بکات و وایان لێبکات ئەم گریمانە زێدە رۆییانە بڵاوبکەنەوە، ئەوانەی کە دوور لەم سیاقەوە تەنها وتەنها دەبنە پەراوێزێکی بچووك لەنێو پێکهاتەی بونیادیانەی زۆر بڵێی ئەو رۆژانەمان.

بەهەرحاڵ ئەو هەقیقەتەی ناکرێ نکۆڵی لێ بکرێت ئەوەیە کە ئەم هزرانەی بایەخێکی جیدییان پێدەدرێت بەرادەیەك ئێستا بۆدریار لەتوانایدایە گریمانەکانی خۆی دەبارەی جەنگی کەنداو بەگشتی بکات بێئەوەی ترسی ئەوەی هەبێت دواتر ببێتە جادووکەرێك یان

وا ببینێت کە ئەم گریمانانە بەشێوەیەکی تۆخ و توند لەژێر ڕۆشنایی ڕووداوی نێو جیهانی حەقیقیدا دروستکراون. ئێستا دەتوانرێت بگوترێت بەڕادەیەکی زۆر پاساو هێنانەوەش- کەبۆدریار ئەو کەسایەتییە نییە نوێنەرایەتی ڕەوتێك بکات و هزر وبیر وبۆچوونەکانی بەشێوەیەکی زۆر دوور ڕۆیشتن بەشێوەیەك سانانییە کەس قبوڵیان بکات، کەواتە لەگەڵ ئەوەشدا ئەم هیچ وبووچیانە نابێت وا ڕەفتاری لەگەڵدا بکرێت وەکو ئەوەی سەرزەنشتکردنی سەرجەم موغامەرەی هزری ئێستایە. حەزیش ناکەم- بەهەرحاڵێك بێت- ئەم خاڵە ڕەتبکەمەوە،لەبەر ئەوەی کاتێکی زۆرم لەم ساڵانەی ڕابردوودا بەسەربردوو لەهەوڵ و کۆششی ئەوەدا بووم هێڵی ئاڵوزو فراوانی هزری دوای بونیادگەری لەیەکتر جیابکەمەوەمو هەڵیبوەشێنمەوەو ئەوە پیشان بدەم هەڵوەشاندنەوەگەرایی دریدایی(بۆنموونە) پارێزگاری لەترپەی تەواوی ڕەخنەی ڕۆشنگەری دەکات، ئەوە لەکاتێکدا ئەم تەقلیدە کەوتۆتە ژێر سەرلەنوێ پێداچوونەوەیەکی ڕادیکاڵیانە بەشێوەیەك سەرجەم سیستەم و چەمکە دامەزراوەکانی دەگرێتەوە. شیکارکردنێکی ووردی ئەم جیاوازیانە پێویست دەکات بەیەکەوە جەخت بکرێتە سەر مەسەلەی ئەخلاقی وئەپیستمۆلۆژی چونکە لەهەردوو سیاقدا ئەوا دریدا هەوڵیدەدا پرۆژەکەی خۆی لەم جۆرە هەڵوێستە یان ناعەقڵانیانە دوور بخاتەوە کە بەشتێکی ساکار دادەنرێت لەشێوازی بۆدریار- هەر یەك لەعەقڵ و حەقیقەت بەهای دارسەن وخشینی واقیعی (سەرووی واقیعی) هزری پۆست مۆدێرنیستی لەناوی بردن بەم شێوەیە مرۆڤ دەتوانێت زۆر برگە لە کارەکانی دریدا بهێنێتەوە کە بەشێوەیەکی بێگومان جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە هەڵوەشاندنەوە ئەو شتە نییە وەکو ئەوەی زۆرجار نەیارانی هەوڵیانداوە وێنای بکەن، گوایە گوتارێکە پێویستی بەدەلالەت و مەشروعیەت یان حەقیقەت نییە، هەڵوەشاندنەوە گەرایی زۆر بەتوندی قوتابخانەی ( هەموو شتێك دەشێت) ڕەتدەکاتەوە، ئەو قوتابخانەیەی سەر بەهێرمۆنتیکای هزری پۆست مۆدێنیستیە. هەڵوەشاندنەوەی هزری بڵاو وسادە سەبارەت بەچۆنیەتی پەیوەست بوونی زمان بە واقیع مانای ئەوە نییە کە گریمانی ئەوە بکەین گوایە زمان بۆشاییەکە لە(وازییەکی ئازاد) و کراوەی‌دەقەکان، یا دالی نفرۆ بووی خاڵی لەهەر ناوەڕۆکێکی دەلالی بێت، بەدەربڕینێکی

ئەخلاقی تر، ئەوەبەدحاڵی بوونێکی مەزنە کە تۆگریمانی ئەوە بکەیت گوایە هەڵوەشاندنەوە مەسەلەی بەرپرسیارێتی تەئویلی بەلاوە دەنێت وپشتگوێی دەخات یان دوای دەخات و پێیوایە کە دەق یان شتی سەر زارەکی- لەژێر رۆشنایی پێوەری تردا (نیازپاکی و رەچاوکردنی وردەکارییەکان..تاد) بەشێوەیەك رێگا نادات بگۆرێت بۆ تەنها یارییەکی جوان رێکخراو، یا شایەدبێت بۆ هەموو جۆرە زیادەرۆییەکی خوێنەر، بەپێچەوانەی ئەمەوە، ئەم هەڵوێستە لە(دانپیانان و رێزگرتن) دریدا لە نێو کتێبی( گراماتۆلۆژیا)دا وەکو پاڵپشتێك کەناکرێ دەستبەرداری بین باسی لێوە دەکات. ئەوە خاڵی دەسپێکی زۆر پێویستە بۆ هەر کردەیەکی تەئویلی کە ئاگاداری خۆیەتی تاوەکو(بەهەر رۆگەیەکدا حەز بکات، تەروات و رێگاش بەخۆی نەدات هەر شتێکی مەبەستیەتی بیڵێت) کاتێکیش (دریدا) بریار لەسەر ئەوە دەدات کە دیالۆگەکەی زیاتر ئاڵۆزتر بکات پێشنیاری ئەوە دەکات گەرانەوە بەرەو مەبەستگەرایی نووسەر بەردەوام کاری ئەوەی کردووە ، پارێزگاری لەخوێندنەوەی بکات ئەوەکو بیکاتەوە. بەم شێوەیە بەهەڵەدا دەچین ئەگەر ئەم وشانە وا تەئویل بکەین گوایە رەتکردنەوەی خاڵی بنەرەتییە چونکە یەکێك لەچاکەکانی نووسینەکانی دریدا- دەگەرێنەوەو خوێنەر دەگێرمەوە بۆ ئەو شتەی کە پێشتر دەربارەی ئەم بابەتە لەشوێنێکی تردا نووسیوومە- ئەوەیە کە ئەنگێزی بەرپرسیارێتی ئەخلاقی دەکات(هاوکات لەگەڵ پرسیارە ئەپیستمۆلۆژییەکان)دا کە لەگەڵ خۆپەیوەستکردنی راستەوخۆ بەگوتەی دەلالەت و نیاز وەسەلاتی دەق وخوێندنەوەی راست و هەڵە نەکردنی نووسەر و زۆری تر ژێرخاك نران. ئەوەی نەیاران نەیانتوانی دەسگیری بکەن ئەوەیەکە دریدا کاتێك پشت بەم پێوەرانە دەبەستێت- پارێزگارییان لێدەکات بەو زمانەپاراوە مەزنەی خۆی گوایە ئەوانە (پاڵپشتن و ناکرێت پشتیان تێبکرێت)- لەکاتێکدا ئەوەش دەردەخات کە ئەوانە ناتوانن (بگرە دەبێت نەتوانن) کۆت و پێوەند بخەنە سەر پراکسیسکرنی هزریی رەخنەیی. ئەوەش بەرەوە ئەوەمان دەبات کە جەخت لەسەر ئەوە بکەینەوە(دریدا) ناکەوێتە نێو داوی ئەو رەوتەی گوتاری پۆست مۆدێرنیستی کە کۆتایی سیستەمی واقیع و حەقیقەت و زەینییەتی رۆشنگەری رادەگەیەنێت ئەم خاڵەش زیاتر روونترکرایەوە کاتێك (دریدا) وەڵامی رەخنەگری

وەکو(هابرماس و سیل)ی دایەوە، ئەوانە گریمانی ئەوەیان کردبوو- ئەگەر چی زۆر کەم شارەزاییان لەکارەکانیدا هەبوو- هەڵوەشاندنەوە تەنها وتەنها فرە جۆریەکی دەق ئامێزە دەربارەی بابەتی دووبارەکراوو ئاڵۆز بەلام لەدەرەوەی قوتابخانەکەدا.

پێموایە دریدا ئەم دیالۆگەی خۆی بەپشت بەستن بەهێزی بیرکردنەوەی خۆی وتێبینی کردنی وردی ئەم پنتە کوێرانەی نێو گوتاری نەیارەکانی هەڵسوراند، ئەوە جگە لەچالاکیو توانای لەرادەبەدەری بۆ گێرانەوەی تۆمەتەکان بەسەر خاوەنەکانیان ئەوەش لەسایەی توانایەکیسەرسورهێنەر کەسەرجەم دیالۆگەکانی دادەپۆشێت، بەهەرحاڵ زۆر ئەستەمە نەیارانی-بگرە خوێندکارە تێ ئالاوەکانیش- وا رەفتار لەگەڵ هەڵوەشاندنەوە بکەن گوایە تەنها لقێکە لەرەوتی نێستای هزری پۆست مۆدێرنیستی یان هزری نەیار بە رۆشنگەری، بەم جۆرە مرۆڤ دەبێت دان بەوە دابنێت کە هەندێك کەس بەم شێوەیە لەهەڵوەشاندنەوە گەیشتوون، ئەو کسانەی کاتیان نییە و ئارەزووی شیکارکردنی دەق وررووبەرووکردنەوەیان نییە، یان بەشێوەیەکی وا بیخوێننەوە کەمەرجەعییەتی فەلسەفی ئاڵۆز وسیستەمی شاردراوەکان وشێوازە تایبەتیەکانی شیکارکردن..تاد لەبەرچاو بگرنو رەچاوی بکەن.

هۆکارێکی تریش هەیە بۆ ئەم بەدحاڵی بوونە سەرچاوەکەشی لەوەدایە کە ئەم دەقانەبەسەرگەرمییەکی زۆرەوە لەلایەن کۆمەڵگایەکی تەئویلگەرایی جیاوازدا هەڵقۆزرایەوە-تیۆریستە ئەدەبیە ئەمریکی وبەریتانییەکان- بەشێوەیەکی وا پشت پێ بەستراو پراکتیك کرا کە لەپاڵنەر و پێشینەیی زۆر جیاوازەوە سەرچاوە دەگرن. ئەوەش تەنها بەسادەیی-نموونەیەکیزەقی دیار نییە لەسەر میکانیزمو شیواندنی ئاسایی. بەڵکو جۆرێکە لەبەدحاڵی بوونی بەکۆمەڵ یا بەهەڵەدا بردنی شارەزایانە کە ئەوکاتە روودەدات کە پرۆژەیەکی دیاریکراو یا چالاکیەکی هزری وەردەگێردرێتە سەر زمانێکی تر، ئەو زمانەش تەنها ئامانجە تایبەتیەکانی خۆی رەچاو دەکات، لەواقیعدا (دریدا) ئەوەی رەتکردۆتەوە کە پراکسیس کردنی ئەو بۆ هەڵوەشاندنەوە دەبێت وەکو پێوەرێك وەربگیرێتو تێی بڕواندرێتو بە شوێنی دابچێ یا دەبێت وا بڕوانرێتە شێوەکانی هەمان موغامەرەی یەکەم- وەکو ئەوەی بۆنموونە لە تیۆری ئەدەبی ئەمریکیدا یا نموونەی ئێستای (لاهوتیەتی

هەڵوەشاندنەوەگەرایی) وەکو ئەوەی بەرجەستەکراوی لادەر، یان مشەخۆر بێت وپشت بە خراپ لێکنزیکیەکی مەزنی دەقەکان ببەستێت. بەڵام ئەوەش ڕێگای ئەوەی لێنەگرت کە هەڵوێستێکی توونـد لـە دژایـەتی کردنەکە وەربگرێـت، لەوەشـدا مـافی خۆیـەتی کـاتێك ئەیارەکانی وەکو(سێرل وهابرماس) پـەنایان بـردە بـەر کۆمـەڵێك تـەعمیماتی سـاختەی هەڵوەشاندنەوە لە بری ئەوەی پەنا ببەنە بەر خودی هەزری خۆیو لەسەر ئاستی دیالۆگی فەلسەفیدا کاری لەگەڵدا بکەن. ئەوانیش کاتێك وادەکەن پشت بەو بۆچونە بڵاوە دەبەستن کە ڕەخنەگرانی ئەدەب بەتەنها تەکریسیان نەکردووە، بەڵکو فەلسەفەکارانی دوای شیکارییش لـە نمونـەی وەکو( ریچـارد رورتـی) گوایـە هەڵوەشـاندنەوە ئـەوەندەی دابـڕان لەگـەڵ بـەها سـەرابیە کۆنـەکانی حەقیقەت وعەقڵ وزەینیـەتی گومانکـاری ڕۆشـنگەری دروسـت بکـات، ئەوەندە بایەخدارتر دەبێت. بۆیە هەریەك لە (رۆرتی و سیرل) لـە کاتی خوێندنـەوەی دریدادا لەسـەر ئـەوە کۆك و تـەبان گوایـە ئـەو سۆفیستێکی دواترەو گوتار بێژێکی بەتوانایـەو تاکـە بەهرەی ئەوەیە کە دەتوانێت خاڵ لە دژی تەقلیدی ڕەسمی هەزری بونیادنەر تۆماربکات، کە هەوڵدەدات کێشەکان چارەسەر بکـات.خـاڵی جیـاوازی نێوانیـان ئەوەیـە (سێرل) پێیوایـە هەڵوەشاندنەوە هەڵوێستێکی لادەرەو دوورە لە ڕاستی، لە کاتێکدا(رۆرتی) هاوکات لەگەڵ بۆچونە پراگماتیکیەکانیدا–پێیوایە پێشوەچونێکی باشە، ئاماژەیـە بۆ ئـەوەی فەلسـەفە لـە کۆتاییدا دەسبەرداری ئەو خۆبەزلزانینـەی خۆی بوو بەوەی ڕۆڵێکی ئاسایی لـە دیـالۆگی کەلتوری ڕەگەزی مرۆڤایەتیدا بگێڕێت.

پێم وایە ئەمە لەبەدبەختییە– بەتایبەتیش لەژێر ڕۆشنایی ئەو ڕاگەیاندنـە دواییانـەی بۆدریاردا– کە دریدا نایەتە دەنگ و بەتوندی بەرپـەرچی ئەم گرەوکردنـە لەسـەر هـەڵچوونی پۆست مۆدێرنیستی نوێدا ناداتـەوە، ئـەوە هـەوڵ وکۆششـە بۆتێوەگلانـی هەڵوەشـاندنەوە بـەرەوتی تـەواو (ڕێژەگـەرایی) چونکـە کاریگـەری هزرێکـی ئـاوا بەتایبـەتیش ئەوکاتـەی هاوشانی ئەو باڵابونەی ئێستای تیۆری ئەدەبی وەکو گوتارێکی (پێوەرخوان) دەبێـت گوایـە دەتوانێـت کایـەی مـەعریفی تـر دامـەزرێنێت، ئـەوە زیـاتر هـاندانی ئـەو بیرۆکەیەیـە کـە پێیوایە(واقیع) دەبێت بەهەمەکی لەسایەی زمانەوە یان لەسایەی ئەسـەقی لـەم جۆرە یانەو

جۆرە لەپراکسیسکردنی ئاماژەکاریانەی(شوێنگەییدا) بخوێندرێتەوەو هیچ ڕێگایەکیش بەرەو حەقیقەت یا مەسەلەی بەبەڵگەکردنی مێژوویی نییە تەنها لەسایەی هەمان شێوەی نواندنی ئەم گوتارەوە نەبێت، کەواتە، وەکو ئەوەی بۆدریار بەنەشوەوە وەکو دەرەنجامێك پێیدەگات- ئەوەیە کە ئێمە لەنێو فەلەکێك لەیاری زمانەوانیدا نیشتەجێین(یان وێنەی بەیاناتی رووپۆشکراو) کە بەئازادی و بەبێ بەندەر دەسورێنەوە، بەشێوەیەك رەوانبێژی دەچێتەوە نێو ئەشکەوتەکەی خۆی‌و هیچ شتێکیش سوودمەندنییە لەکاتی رەفتارکردن لەگەڵ دەزگاکانی راگەیاندن یا ئامێری زانیارییە حکومییەکان و ئەو شتانەی گەرەکیانە وامان لێبکەن بڕوایان پێبکەین.

کێشەی سەرەکی لێرەدا ئەوەیە کە ئەو هۆکارانەی ڕێگا لەمرۆڤ دەگرن رایەکی بەم شێوەیە دەربارەی هەڵوەشاندنەوە قبوڵ نەکات هۆکاری وان پەیوەندییان تەنها بەمەعریفەی وردو زۆری کارەکانی دریداوە نییە، بەڵکو پێویستی بەشارەزا بوونیش هەیە لەهەندێك مەسەلەی سێنتەری دەربارەی ئەو مەسەلانەی دەچنە نێو خانەی ئەپیستمولۆژیا و فەلسەفەی زمان و سیمۆتیکای مەرجدار بەمەعریفەی حەقیقەت..تاد، مەسەلەی وا کە بەدەگمەن فێرخوازانی ئەدەب بایەخی پێدەدەن، یا لەواقیعدا لەنێو نێوەندی تیۆرگەرایی ئەدەبیشدا کەم بایەخی پێدەدرێت، ئالێرەوە بەم سانایییە سەر سورهێنەرەی کەلەسایەیەوە دەقەکانی (دریدا) پەیوەستی رەوتی پراگماتیکی پۆست مۆدێرنیستی کرا، ئەو رەوتەی هەر زوو بەزوو دروشمەکانی کاتێك دەخرێنە ژێر لێکۆڵینەوەو پشکنینی شیکاریانە وەکو ئەوەی خودی (دریدا) بەسەرنووسینی فەلسەفەکاران لەئەفلاتوونەوە تاوەکو هیگل و هۆسرل‌و ئۆستنی‌ی دەکات، هەر زووبەزوو دەبن بەدروشم و قسەی پڕوپووچ. نموونەیەکی ئەم دروشمانە- جگە لەوانەی تازە باسمانکرد- دەشێت ئەم پێکهاتەو هەڵبژاردنانەی خوارەوە لەخۆی بگرێت:

هەموو خوێندنەوەیەك خراپ خوێندنەوەیە، هەموو تەئویلێك تەئویلی بەهەڵەدا چووە..تاد،(تیۆر) هەوڵ و کۆششێکی کوێرانەو بێدەرەنجامە،لەبەر ئەوەی هیچ زێدەیەکی جیاکاریانە بۆداب و نەریت و بیر وباوەڕی هزری چەسپاو لەلای ئێمەدا پێشکەش

ناکات. چەمکەکان تەنهاو تەنها خوازەی ڕێکخراو وچاککراون، ئامـاژەی ڕەوانبێژیـن و ئاشکراکردنی ناوەڕۆکەکانیان تەنهاو تەنها بەرەوگومان کردن لەسەرجەم موغامەرەکانی بیری عەقڵانی خۆرئاوامان دەبات (سێنترالیزمی لۆگۆسی)-لەکۆتایشدا- ئەوەندەسکەوتەی کە تیۆریستە ئەدەبیەکان بەدەستیانهێنا- پێویستە لەژێر رۆشنایی هەموو ئەوانەی باسمانکرد، بنەماکانی ئەم یارییە(پۆست مۆدێرنیستیە)بزانین.

مادام هەریەك لەحەقیقەت و واقیع ئێستا هەڵوەشێنرانەوە بەرادەیەك کە پێویستەهەر لقێکی مەعریفەی تر دان بەوەدابنێت کەدووچاری (قەیرانێکی ) دەقگەرایی بۆتەوەو لێشی دەرباز نابێت، مرۆڤ دەتوانێت ئەم گریمانانە هەریەك بەتەنیا وەربگرێت و ساختەییەکەی یان پێداویستی بۆ توند و تۆڵی و هێز-ئەوکاتەی بەهەندێك لەبڕگە گونجاوەکانی تیۆرەکانی (دریدا)بەراورد دەکرێن- پیشان بدات و بیخاتەروو.

بەڵام ئەوەش بەجۆرێك پێویستی بەخوێندنەوەی رەخنەیی هەیە کە پەیوەست بەزانینی ئەو پێشوەچوونانە بێت لەدەرەوەی بازنەی سیحرلێکراوی دیالۆگی دوای بونیادگەریدا روو دەدەن. هەیە کە بەدەگمەن خاوەنی تیۆرە ئەدەبییەکان هەوڵ دەدەن بیخەنەروو. ئەوەبووە هۆی سەرهەڵدانی حاڵەتێك تاوەکو لەسایەیەوە هزرڤانی وەکو(بۆدریار)- لەگەڵ هەندێکی تر لەنێو دیمەنی ئێستادا- گرەو لەسەر بەدەستهێنانی وەڵامدانەوەی فراوانتری (ڕێژە)ی خوێنەران بکەن دەربارەی ئەو هەزەی پڕاوپڕە لەئانۆزیکیەت، ئەگەر ئەم گۆڕانە لە پێوەرەکانی دیالۆگی هزری رۆشنگەریدا رووی نەدابا ئەستەم بوو ئەوانەش سەرکەوتووبان. لەوەش خراپتر ئەو گریمانە ناماقوڵەیە کە لەلای زۆر لەهزرڤانە پێشکەوتوو خوازەکانی نێو کایەی زانستە مرۆڤایەتییەکاندا ئەمڕۆکە رەگ وریشەی داکوتاوەو سەرچاوە دەگرێت، گوایە دەشێت هەموو دەقێك لەنێو خۆیدا پنتی سەردی یاحیکایەتێکی دیاریکراو لەناوەخۆیدا هەڵبگرێت، ئەوەش بووە هۆی بەئەستەم کردنی گشتی لەیەکترجیاکردنەوەی نووسینی واقیعی، مێژوویی یاسەردی، لەلایەك ولەنێوان دەقی خەیاڵی یاخەیاڵکراو لەلایەکی دیکەوە کەتوخمی موحاکات لەخۆیەوە دەگرێت.

[illegible]

مێژووگەرایی یا پراگماتیکی نوێ دوای بونیادگەریدا دەردەکەوێت، وەکو ئەوەی بەنێو سەیرورەتی نیچەییانەی(فۆکۆ)شدا دەربارەی دوولایەنی هێز/مەعریفەدا دەرکەوت، یا وەکو ئەوەی لەنێو لەیەکتر نزیکردنەوەکانی( هیدین وایت)دا دەربارەی گوتاری مێژوویدا دەرکەوت لەژێر دروشمی خوازەی بەگشتی کراودا- یاتوێژینەوەی نموونەی گرنی سەردی- کەمەسەلەی راستگۆیی واقیعی یاراستبێژی بەلاوە دەنێت. ئەوی ئەو بیریارانە لەناو یەک سیاقدا سەرەرای جیاوازی راوبۆچوونیان رێک دەخات بیرۆکەی ئەوەیە کە هەرکایەیەک لەکایە مەعریفیەکاندا دەبێت لەروانگەی پێوەری دەقگەراییدا لێی بکۆڵدرێتەوە- ئەوەش واتا رەتکردنەوەی ئەنتۆلۆژیە واقیعیە(سادەکان)- کە مۆری سەر تیۆرە ئەدەبیە توێژەییەکان بووە لەماوەی ئەم سی ساڵەی دوایی.

ئەنجامەکەشی وەکو ئەوەی(تۆنی بنیت) تێبینی دەکات،سەرلەنوێ پێناسەکردنەوەی (مێژوو)بوو بەڵام لەسایەی مەرجی دەقگەرایی و دانانی ئەم مێژووە وەکو کایەیەک بۆکرداری تەواو گوتارییانە. بەڵکو بگرە دەلالەتێکی چەمکەرایی ئێمە تەنها لەسایەی کردنەوەوهەڵوەشاندنەوەی کۆدە ئەدەبیەکاندا یا سەر لەنوێ دۆزینەوەی سەردیدا. هەست بەناوەرۆکەکەی دەکەین (چونکە ئەو لەبنەرەتدا بەنەبستراکت کراوی مێژوویە.)

(بنیت) دەنووسێت:"بیری دوای بونیادگەریی کاریگەرییەکی زۆر کەمی لەسەر ئەم مەرجانە هەبوو کە لەسایەیانەوە دیالۆگە مێژووییەکان ئەنجام دەدران. چاوەروانیش ناکرێت ئەم بیرە چالاکیەکی لەم جۆرە پراکسیس بکات چونکە چەمکی ئەو بۆ مێژوو لەبنەرەتدا بەلایەنی ئەدەبیدا دەشکێتەوە. ئەو توخمەکانی دەقی ئەدەبی بەرەو رابردوو دەگێرێتەوە.- لەژێر رۆشنایی ئەوەشدا وەکو دەقێک خۆی دەردەخات کە ناکرێت رۆبچینە ناوی یان بیخوێنینەوە لەگەڵ ئەوەی بەخۆی بەردەوام بێکۆتا خۆی دەنووسێتەوە-بیری دوای بونیادگەری نەیتوانی هیچ مەعریفەیەکی پۆزەتیڤ دەربارەی ئەو رابردووە پێشکەش بکات کە لەتوانایدایە ببێتە سەر رووە کارتێکەرەکانی خۆی بسەپێنێتە نێو ئەم ئیجرائاتە میتۆدییانەی ئەکادیمیەتە مێژووییەکان لەبری ئەوەش مێژوو بوو بە بۆنەیەک

بۆفراوانترکردنی ئاسـۆی پراکتیککردنـی ئـەم شـێوازە ئەدەبیانـەی لەخوێندنـەوەدا بـەکار دەهێنرێن، لەهەمان کاتیشدا وا دەڕوانرێتـە رابردوو- دوای ئـەوەی وەکو بابەتێکی ئـەدەبی دارێژرایەوە- گوایە مەیدانێکی بێ رێکخەری یاریکردنی زمانەوانییە.

دەمـەوێت کـەمێك لـێرەوە زۆر بـەروونی و بـەجوانی لەبـەردەم ئـەم بڕگـەیـەدا بووەسـتم. بەتایبـەتیش ئـەوەی پەیوەسـتە بـە بیرۆکـەی(بنیـت) دەربـارەی ئـەوەی چـۆن بـیری دوای بونیادگەری کاریگەریەکی زۆرکەمی لەسەر ئەم دیالۆگە مێژوویـەی ئێستادا هەبووە، چونکە لەواقیعدا ئامارەی واهـەن دەلالـەتن- وەکو ئەوەی لەشوێنێکی تریشدا ئامارەم بۆکردووە- لەسـەر ئـەوەی کەوانـەم هەڵوێسـتانە دەنگدانـەوەیان لـەنێو نێوەنـدی قوتابخانـەی تـازە لـەدایکبووی مێـژوو، نووسـەر بایۆلۆژیسـتە راسـتڕەوەکاندا هـەبووە، ئەوانـەی پێشـوازییان لەبیرۆکەی ئەوەکرد گوایـە رووداوەکـانی‌رابردوو نـاکرێت راڤـەبکرێن تەنها بەپشـت بەسـتن نەبێت بەو بەها باوانەی ئەمرۆکە لە سەری کۆك و تەبان، یا ئەو هزرانەی کە بایەخی خۆیـان لەسایەی ئەوشتانەوە بەشێوەیەکی بەپەلە وەردەگرن. ئەوشتانەی (لەرێگای بیروبۆچوونـەوە دەشێت).

## بنەماکانی دەقگەرایی

هیـوادارم زۆر لەوخوێندنەوانـەی بایـەخ بـە(تیـۆر)دەدەن هاوشـان و هاوبەشـم بـن لـەم پەرچـەکردارەم لەئاسـت وتارەبڵاوکراوەکـەی(بۆدریـار) لـە(گاردیـان)دا: وتـارێك لـەناوەوە گەیشتە لوتکەی ریسواکردنێکی توند وئاشکرای بیری پۆست مۆدێرنیستی، تـاوەکو ئـەم خاڵـەش دەکرا ئـەم هـزر و بیرانـە تەنها وەکو نیشانەیەك سـەیربکەین کـە دەشێت دووچـاری خـەمۆکیمان بکـات- ئەگـەرچی ئازاریشـمان نـادات- بـۆ ئـەو شـێوازەی کـەتیایدا تیۆرەکـە دووچـاری لادانکرایـەوە: بەتایبـەتیش ئەرکاتـەی لەلایـەن نووسـەری وا نیسـتیفلالدەکرێت کەناوداریتی دەورەی داون و خـاوەنی مـەیلێکیوان کەچاو پێداخشاندنەوەی نەیارانیان بـۆ نووسـینەکانی خۆیـان رەچـاو ناکـەن و بـەلاوەی دەنێـن.بەهـەرحاڵ جێگـای دڵـەراوکێ نییـە

بەلایەنی کەم لەدەرەوەی نێوەندی تایبەتمەند بەرەخنەی هزری-کە ئەم بیرانە وا پراکتیك بکرێت(وەکو ئەوەی لەنێو زۆربەی هەرە زۆری نووسینەکانی پێشوتری بۆدریاردا هاتووە) لەسەر رێکلامی تەلەفزیۆنی یا دیالۆگی تەلەفزیۆنی لەنێو پرۆگرامەکانی کات بەسەربردنی نێو تەلەفزیۆن و زۆریتر، ئەوانەش توخمی وان خودی سروشت(بان واقیعی) خۆیان لێك نزیك کردنی شیکاری لەم جۆرە کێشدەکات. لەراستیدا واراستە بڵێین (بۆدریار) لەباشترین حاڵەتدا تێبینی کارێکی چاو تیژو هەستێکی هەستیاری هەیە بۆ بەدیکردنی ئەو شتە پروپووچانەی لەم سەردەمەدا بڵاوبوونەتەوە. بەڵام نزیککارییەکانی هەمان مایەپووچی و پروپووچی لەخۆ دەگرن کاتێك لەسنووری ئەم وەسف کردنە بەرچاوو دیاریکراوە تێپەڕدەکەن. ئەوکاتەی بانگەشەی ئەوەدەکات کە ئێمە گەیشتوینەتە قۆناغێکی موزمن لەبێ توانایی لەجیاکردنەوەی مەسەلەی حەقیقەت و ساختەکاری و ئەوەی کە جیاوازییە ئەنتۆلۆژییەکان ئێستا لەقۆناغی نواندنی ساختەی شێوازەکانی راگەیاندنی سەپاودا کە بایەخی پێشوتریان نەماوە، بەشێوەیەك ئێمە ئەمرۆ داوامان لێدەکرێت هەر دیالۆگێك دەربارەی مەسەلەی وەکو (واقیع)یا(حەقیقەت) لەیاد بکەین، بەم شێوەیەش وامانلێ بکرێین تاوەکو بتوانین لەجیهانی پۆست مۆدێرنیستیدا گوزەران بکەین، ئەو جیهانەی تیایدا یاری زمان و دال بێ مەدلوول و ئەو وەهمانەی بڵاون کەناکرێت وەکو وەهم جیابکرێنەوە، لەبارێکی ئاوادا، وادیارە رووداوێکی وەکو جەنگی کەنداو دەبێت وا تێی بڕواندرێت وەکو ئەوەی گوایە فانتازیایەکە دەزگاگشتیەکانی راگەیاندن بەرهەمیان هێناوە، دەرەنجامی تەکنیکاری جیاوازە کە بەشداری لە دروستکردنی وەهمی دیالۆگی جەماوەرییانەی وشیار دەکات لەکاتێکدا کە ئەم دیالۆگە دەخاتە دەرەوەی چوارچێوەی بەدیهێنانی ئەم ئاواتە.

تەنها لەیەك حاڵەتدا بێگومان (بۆدریار) لەسەر هەقە:بە وردیش ئەوکاتەی گریمانی ئەوە دەکات گوایە رای گشتی (یان ئەوشتەی دەشێت بەم ناوە ناوی بەرین)دەکرێت لەرێڕەوی خۆی لابدات بەرادەیەك لەگەڵ ئەو لادانەیدا هەموو پەیوەندییەکی بەمەسەلەو رووداوەکانی جیهانی حەقیقیدا دەپچڕێت.مادام ئێمەش بەتەواوی پشت بەبەڵگەی(دەقگەرایی) دەبەستین- داپۆشینی تەلەفزیۆنی و راپۆرتی رۆژنامەگەری- ئەوە ئەستەمە لەدەست ئەم

دەرنجامە گاڵتەجارییەی رابکەین گوایە کەس ناتوانێت لەدەرەوەی چوار چێوەی ئەم شتانەی لەلایەن دەزگای رەسمی چاودێرییەوە ئەو بەهەڵە دابردنەی راگەیاندنی کە حکومەت رێی دەخات، کەس ناتوانێت بانگەشەی مەعریفە بکات، ئێمە لەلایەکەوە لەسایەی رێژنەیەکی بێکۆتایی لەوێنە و ئامارو راپۆرتی (هێڵی پێشەوە) و راپۆرتی رۆژانەی پینتاگۆن و زۆری ترەوە، باران رێژ دەکرێن، هەموشیان بەشدارین لەدروست کردنی وەهمی ئەوەی کەوا ئەم جەنگە یەکەم جەنگی لەم جۆرەیە لەمێژوودا بەم شێوەیە لەوردەکاری (زیندوو) دادەپۆشێت و بۆ کۆمەڵگایەکی فراوان لەخوێنەران و گوێگران و بینەراندا لە سەرجەم ناوچەکانی جیهاندا پەخش دەکرێت، بۆ ئەو کەسانەی کە تارادەیەکی زۆر شارەزاییان هەیە. لەلایەکی دیکەشەوە، وای لێ هاتووە بەشێوەیەکی رونتر و مەزنتر- بەلایەنی کەم بۆ ئەوکەسەی بەڵگەکان روون دەکاتەوەو بەراوردیان دەکات- کە ئەم باران رێژکردنە توندەی داپۆشینی راگەیاندن بۆ ئەوە داناوە تاوەکو هەستە مەعریفییەکان و وەڵامدانەوەی ئێمە پەریکاتەوە،تاوەکو دەگاتە خاڵێك کە لەگەڵیدا ئەستەمە وێنای هێڵی جیاکەرەوەی نێوان حەقیقەت و خەیاڵ بکەین( یا بەقسەی بۆدریار، لەنێوان واقیعی و بان واقیعی). بەڵام ئالێرەشەوە بۆدریار دەگاتە دەرنجامە بێهودەکەی- ئەویش لەژێر رۆشنایی زاراوەکانیدا مەسەلەیەکی زۆر ماقوڵە- وبانگەشەی ئەوە دەکات گوایە زۆر بەسادەییەوە ئێمە ناتوانین ئەوە بزانین ئایا ئەم جەنگە لەواقیعدا روویداوە،بەبەراورد لەگەڵ ئەم وێنە خەیاڵیکراوانە دەربارەی جەنگ کە بەرلەجەنگ بڵاوکراونەتەوەو دواتریش وەکو تاکە سەرچاوەی زانیاری و هەواڵ بەردەوام بوو.

ئا ئەوەیە(کەلێنی-کەنداوی-واقیع) کە لەنێوان ئەلتەرناتیڤە فانتازییە پۆست مۆدێرنەکەیدا کراوەیەوە. ئێستا شتێکی نالۆژیکیە ئەگەر لە نێو سیاقی وا بیربکەینەوە کە سروش دەرە بەوەی گوایە دەبێت بەردەوام حەقیقەتێك لەدواوەی دیاردەکانەوە خۆی حەشاربدات و شێوازی دیاریکراو بۆ دەستنیشانکردنی جیاوازی لەنێوان ئەوەی پێمان دەگات و ئێمەش بڕوای پێدەکەین لەسایەی راپۆرتە هەواڵ و بەیاناتی حکومەت و ژمارەی رەسمی پێکراوەکان و..تاد، و لەنێوان ئەوەی کە مەسەلەکان لەسەریەوە کۆتاییان دێت دوای

ئــەوەی هــەموو بەڵگــە حاشــا هەڵنــەگرەکان دەکەونــە بەردەســت.بەتــەواوی لــەدژی ئەوەشدا(بۆدریار) دەڵێت:" ئەگەر شتێك هەبێت ئێمە لەم جەنگەدا(یان ئەو نمایشە سەرووی واقیعەی جەنگ) دەرسی لێوەربگرین، ئەوە بێهوودەیی ئەو پرانسیپە پراگماتیکیە میانەیە وەکو (حەقیقەت لەدوای لێکۆڵینەوەوە دەستەبەر دەکرێت)، کەواتە ئێمە پێویستە لەگەڵ بارودۆخێکی نوێدا بگونجێین چونکە هیچ شتێك نییە-بۆنموونە وەکو گەڕانەوە بۆ حەقیقەتی مێژوویی یا وەقائیعی ئیجرائی مەسەلەکە- ڕەوایی بەکارهێنانی زاراوەی وەکو(پروپاگەندە) و (فێرکردنی باوەڕ) و(لایەنگیری دەزگاکانی ڕاگەیاندن) و زۆر وشەیتر مسۆگەر بکات کەتائێستا ئێمە لەسەرهەمان ئاستی کۆنی جیاوازییە ئەنتۆلۆژییەکان یان مەعریفییەکاندا مامەڵەیان لەگەڵدا دەکەین و زەمەنیان بەسەرچووە.

سەرسوڕهێنەر نییە گەر تێزەکانی (بۆدریار) ئەم پێشوازییەی لەنێو نێوەندی خوێنەرانی ئەمریکادا لێبکرێت تەنانەت ئەو کاتەش کەیەك ژەم حەقیقەتی ئاسایی تایبەت بەکەلتووری خۆیانیانیش پێشکەش بکات، هزرێو بیرۆکەی وەکو ئەوەی ئەمریکا کێڵگەیەکە بۆ ئاودانی بێسنووری ئارەزووە ئەلتەرناتیڤەکان، ئاسۆیەکە بۆ ڕووی بێقوڵایی و ئاخ، دیاردەیەکی ژیاری بان واقیعیەو بەردەوام خودی خۆی کۆپی دەکاتەوە بەشێوەیەك هەموو سنوورەکانی تێگەیشتنی عەقڵانی تێپەڕدەکات.

زۆرجار ئەم گوتانە وەکو باڵاترین جۆری (ستایش) سەیرکراوە کە دەشێت ڕەمزێکی هزری دیاریکراو لەسیمبوڵەکانی پۆست مۆدێرنیستی پێشەکەشی بکاتو دەبینێت کە بەشێوەیەکی بەرچاوو ئاشکرا بەبەڵگەی ئامادەکراوو بەدەست پاڵپشتی لێدەکرێت. ئەگەر بەڵگەکانیش پێویستیان بەپاڵپشتی بەهێز تر هەبێت ئەوە کاردانەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەسەر ململانێ لەکەنداودا بەکۆمەڵێکی زۆر لەپاڵپشتی بەڵگەیی و ئەرشیفی و سۆسیۆلۆژیا( یان دەروونی پاتالۆژی)یەوە پاڵپشتی لێدەکات. (جۆدیس ویلیامز) ئەم تریەیە لەوتارێکیدا دەسگیردەکات کە لەهەفتەی سێیەمی جەنگدا بۆ ڕۆژنامەی(گاردیان)ی ڕەوانەکردبوو:( ئەوەی ناواقیعیە لەهەر شوێنێك لەدەرەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا لەنێو چاوی هاوڵاتیاندا ، ئەوەیەکە دەبێت هەموو مرۆڤێکی ئامۆ

بترسێنێت. وەکو منداڵیش دواتر دەبێت فێری ئەوە بکرێت کە سینتەری تری خود هەن لەدەرەوەی خودی خۆیدا ، ئەو کەلتوورە وەکو دانەوێڵەیەك بۆخەون ودێوەزمەکانی خۆی دەروانێتە ئەوانی تر.. دڵەراوکێی زۆر لەترسەکانی منداڵی ئەمریکی( دایە، سەدام دەمکوژێت؟!) وەکو شتێکی نابەجێ دێتە بەرچاو ئەو کاتەی ئێمە ئەوە دەزانین کە لەم چرکەیەدا بۆمبا ئەمریکیەکان منداڵە عێراقییەکان بۆمباران دەکەن ودەکوژن لەبەر ئەوەنا کە ئەمریکیەکان هەست ناکەن( تەنها خوا دەزانێت کەوانێ) بەڵکو لەلایەن زۆربەیانەوە ئەوە وڵات و گەلانی تر ناشێت واخەیاڵ بکرێن گوایە حەقیقەتن. ئەگەر کۆمپانیای(ماتل) هەڵسێت بەئامادەکردنی یاریەکی منداڵانە بەدووچاوی کەروێشك و ناوی نا منداڵی عێراقی ئەوکاتە دەشێت سۆزیەلای خۆیەوە کێش بکات، ئەوە لەکاتێکدا هەواڵەکان رەوە چۆڵەکەیەك پێشکەش دەکەن کە بە(گڕی نەوتی سەدام) مەوە بوون، بەشێوەیەکی وا دراماتیکی نمایشمان دەکات زیاتر لەوەی مرۆڤە قوربانیەکانی بۆمباران کردنی ئێمە نمایش بکات.)

رەنگە (ویلیا مسۆن) ئەو راپۆرتەی خۆی لەرێگای فاکسەوە رەوانەکردبێت بەرلەوەی یەکێك بێت پەردە لەسەر مەسەلەکە لابدات– یا ئەوەتا بەرێکەوت– بگاتە ئەو دەرەنجامەی کە ناشێت ئەم چۆڵەکانە قوربانی (گڕی نەوتی سەدام) بن لەبەر ئەوەی ئەم نەوتە رژاوەی سەر دەریا لەدووری چەندین میلەوە بوو.ئەم چۆڵەکانە بەشێوەیەکی وا وێنەیان گیرابوو کە لەهەوڵ و کۆششی زۆردابوون بۆئەوەی خۆیان دەربازبکەن وبگەنە سەر وشکانی، بێگومان ئێمەناتوانین ئەوە بزانین، وەکو ئەوەی رووبەڕوو (بۆدریار) ئاماژەی بۆدەکات، کە راڤەکردنی (ئەلتەرناتیڤ)ی تریش هەن رەنگە بەراستی وەسفی رووداوەکە بکەن و رژانی ئەو نەوتەی کە باسمانکرد– ئەوەش گریمانێکە زیاتر رێی تێدەچێت– بەهۆی بۆردوومانکردنی ئەمریکی بوو بۆ پێگاکانی سەرلێوار دەریا. بەڵام ئەم نمونەیە تەنها یەك نمونەیە لەسەر ئەم هەموو دژکارییە.

ئەم هەموو بەیاناتە دژکارە، هەواڵی دروستکراو، درۆی روون وئاشکرا کە رووبەڕوو لەهەفتەکانی یەکەمدا کەوتنەروو لەو شاڵاوە پڕوپاگەندەیەی هاوپەیمانان، لەگەڵ ئەوەشدا وەکو ئەوەی (ویلیامسۆن) لەوتارەکەیدا ئاماژەی بۆدەکات، دۆزینەوەی لەم بابەتە رۆڵێکی

زۆرکز و لاوازی هەبوو لە کارکردن لەسەر حاڵەتی (رای گشتی) ئەمریکی،چونکە دیلی جۆرە هیستریایەکی بەکۆمەڵ بوو، یان کەوتبووە ژێر کەش وهەوایەك لەوەهمی بارانوبی ئەوەش لەژێر کاریگەری دەزگاکانی راگەیاندندا ورەتکردنەوەی تەواوی تێرامان لەدەرەنجامەکان- بەتایبەتیش لەلایەنی مرۆڤایەتیانەوەو لەسەر زەوی واقیعدا- لەوەی کە دەشێت دووچاری هاوڵاتیانی مەدەنی بووبێتەوە بەناوی ئازادی و دیموکراسی و سیستەمی نوێی جیهان. لەحاڵەتێکی لەم جۆرەدا دەشێت مرۆڤ خۆی وا بەدی بکات کە پاڵنراوە بۆ ئەوەی بگاتە دەرەنجامێکی وا کە ئەوە بەڵگەی یەکلاکەرەوەن لەسەر راستی بانگەشە پۆست مۆدێرنیستەکان(بۆدریار) و نموونەیەك لەسەر بۆشایی (کەنداو)ی واقیع کە ناشێت پڕبکرێتەوە. ئەوەچ شتێکە کە نرخ بۆ حەقیقەت دادەنێت لەسەردەمێکدا کە تیایدا دەزگاکانی راگەیاندنی گشتی بڕیار لەسەر لیستی کارەکان و ئەو تێڕوانینەی رێگا دراوە دەر ببڕدرێت یاخودی (ئاسۆی بینینێکی روون) لەمەسەلەی خاوەن بابەتی و واقیعی و ئەخلاقی و سیاسی دەدەن؟

بەڵام دەرەنجامێکی ئاوا تەنها ئەو کاتە دەشێت راست بێت ئەگەر مرۆڤ گریمانی دەقگەرایی پۆست مۆدێرنیستی قەبووڵ بێت، ئەویش ئەوەیە کە واقیع تەنها دەرنجامی هەموو ئەوشتانە نییە کە دروستی دەکەین، بەپشت بەستن بەم یارییە یان ئەو وازییە لەیارییە زمانەوانییە بالادەستەکانی پۆست مۆدێرنیستی و گوتاری یان شێوازی پراکسیسکردنی ئامارە کارییانەی کارپێکراو ، بەڵام رەتکردنەوەی گریمانێکی لەم بابەتە وەکوئەوەی زۆربەی کەس وادەکەن- تەنها ئەگەر لەدەستیان دەربچێتو لەژێر کاریگەری نیستیلابێکی چڕ ولەبەرژەوەندی شێوەو نموونەکانی تیۆری هزری دا پێی رازیبین- ئەوکاتە هەرزووبەزوو بەسانایی هەموو ناراستەی وتوێژەکە دادەمێنێت. ناردنە دەرەوەی هزر لەبواری تیۆری ئەدەب توێژیدا بەرەو کایەی مەعریفی نزیك وەکو مێژووگەرایی، وەکو ئەوەی (بنیت) قسەی لەسەرکرد. بووە هۆی بەگشتیکردنی باوەڕێکی رادیکاڵی(رێژەگەرایی) دژکاری مەعریفە.

بەم مانایە مرۆڤ بوردراوە ئەگەر گریمانی ئەوە بکات کە بۆدریار لەکۆتایی ئەو تونێلەدا لەچاوەڕوانیدا وەستابوو کە بونیادگەری و پۆست بونیادگەری لەم سێ دەیەی رابردوودا گرتبوویانەبەر، ئەم رەوتە وەکو ئەوەی( بیری ئەندرسن) بۆی دەچێت وەکوخوێندنەوەیەکی خراپەکار بۆ میتۆدەکەی(سۆسێر) دەستی پێکردووە. دواتریش پێوەری ئاراستەکاری توندی لەتوێژینەوە زمانەوانییەکانی بونیادگەری خواست و ئەو پێودرانەی کرد بەبنچینەیەك بۆ دەسپێکردنی هەڵمەتێکی بەربڵاوو فراوان لەسەر چەمکی وەکو(حەقیقەت، واقیع، نواندن)ئەوەبوو لەکۆتایدا مزگێنی تێروانینێکی گەردوونی پراگماتیکی و پۆست مۆدێرنیستی راگەیاند کەزۆر بەبەختەوەرییەوە جیاوازی ناوەڕۆکی نێوان (جەنگ) وەکو رووداوێکی دروستکراوی خەیاڵکراو_(دەلالەتێکی خەیاڵی) کەلەسایەی ئامارەکانیڕای گشتی ، وێنەی تەلەفزیۆنی، زمان نووسی گوتاربێژی- و لەنێوان جەنگدا کرد وەکو حالەتێکی وەزعی کە پەیوەستە بەجیهانی حەقیقی و لەدەرەنجامیشدا رۆژانە بەهەزارەها کەسی لەژمارە هاتووی عێراقی مەدەنی لەمنداڵ و پیاو وئافرت قوربانی بۆردوومانێکی ئاسمانی وا ببوونەوە کە هەرگیز شتی وا بەم شێوەیە وێنەی نەبووە. وەکو گوتم جێگای سەرسوڕمانە کە هزرو بۆچوونەکانی(بۆدریار) بەم گەرم و گوڕیە سروشت ئامێزە پێشوازی لێبکرێت ئەوە لەکات و سیاقی زەمەنی ئارەزووی ئێستای ئەمریکی بۆسەر لەنوێ سەپاندنی باڵادەستی نێو جیهانیدا- وەکو دیارە تەنها کەمێك لەرۆشنبیران لەتوانایاندایە رووبەرووی ئەم فشارەی تەجنیدی ئایدیۆلۆژی ببنەوە.

## دووهۆ بۆ پشت گوێ نەخستنی بۆدریار

بێگومان دەشێت مرۆڤ وابەست بکات- بەتوندیش دان بەم رایە دەنێم- کەواچاکترە زۆر بەسانەیی ئەم وتارەی بۆدریار پشتگوێ بخرێت، لەبەر ئەوەی چوونە نێو دیالۆگ لەگەڵ بۆدریار دەبارەی بابەتی جەنگی کەنداو ئەم مەسەلەیە بێبایەخ دەکات ودایدەبەزێنێتە

ئاستی و توویژ لەنێو لایەنگری ئەم رەوتە هزرییەی ئێستا یان ئەوەیتر. بەلام دووخاڵ هەیە حەزدەکەم لێرەدا قسەیان لەسەر بکەم. چونکە من ئەم ناڕەزاییە ئەخلاقیانەم دەربڕیوە.

یەکەمیان– زۆربەرروونی و رەهایی لەژێر رۆشنایی رووداوەکانی کەنداو و شێوازی وەسفکردنی دەزگاکانی راگەیاندندا گەلاڵە بوو_ ئەویش ئەوەیە کە ئەم جەنگە بەمانایەك لەماناکان جەنگێکی (پۆست مۆدێرنیستی‌یە)، راهێنانە لەسەر ئەم رەوانبێژییەی کە دەزگاکانی راگەیاندن و شێوازەکانی رازیکردنی(بان واقیعی)بلاویانکردۆتەوە بێگومان ئەوەش هەندێك لەتێبینیە دەست نیشانکراو و ووردبینەکانی (بۆدریار) دەسەلمێنێت. ئەگەر ئەوەنەبێت مرۆڤ چۆن دەتوانێت ئەم پەیوەندییە پێچەوانەییەی نێوان رادەی داپۆشین و ئاستی ئاگاداری وشارەزایی جەماوەر راڤە بکات، بلاوبوونەوەی زانیاری ئامادەکراوی بێبەر کە بەشداربوو لەدروستکردنی هەستێکی وەهمیانە بەداپۆشینی بابەتیانە و مەیدانیانەی رووداوەکان، ئەوبانگەشەکردنە سەخیفانە دەربارەی(بۆردومانکردنێك کەهەڵە ناکات) و دەربارەی (راستی و ووردی پێکانی ئامانجەکان) ئەوانە بۆ ئەوە دارێژراون تاوەکو بەوە ئیقناعمان بکەن گوایە پێکان لەنێو رێزی مەدەنییەکاندا خەریکە بوونی نەبێت، ئەوە سەرەڕای هەموو ئەو بەڵگانەی کە وێنەی کاولکاری بەکۆمەڵی ناوچەی پڕدانیشتوانی مەدەنی پیشان دەدەن، ئامادەیی بەپەلەی حکومەتە ئەورووپییەکان، حزبەکانی ئۆپۆزسیۆن، رۆژنامەکان، پەیامنێرانی تەلەفزیۆن، رابەرە ئایینیەکان و زۆریتر، هەموویان بکەونە نێو تەڵەو داوی ئەو پڕوپاگەندانەی کە کۆشکی سپی و پنتاگۆن هەوڵیان دەدا بیقۆزنەوە بەپەراوێزکردنی رای جیاوازو لادەر بەرادەی بێدەنگ کردنی تەواو وکپکردنی، لەمەش خراپتر ، رەنگە ئەو جێکەوتە وەحشیانەی زاراوە سەربازییە نموونەییەکان بن وەکو (زیانی هاوشان)،( فرمانی پاکتاوکردنی نەرم)،( هەڵمەتی دابڕکردن)..تاد کە توانی هەر زوو رۆبچێتە نێو هەر دوو گوتاری دژکار و لایەنگری جەنگ بەیەکەوە.

مرۆڤ دەتوانێت ئامارە بەم هەستکردنە گەرم و گورەش بکات بەواقیعی (بان واقیعی)،رۆحی پشتگوێ خستنی بەکۆمەڵ دەربارەی مەسەلەی خاوەن حەقیقەتە واقیعی و بەڵگەدارەکان کەبووە هۆی ئەوەی رۆژ لەدوای رۆژ بەبێ هیچ بەرەنگار بوونەوەیەك رێگا

بەبلاوکردنەوەی ئەم هەموو زانیاریە هەڵەیە بدات، داب و نەریتەکەش واراهێنراوە کە دواتر بــەردەوام کۆنگــرەی رۆژنامەنووســـی ببەســـترێت، تــاوەکو زانیارییـــەکانی پێشـــوتر راستبکرێنەوە، بەلام وەکو دیارە ئەوەبووە هۆی کەمێك کزبوونی بڕوای جەماوەر بەم هەموو پڕوپاگەندە راگەیانراوەی ئێستا، ئەوەش هاوشانە لەگەڵ جۆرە لەدەست دانێکی بەرفراوانی یادەوەری مێژوویی، رەتکردنەوەیەکی رەگ و ریشەیی- لەلایەن زۆر لە(معلقین)- بۆ تێرامان بەو فرە هاوشێوەییە توند وئاشکرایەی نێوان رووداوەکانی رابردوو وئێستا. ئەم شکستە مەزنــە بەوەرنــەگرتنی هیــچ وانەیــەکی گونجــاو بــۆ مێــژووی دەســتێوەردانە ســەربازییە بەریتانیو ئەمریکیەکان لێرەدایە، یان پشکنینی مەسەلەی جیۆپۆلۆتیکی ئاڵۆزی ناوچەکە، ئەوە جگە لەنەبوونی هیچ هەوڵ وکۆششێك بۆ ریسواکردنی ئەم خورافاتە بەسەرچووانە لەربارەی تەنها بۆمبارانکردنی ناوچە سەربازییەکان، لەولاشەوە ئێمە ئەم زیادە بڵییەو زێدەڕۆییەی ئەو خەیاڵکردنەی- دوای(جەنگی ئازادکردن) لەڤێتنام وکۆزیاو گرینادا- مان لایە، ئەوە هەڵمەتێکی راستگۆییانەی ئەخلاقیە هاوپەیمانیەتێکی ئارەزوومەندانەیە لەژێر چــاودێری ئەتەوەیـــەکگرتووەکاندا پێکــهاتووە بــۆ ئــەوەی پارێزگــاری لــەئازادیو دیموکراتیبکات، بەبێ کەمترین جێکەوتی بەرژەوەندی ئابووری یان پیلانی ئیمپریالیزمی نوێ لەلایەن ئەندازیارە ئەمریکیەکانیەوە، لەژێر رۆشــنایی هەموونــەوەدا-مەســەلەیەك دەشێت مرۆڤ گریمانی ئەوەبکات کەلەسەر لێواری دارمانی گشتی(ڤالایی گشتی)داین بۆ دیالۆگی رەخنەیی رۆشنگەر، ئەستەمە ئەوە رەتبکەینــەوە کــە گریمانــەکانی (بۆدریــار) بەهایەکی دەستنیشان کراوی دیاریکراو لەخۆیان دەگرن.بەم شێوەیە، هەندێك هۆکار هەیەبۆ ئەوەی ئەم گریمانانە زۆر بەجیدی وەربگرین ، چونکە چەند لایەنێکی دیاریکراو ئاوەژوو دەکاتەوە- ئەگەرچی سەقەت و ناتەواویشە- لەحاڵەتی هزری و جیۆپۆلۆتیکی ئێستاماندا، بــەلام هۆکــاری دووەم (کــە پێموایــە گرنگــترە) بۆچوونــە نێــو دیــالۆگ لەگــەڵ پۆســت مۆدێرنیستیدا لە نێو سیاقی جەنگی کەنداو داپێویستی بەرادەیەکی زیاتر لەبەردنگار بوونــەوەی لێ توێــژراوەی رەخنــەیی هەیــە. بــەمانای ئــەوەی زۆر بــەتوندی ئــەم ملکەچییــە ئایدیۆلۆژییــەی نێــوان ئــەم شــێوەو رەوتــە ناعــەقلانی ودژکــارەی واقیعیـــەت ریســوابکات و

تەمومژی ئەخلاقی و سیاسی نێوان ڕۆژی ... ئەو یەکەمەش ... یان دەنگیان لەدژی تەوکردارانە هەڵبژێرابوایە خە بەماوی ئەوانەوە ئەنجامدرا. ئەوەی لەنێو حیساباتی بۆدریاردا وەکو وەهمێك لەوەهمەکان خۆی نمایش دەکات- جەستەیەکی شێردراوی خورافاتی سەردەمی (ڕۆشنگەری)کۆن- ئەوەیە کە تۆ گریمانی ئەوەبکەیت کە موماحەکاتی بەم جۆرە دەبێتە هۆی هەر جیاوازییەك، یا ئەوەتا دەشێت ڕووگەی ڕای گشتی وەربگێرێت ئەگەر ژمارەیەکی باش لەخەڵك بیانتوانیبایە هەست بەم ڕادەی شێواندن و فریودانە بکەن کە دەزگاکانی ڕاگەیاندن پراکسیسی دەکەن، درۆیەکانی پڕوپاگەندە، لیستی ئامارەکان و ژمارەی پێکراوەکان کەزۆر بەوردی لەقەبارە دراوەو شتی زۆری لەم بابەتانە. ڕەنگە زەمەنێك هەبێت(دوو سەدە بۆدواوە، لەقۆناغەکانی دوای ئەم هیاجەی بەرلە سەرهەڵدانی شۆرشەکان ڕویانددا) تیایدا گوتارەکانی ئۆپۆزسیۆن ڕادەیەك لەزەخمی ڕەوانبێژی یان ئەدانیان بەلایەنی کەم بەخۆوە دەگرت، ئەو کات دەکرا ڕۆشنبیرە پێشکەوتوخوازەکان ڕۆڵێکی کاریگەر بگێڕن وەکو ڕەخنەگرێك لەبیرو بۆچوونی بەکۆمەڵ یاوەکو نێردراوێکی ڕاستەقینە کە لەژێر کاریگەری چالاکی وەهمی ئایدیۆلۆژیدا ژێر لم بووە.

بەڵام ئێستا ئەم زەمەنە بەسەرچووە،(بۆدریار) دەڵێت مادام ئێمە لەقۆناغێك لەشێوەکانی (نواندن) دەژین، قۆناغێك تیایدا ئامارەکان بێ ناوەرۆکی دەلالین، سەردەمێك لەکارتێکەرە واقیعیە بەشانۆکراوەکان چونکە بانگەشەکردنی حەقیقەتی ئێستا هیچ زەخمێکی ڕەخنەیی نییە. لەحاڵەتێکی ئاوادا دیاردەبێت جەنگی کەنداو بەرەهایی وا ڕووخساری خۆی نمایش بکات وەکو ڕووداوێکی پۆست مۆدێرنیستی و بان واقیع. ئەو ئەدراوە ڕوون و بەرچاوەو وەرنەگرتنی هیچ هەڵوێستێکی ئۆپۆزسیۆنی لەئاست مەسەلەی سیاسەتی ناوەخۆو جیهانی بۆ هەموو ئەو شتانەی لەژێر ناوی تیۆری ڕەخنەییدا تێپەر دەکرێن، دەبێ جێگای دڵەراوکێیەکی مەزن بێت، ئاڵێرەوە پێموایە کاتی ئەوەهاتووە پراکسیسی پێداچوونەوەیەکی تۆتالیتاری سەرجەم ئەو هێڵە هزرییە بکەین کە(سۆسێر) چرکەساتی دەسپێکی دۆزیەوەو دواتریش بەردەوام بوو تاوەکو قوتابخانەی جیاواز لەڕەوتی ئێستای پۆست مۆدێرنیستیدا یان ڕەوتی پرگماتیکی ئەڵگەرایی نوێ بگرنەوە، کێشەی سەرەکی

لەنێو ئەم هەموو بزاڤانەدا ئەوەیە کە بەشێوەیەکی ئاسایی و بەبێ رەخنەگرتن گوتە بنچینەییەکانی (سۆسێر)یان قبووڵە- بەتایبەتیش جەختکردن لەسەر فرمانی دەلال و رەفتارکردن لەگەڵ زمان وەکو تۆڕێك توخمی جیاکار (بەبێ زاراوەی پۆزەتیڤ)- وەکو بڵێی چەمکی ئاوا دەشێت زۆر بە سادەیی لەنێوەندی زمانەوانی بونیادگەرییەوە بەرەو کایەو لقی تری وەکو تیۆری ئەدەبی و رەخنەی کەلتووری مێژووگەرا یان شیکارکردنی شێوازەکانی نواندنی راگەیاندنی بگوازرێتەوە. هاوشانیش لەگەڵ ئەم تیۆرە دەقناویزانیەو کورتکراوەیەی پەیوەندی نێوان جۆرەها گوتاری جیاوازدا نەزانیەکی بەربڵاویش بەو پێوەچوونانەی تری نێوکایەی فەلسەفەی شیکاریەوە هەیە. نەزانییەك کە لەسایەیدا مرۆڤ خۆی وابەدیدەکات ناچاربێت بکاتە ئەو ئەنجامەی- کردەی دۆگمایی پشت ئەستووری تیۆری ئێستای پۆست بونیادگەری و رەتکردنەوەی تەواوی بۆ بەرەنگار بوونەوەی گوتەکان خۆی لە خۆیدا بەرەنگابوونەوەیەکە لەگەڵ گریمانە دامەزراوەکانیدا. لێرەدا شوێنێکیکەمان لەبەردەستدایە تاوەکو زۆر بەکورتی ئاماژە بۆ ئەو شێوازانە بکەین کە داوەرانی دیالۆگی تیۆری فرانکفۆرتی ئێستا(دوای ساڵی 1960) رێگاکەیان گرتۆتەبەر ،ئەوە لیستەیە کە-بۆنموونە- وەسفکرنی (فۆرگ) بۆجیاکردنەوەی مانا و دەلالەت لەخۆی دەگرێت. ئەویش وەسفێکی زۆر وردترە لەو حیکمەتە نمونەییەی مزری دوای بونیادگەری لەسەر بونیادنراوە، کاری فەلسەفەکاری وەکو (سول کریتك)و(هیلاری بۆتنام) و (ئەیان هاکنیگ) کە کۆمەڵێك گریمان لەخۆدەگرن و پەیوەستن بەمەسەلەکانی زمان، مانا، نواندن و، لەئاستێکی بەرزیشدان لەشیکارکردنی جوان و رێك و شارەزاییەکی وا کەمزۆر جیاوازە لەئاست موسەلەماتی تیۆری دەقگەرایی بەربڵاو، ئەو دیالۆگەی دەربارەی مەسەلەی مەعریفەی مێژوویی وپەیوەندی بە ئەسەقەکانی تێگەیشتنی گێڕانەوەیی کە ئێستا لەئارادایەو ئەم بڕیارانە ئەنجامی دەدەن و پێی هەڵدەستن بەشێوەیەکی گشتی سەر بە سەربازگەی(شیکاری)ن، بەم شێوەیە وانەی بەسوود پێشکەش بە تیۆریستە ئەدەبیە سەرسورماوەکان بەدەرەنجامە گومانکارەکانی(فۆکۆ) و(هایدن وایت) یا مێژووگەرا نوێکان دەکەن، لەولاشەوە جۆرە پارێزگاریەکی ئاوێتەیی هەیە لە تێڕامانی واقیعی فەلسەفەو

مێژووی زانستدا وەکو ئەوەی (رووی بسکی) پێشکەشی دەکات، لەولاشەوە تەقلیدی تیۆری رەخنەیی (ئەلمانی) بوونی هەیە(بەشێوەیەکی سەرەکیش قوتابخانەی فرانکفۆرت) کە ئاراستەی هەوڵ و کۆششی هەندێك لەبیریارانی وەکو(ئادۆرنۆ) و(هابرماس)مان دەکات، ئەوکاتە دوای بونیادگەری بەتەنها رووبەرووی توێژینەوەیەکی تۆتالیتاری سەیرورەتی مێژووی رابردوو پێشووتری- کەدانی پیانەنراوە- نابێتەوە، بەڵکو رووبەرووی پێداچوونەوەیەکی رەخنەیی تۆتالیتاریانە و رەسەن بۆسەرجەم هەڵەو هەنگاوە ئاڵۆزەکانی دەبێتەوە، لەولاشەوە هەندێك دەنگ لەنێو خودی سەربازگەی پۆست بونیادگەریەوە بوونیان هەیە کە بەپێی گریمانەکانی ئێستا، بەتایبەتیش ئەوبرگە زۆرو ئاگادار کەرەوانەی(دریدا) کە تیایدا بەجۆرێکی ئاشکرا لەدژی هەر شێوەیەك لەشێوەکانی(یەقینی) دەڵگەرایی یان نزیك کردنەوەی هەڵوەشاندنەوەگەرایی دروستکراوو هەڵبەستراو دەوەستێت ، بۆنموونە باس لەشیعر، فەلسەفە، مێژوو،وەکو جۆرێکی هەڵبژاردراو لەگوتار یان وەکو جۆرێکی نوسراو کە لەلایەنی گەوهەریەوە دەکات، یان لەلایەنی میتۆدیەوە یان لەپێوەرەکانی بەعەقڵانیکردنی گونجاودا جیاواز نین.پەرتە لادان لەسەر ئەو گوێ نەدانە لەئاست ئەم مەسەلانەو زۆری تر لە نموونەی لەکارکەوتو و نەگونجاوی هزر( لەژێر رۆشنایی بینیندا) دەشێت یارمەتی راڤەکردنی ئەو هۆکارەمان بدات کەوای لە پۆست بونیادگەری کردووە بەبێبەرەنگاربوونەوە بخزێتە نێو هەماهەنگی تەواو لەگەڵ هەڵوێستی(بۆدریار) کە دەربڕی دوا شێوەیە لەشێوەکانی مەعریفی.

مرۆڤ دەتوانێت هەندێك سەرچاوەی ئاڵۆزکار بەلاوە بنێت وئاماژە بۆ ئەوە بکات کە پۆست بونیادگەری لەسەر هەندێك رایەڵ جێگیربووە بەشێوەیەکی زۆر گوماناوین وشێوازی ئەلتەرناتیف تر و زیاتریش بەرچاوروونتر بۆ مقاربەکردنی هەمان مەسەلەی بنچینەیی بوونیان هەیەو موسەلەماتەکانی بۆدریاریش ئەگەر خراپنە ژێر هەر شێوەیەك لەشێوەکانیپشکنینی رەخنەیی عەقڵانی لەتوانایاندا نییە بۆ ماوەیەکی درێژ بەرگە بگرن. بێگومان من وای نابینم کە باشترین شت لەم ساتەی ئێستادا بکرێت ئەوەیە مرۆڤ بەتەواوی خۆی بۆ وتووێژکردن لەسەر ئەم مەسەلە تایبەتمەندانەی حەقیقەت و زمان و،نواندن

تەرخان بکات، واچاکترە ئەم وتووێژانە ئێستا بەلاوەبنێین و هەموو کاتو زەمان بۆ نارەزایی دەربڕین لەدژی ئەم زۆردارییە جەنگیەدا بخرێتە گەڕ کە بەشێوەیەکی ئۆرگانی هەموو هۆکارەکانی پەیوەست بوون بە مێژووی سیاسەتی هەرێمایەتی بەریتانیا و ئەمریکا و گوتارە بەها هێنەر و زمان لووسەکەیان هەوڵی داپۆشینی بەرژەوەندییە ئابووریە رووتەکەیان دەدات، چونکە رەفتارەکە ئاستی وا لەخۆی دەگرێت لەپڕوپاگەندەی زۆرەملێ و هەنجەتدارو شێواندنی راگەیاندنی تەواو کەبێ وێنەیە، رەنگە تێچوونیشی لەروانگەی قەبارەی پێکانی مەدەنی و کاریگەری ژینگەیی نەزاندرێت، چونکە هەموو زانیاریە داهاتووەکانیش دەخرێتە ژێر جۆرەها کۆت و پێوەندی ئەمنی.لە بارودخێکی ئاوادا،گاڵتەجارییە کە جەنگی کەنداو بکرێتە بەهانەیەك بۆ تێوەگلان لە(موماحکات)ی لوغزدار دەربارەی(سیاسەتی تیۆر) یاپاشماوە فراوانەکەی هزری ئێستای پۆست بونیادگەری. بەڵام ئەم پەیوەستکردنە لەخودی خۆیدا مەسەلەیەکی دوورە دەستە بەلای هەر کەسێکەوە کە لەماوەی چەند مانگی رابردوودا پراکسیسی پرۆسەی فێرکردنی کردبێت و هەوڵی دابێت فێرخوازەکانی بە(رەوایی) تیۆر لەمەسەلەی ویژدانی ئەخلاقی وسیاسی لەنێو جیهانی حەقیقیدا رازی کردبێت، یا بەبیرۆکەی ئەوەی کە تیۆری ئاوا دەبێت بەلایەنی کەم خاڵی دەسپێکی پێبدرێت بۆهەر نارەزاییەکی توێژراوەو بنەماگەرای لەدژی جەنگدا.بەهەرحاڵ ئەم هزرانەی دوایی بەشێوەیەکی ئامادە لەگەڵ مەیلی پۆست مۆدێرنیستیدا دەرۆن لەپێناو ملکەچ کردنێکی گاڵتەجاڕ وسەرکوتکارانەو بڵاوکردنەوەی هەستی ئەوەی کە ئەم جەنگە لەواقیعدا حەقیقی نەبووەو- تەواو دوورە لەتوانای بڕیاردانی ئێمە وەکو خوێنەری ئاگادار یان بینەری ئەندام لەکۆمەڵگایەکی تەئویلگەرایی تایبەتمەندا- بەشێوەیەك لەتوانامانندا نییە هیچ شتێك بکەین یان بیر لەهیچ شتێك بکەینەوە کە دەشێت کاریگەریەکی دیاریکراوی هەبێت و شێوازێك بێت بۆ بەرەنگاربوونەوەی وێنەی رەسمی(کە کەوتۆتە ژێر باڵا دەستی دەزگاو شێوازەکانی راگەیاندن) رووداوەکان. لەم سیاقەشدا مرۆڤ خۆی وابەدی دەکات کە ناچاربێت گومان لەوەبکات هەموو ئەوانەی لەژێر ناوی تیۆری هزری و ئەدەبی رادیکاڵیدا فێردەکرێت لەواقیعدا تەنها هێڵێکی دیماگۆژیەو توانای بەرەنگاربوونەوەی زۆرکزە. فێڵێکی فێڵبازە

هەموو جۆرە بەهانەیەکی دروستکراوی بەئەنقەست ئالۆز دەهێنێتەوە تاوەکو خۆی لەمەعریفەی ئەوەبدزێتەوە کە لەچالاکیخاپورکەری ئایدیۆلۆژیدا گلاوە..بێگومان من لێرەدا پێشنیاری ئەوە ناکەم- بەشێوەیەکی بێهودەییانە- کە ئەوە دەرەنجامی راستەوخۆی زیادەڕۆیی کەوتنە ژێر کاریگەری هزری پۆست بونیادگەرییە یان تێگەیشتنێکی باشتر بێت بۆ مەسەلە فەلسەفیەکان و ببێتە هۆی ئەوەی بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی گۆڕانی پێویست لەهەڵوێستەکاندا ئەنجام بدات. لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت ئەوە ببێتە هۆکارێك بۆ هەندێك بیرکردنەوەی خەمۆك لەلایەن هەندێك رۆشنبیرە چەپەکان ئەوانەی پێیان وایەکە (تیۆر) یان (زۆربەی هەرە زۆری ئەو شتانەی لەم رۆژانەدا وەکو دانایییەکی تیۆریستی پێشکەوتووخوان) خۆیان دەرخستووە وەکو ئەوەی کەمتر فرەفێڵباز تربێت یاکەمتر چەکداربێت بۆ ئەوەی بتوانێت بکات بەجۆرێك لەجۆرە کاریگەرەکانی رەخنە، بەڵکو تەنها لەتوانایدایە یارمەتی پێشکەش بەوبیر وبۆچوونە پراگماتیکیە نوێیانە بکات کە لەسەر پرەنسیپی کۆمەڵ دامەزراوە لەدەرەنجامدا دەبێتە هۆی ئەوەی ئەم بەرەنگاربوونەوەیە بکات بە کارێکی ئەستەم. بەهەرحاڵ ئەمەش جێگای سەرسوڕمان نییە، ئەگەر ئەو مەیلە بالادەستیە دژ کارەی ئەو بۆ واقیع و رەتکردنەوەی بانگەشەکردنی حەقیقەت یان مەرجی مەشروعیەت رەچاوبکەین، جا سروشت و هەڵوێستەکەی کە ئاماژەکارە بۆ بەکەم زانینێکی نیچەییانە و تۆتالیتاریانەی سەرجەم بەها هزرییەکان(لیبراڵی- مرۆڤگەرایی )یش بێت، تەنها بەکارهێنانی چەمکی وەکو ویژدان، نیازپاکی، بەرپرسیارێتی، یان حوکمی ئەخلاقیانە لەبەردەم بیریارانی راستڕەوی ئەرتۆدۆکسی پۆست بونیادگەری مانای وایە کەبەشێوەیەکی وا لەتۆ بڕواندرێت کەپڕە لەدڵ پیسووتان بەو سیفەتەی تۆ نوێنەرایەتی پاشماوەی گوتاری (رۆشنگەری) لەناوچوو دەکەیت. لەبەرئەوەی ئەگەر(منی سەربەخۆ)- وەکو ئەوەی گوتەکانی ئەوان دەری دەبڕێت- ئێستا پلیشایەوەو پەرت و بڵاوبوو بەرەو فرەیی لە(شوێنگەی من)ی بەکۆمەڵ، ئاوێتە، داتشراو لە نێو زمان یا وادەخرێتە روو وەکو بەرجەستەکردنێکی ئەم گوتارە دامەزراوە یان ئەوەی تر ، ئەوکات هیچ چارەیەك نییە تەنها ئەوەنەبێت کە ئەم بەهایانە بەردەوام وەك خاسیەت و سیفاتی جیاکەرەوەی وەهمێکی درێژخایەنی خودی

لەگەشەکردن دابن،وەکو جۆرێك لەبەگەرخستنی خودانەی(خەیاڵکراو) کەلە سەرەدەمانێکی زۆرەوە لەسایەی بەرچاورۆونی سایکۆلۆژیا و زمانەوانی بونیادگەری و تیۆری گوتاری فرۆیدی و..تاد بانگەشەکانی هەڵوەشێنراونەتەوە. بۆیە ئەوی بەناوی(بارودۆخی پۆست مۆدێرنیستی) ناونرا رەنگە بشێت بۆئەوەی مەسەلەی وا بگرێتەوە کە پەیوەندی بەئەخلاق وسیاسەتەوە هەیە وەکو ئەوەی چۆن مەسەلەی واش لەخۆدەگرێت کەخاوەنی ناوەرۆکێکی تەواو ئەپیستمۆلۆژین. بەمانایەکی تر ، هیچ پەناگەو حەشارگەیەك لەدەرەوەی (گوتار)- یا ئەو فرەییەی لەسەر (شوێنگەی من)ی گوتاربێژی دا نییە بەو سنوورەیەوە کە بەشێوەیەك دەربازبوونی تیانییە خودی (سنووری جیهانی ئێمەیە) (ئەوگوتەیەی فیگشتاین)ە، چونکە خودی گوتار بۆخۆی مەرجی هەر وتوویژێکی ماندار دەربارەی حەقیقەت، واقیع. یان بەها ئەخلاقیەکان دادەنێت.لە لاوازترین حاڵەتیشدا ، ئایا ئێمە دەتوانین دەست بەو پرۆسە رۆشنگەرییەوە بگرین(یان بەشێوەیەکی وردتر پرۆسە کانتیەکە) بۆئەوەی حوکم لەسەر ئەم هەموو مەسەلە بەربلاوەبدەین لەسایەی ئامادەکردنی (پرەنسیپێکی رەخنەیی مەلکاتەکان) کە هەوڵ بدات لەلایەك دەست بەسەرداگرتنی پرۆسەی تێگەیشتنی مەعریفەی(تیۆر) بچەسپێنێت و لەلایەکی دیکەشەوە دەست بەعەقڵی کردارەکیانەی(ئەخلاقیەوە) بگرێت. چونکە ئەوەتەنها نموونەیەك دەبێت لەسەر بیرکردنەوەی ئارەزوومەندانەی پاشەکشەکارو هەوڵێکە بۆگێرانەوەو دەستەبەرکردنێکی باڵا بەخوود لەلایەن ئەو بیریارە گەردوونیە سەلەفیانەی کە رۆڵی پێشڕەوایەتیان-یان مافی قسەکردنیان بەناوی کەسانی تری کەمتر بیر رۆشن- وەکو خورافەتێك لەخورافاتەکانی مەزنکردنی خود وایە کە بەتەواوی لەداهێنانی خۆیاندایە (وەکو ئەوەی فۆکۆ بۆی دەچێت) بێگومان هەندێ جیاوازی گرنگ هەیە دەبێت لەنێو ئەم رەوتەدا ئامارەی بۆ بکرێت کە مەیلی ئێستای هێرش بردنەسەر زەینیەتی سەردەمی رۆشنگەری و سەرجەم ئیجتیراحاتەکانی هەیە. من ئەوە رەتدەکەمەوە کە لەحاڵەتێکی وەکو حاڵەتی فۆکۆدا رۆڵی بەرجەستەکراوی (رۆشنبیری تایبەت-دەستەبژێر) هاوشانی ئیلتیزامێکی کردارەکی حەقیقیانە بێت بەچەندین پرۆژە بۆ چاکسازی سیاسی و کۆمەڵایەتی، بەشێوەیەکی هەرە دیاریش لەنێو کایەی پزیشکی دەروونی و دام ودەزگای

سزایی وبونیادی سەرکوتکەری نەسەقەکانی مەعریفە/هێز پەیوەستە بەمەسەلەی شوناس و رۆڵی رەگەز تیایدا. هەمان مەسەلەش دەشێت لەئاست بیریاری وا کە هەمان بڕوایان هەیە- ئەدوارد سەعید لەهەموویان دیارترە-ئەوانەی بەشێوەیەکی بڕوادارەوە بانگەشەی سەرلەنوێ گەڕانەوەیان کرد بۆ(سیاسەتێکی میکرۆسکۆبی) خاوەن رەهەندێکی شوێنگەیی پراکسیسکراو و بەرەنگار بوونەوەدار- بەرەو مێتۆدێک کەپشت بەخوێندنەوەیەکی پەیوەست بەسەرچاوەی دەق و ئەرشیفگەراییبەستێت کە رەخنە ئاراستەی جۆرە ئەنتۆلۆژی و هزرییەکان بکات کە لەناوەوەی هەناوی گوتاری خۆرهەڵاتناسی خۆرئاوادا هەیە، دیارە هەڵەیە ئەگەر (بۆدریار) لەگەڵ ئەم بیریارانەدا بخەینە نێو یەک خانەوە، بەڵام مەسەلەکە تەواو جیایە کاتێک هەموو ئەو گوتانە لەنێو قاڵبی ئامادەکراوداو لەسەر دەستی تیۆریستی وا کۆدەکرێنەوە کە بەهیچ شێوەیەک لایەنی کەمی پلەی ئیلتیزامی ئەخلاقی سیاسی یان تەنانەت ئیلتیزامی ئەکادیمیشیان نییە. چونکە ئەوە دەبێتە دەرەنجامی بارودۆخێکی ئاوا کە بریتییە لە ئاوێتەیەکی نیوە کوڵاو لەو هزرانەی کە لەنێو سەرچاوە بەردەستەکاندا دێن. یالەو زنجیرە دروشمانەی کە بانگەشەی بیری وادەکەن وەکو ئەوەی کە (حەقیقەت)،(واقیع) بریتین لەبیری دارسەو مەعریفەش بەردەوام و لەهەموو شوێنێکیش فرمانێکە لەفرمانەکانی ویستی هێزی مەعریفی ومێژووش تەنهاو تەنها دەرەنجامێکی خەیاڵیانەیە لەنێو کۆمەڵێک گوتاردا پاک دەکرێتەوە کە لە ململانێدان بۆ مسۆگەرکردنی سەروەری وبالادەستی لەقۆناغێکەوە بۆقۆناغێکی ترەوە، بەم شێوەیە گەیشتینە بارودۆخێک کە تیایدا هزرڤانێکی وەکو(بۆدریار) زۆر بەبڕواوە بتوانێت(گریمان)ە سەخیفەکانی دەربارەی جەنگی کەنداو نمایش بکات و بیخاتەروو بەپلەیەک کە سەرنجێکی فراوانی لەنێو بینەرانی دیمەنی هزری و پۆست مۆدێرنیستی راکێشاوە.

تێبینی/ بەپێویست نەزانراوە پەراوێزەکان وەربگێردرێن و بڵاوبکرێنەوە.

ئەم نووسینە بەشی یەکەمی(نظرية لانقدية: مابعد الحداثة، المثقفون و حرب الخليج/ كريستوفە ر نوريس ، ترجمة : د. عابد اسماعيل/ بيروت 1999 الطبعة الاولى).

# چاوخشانێك بەسەر ژیان‌و بەرهەمەكانی تیۆدۆر ئادۆرنۆ(1)
## (لەڤالیمارەوە تا تاراوگە)

ن :رامین جهان بەگلو

و: دلاوەر رەحیمی

## پێش وتار

**لێكۆڵینـــەوە** لـە بـارەی ژیـان و بەرهەمـەكانی بیرمـەندێك بـەمانای رونكردنـەوەی گشـت بۆچونـەكانی نییـە . لەبـەر ئـەوەی كـە ئـەم گشـتە لـەتێكرای بەشـۆكەكانی فـەردی ژیـانی هوشمـەندێك پێـك نـەهاتووە .بـەڵكو گشـتایەتی لـەو جیایـە . گشـت (كـل)، هەقیقـەتی ئـەم بەشـۆكانە لـەخۆناگرێ، چونكـە لەزەمـەنی تایبـەتی خـۆی بەهرەمـەندە .لەكاتێكدا كـە ڕیشـەو هەقیقـەتی ئـەم بەشـۆكانە هـەر وەكـو سـاتە نـەبینراوەكان و لەدەسـت چووەكانـە كـە بیرمـەند لـەقۆناغی ژیـانی خـۆیـدا لەتوێژینـەوەیدا بـووە . توێژینـەوەی ئـەدەبی لـەناخی نـەوتراو و نەكراوەكانی ژیـانی خـۆیـدا، ئـەم نـەوتراوو نەكراوانـە سـاتە ووردبینیـەكانی ژیـانی ئـەو پێـك دێنن . توێژینەوە سەبارەت بەبیرمەندێك ، گەڕانێكە لەقەڵەمڕەوی ئەم ساتانەو گەورەكردنیان لەژێر ووردبینی نووسینەوە . ئێمـەش لێرەدا خـەریكی توێژینـەوەی ئـەم سـاتانە لە لابەلای نوسینەكانی ئادۆرنۆ نەبین .ئـەم نوسـینە ، لێكۆڵینەوەیەكـە لـەبارەی قۆناغـەكانی ژیـانی و گۆڕانە هزریەكانی ئادۆرنۆ بەپێی زەمەنە مێژوویەكانی .

"لەجیهانێکدا کە هەقیقی نییە ، ژیانی هەقیقی ناکرێ لەئارادابێ"
ئادۆرنۆ:Minima Moralia

### ١- فرانکفۆرت

تیودۆر ویرنگروندئادۆرنۆ لە(11ی ئەیلولی سالی1903) لەشاری فرانکفۆرت (لەکەناری رووباری ماین)چاوی بەدونیا هەلهێناوە .باوکی بەرەچەلەك یەهودیو لەبازرگانە دەولەمەندەکانی شەراب و دایکیشی (ماریاکالولیئادۆرنۆ) گۆرانی بێژی کاتۆلیك وخەلکی دورگەی کۆرس بوو.تیۆدۆر ئادۆرنۆ قۆناغی مندالێتی لەگەڵ دایکیو پورەکەی (کەپیانۆ ژەن بوو)بەسەر برد ئەمە خۆی فرسەتێك بوو تاوەکو ئەو هونەری مۆسیقایان لێوە فێر بێت . ئادۆرنۆ خوێندنی ناوەندی لەهەل ومەرجە تایبەتیەکانی جەنگی جیهانی یەکەم لەخویندنگای قەیسەر ویلیەم تەواو کرد .ئەولەسالی 1920لەتەمەنی 17سالیدا وتارێکی لەبارەی ریبازی ئیگز پرسیونیسم و رەخنەیەکی سەبارەت بە (نۆپیرای)نوسینی (برینهاردسیکلیس)، مامۆستای موسیقی خۆی بەچاپ گەیاند .ئادۆرنۆ لە سالی1921 چوەتەدانیشگای فرانکفۆرت و بەخوێندنی زانستە جۆراو جۆرەکانی وەك فەلسەفە ،دەروونناسی و کومەلناسیەوەسەرقالْ بوو .لە سالی1922لەدرێژەی لێکۆلینەوەکانیدا لەبارەی مۆسیقاوە دوو وتاری لەبارەی (بەلابارتۆك وپۆل میندیت)ونوسیکەلە (Neue Blatter Furkunst Undliterqtur)بلاْوکرایەوە.ئادۆرنۆلەسالی 1924بەدانانینامەیەك (رسالە)بەپەیوەندی لەگەلْ بۆچونەکانیئەدموند هوسرەل بەپلەی دکتۆرایفەلسەفە گەیشت.

### ٢-سالانی ڤییەننا

ئادۆرنۆ لەزستانی سالی 1925چووە شاری ڤییەننا و بۆماوەی دوو سالْ لەوێ نیشتە جێ بوو .ژیانی لەڤییەنناو ئاشنایی لەگەلْ ریبازە جیاوازەکانی فەلسەفی وهونەری جێگەیەکی پایەداری لەلای ئادۆرنۆی لاودا هێشتەوە ئەم کاریگەریانە مەودای فەرهەنگێکی نوێیان

لەئاسۆی هزری ئەودا بەدیهێنا کە لەواقع دا رەخسێنەرو دیاری کەری بۆچونێك بوو کەزۆر لە نوسینەکانی ئەوی گرتوەتەوە .ڤییەننالەو سەردەمەدا ناوەندێکی درەوشاوەی بلاْوکراوەی فەرهەنگی رۆژئاواو ناوەندێك بوو بۆ توێژینەوەو وتوو وێـژی نێوان کراوە ترین دەست بەکارانی ئەم کەلتورە ، یەکێ لەتایبەتمەندییەکانی شاری ڤییەننا ئەوەبوو کەماوکات لەگەلْ پارێزگاری و بلاْوبونەوەی فەرهەنگی سوننەتی ئەورووپاو کەش وهەوای لەبار بۆپێگرتن و بالاْبوونی ئەزموونی تازەی هونەری وزانستیشی فەراهەم کرد. لەو سەردەمەدا بەشێکی گەورەی ئەم لێکۆلْینەوانە لەبارەی فەلسەفەو مۆسیقاوە ئەنجام ئەدرا .ئەو کەشو هەوایەی کەئەوسابالْی کێشابوو بەسەر فەلسەفەدا ، لەسەر بنەمای بۆچوونی کانتیزمی نوێدا بونیاد نرابوو کە بنەمای ناسینی لەپەیوەندی بە گەرانەوە بۆسەر فەلسەفەی رەخنەگەرانەی کانت ،لەنوژەن گەلاْلەکردنەوەی مەسەلەی ناسینی پێش ئەزموون کەوتو و،توێژینەوە لەبارەی نامومکینبوونی فەلسەفە وەکو سیستەمێکی داخراوی بـ سەشەکەری ناسینی چەمکە رەهاکانی خوود ناسیەوە ، دەر ئەبرا .لەبۆچوونەکانی کانتیزمی نوێیْ گەرانەوە بۆکانت بەمانای گەرانەوە بۆتیۆری ناسین، یەقینێك بوو کەلەبەرانبەر بۆچوونی میتافیزیکی کەلەسەر قسەی کانت ،تواناى ئەوەی نەبوو بگاتە پلەی زانست کۆمەك بەبەرەوپێشبردنی زانستەکانی وەك بیرکاری‌و زانستە سروشتیەکان بکات .لێرەدا پێویستە باس بکرێ کە قوتابخانەی کانتیزمی نوێ خۆی یەك پارچە نەبووەو لەقوتابخانە جۆراوجۆرەکانی پێك هاتبو و ، کەلەوانەیە بەناوبانگترینیان قوتابخانەی ماربۆرگە ، کەهزرمەندانی وەك کاسیرر، کۆهن و ناتۆرپ ئەگرێتە خۆی . بەهەمور شێوەیەك پەیوەندی نادۆرنۆ لەگەلْ ئەم شێوە هزرانەدا،ئەوەك لەرووبەروبونەوە لەگەلْ ئەم خوێندنگایانەدا ،زیاتر لەرێگەی ئوستادی فەلسەفە (هانز کۆرنلیۆس)بووە ، کۆرنلیۆس خۆی بەیەکێ لەپەیرەوانی هزرمەندانی هاوسنوورانی ڤییەننای فەلسەفەی ئەزمونگەری رەخنەگەرانەی ریچارد ئاوناریۆس وبیریوریشەی تاکانەی ئیرنست ماخ دائەنا . بەم پێودانگە لەتێروانینی هانس کۆرنلیۆس ،ناسین بەشێوەیەکی گشتی لەسەر بنەمای ئەزمونەوەدێتە دی ،بەلاْم لەبەر بێسنووربوونی

واقیعیەت دیارەکان هەمیشە بەشێوەیەک لەشێوەکان دەکەونە دەرەوەی ئەم واقیعیەتەوە ، بۆیەهەرکاتێ بەڵەدگارێکی نوێ دەرکەوتوە وهیچ کاتێ تەواوەتی ئەوان بۆئێمە ئاشکرانابێ.

ئادۆرنۆلەساڵی 1926فیبەنناى لەبەرچوونی بۆفرانکفۆرت بەجێ هێشت ، لەچوونی بۆشوێنی لەدایک بوونی خۆی بڕیاریدا درێژەبەلێکۆڵینەوەی فەلسەفیو بەردەوامی پلەکانی خوێندنی بوگەشتن بەپلەی (ئوستادی دانیشگا) بدات . لەدوای ئەم بڕیارە لەکۆڕی وانەی هانسکۆرنلیۆس بەشداری دەکردەوە خەریکی دانانی نامەیەک لەژێرناوی "ناوەڕۆکی خودئاگامی لەتیۆری سەرووی ئەزموونی ڕوحی" دابوو.ئامانجی ئادۆرنۆلەگەڵاڵەکردنی ئەم بابەتە لەلایەکەوە لەمەڕ توێژینەوەی فەلسەفەی ژیانی شۆپنهاوەر ونیچە وشەپنگلر و شێوەی ڕوبەڕوبونەوەی ئەوان لەگەڵ مەسەلەی ناخود ئاگاهیدا ،ولەلایەکی دیکەوە بەرقەراری پەیوەندی نێوان فەلسەفەی کانت ولەرو[illegible] فرۆیدەوە بووە. بەوتەی ئادۆرنۆچونکە لەتێڕوانینی ئەم فەیلەسوفانە مەسەلەی خودئاگا پەیوەندی ڕاستە وخۆی لەگەڵ شتێکی ڕوحی هەیە (کەلەڕوانگەی کانتییەوەشیاوی ناسین نی‌یە بەڵام دەکرێ بیری لێبکرێتەوە ) بەم پێیە ،بۆنەهێشتنی ئەو ناکۆکیانەی کەهزرمەندانی کانتیزم لەهەناوی هزری خۆیان لەگەڵیدا ڕوبەڕوون ،بەناچاری بەرەولایەناکانی فەلسەفەی کانت ڕۆیشتوون لەبەر ئەوەی لەقۆناغی دۆگماتیزەی متافیزیکی ئەکەونە پێش ئەوەوە .لەدیدگای ئادۆرنۆ،ئەم شێوەتێڕوانینانە کەبەشێوەی قوتابخانەیەکی ڕەسەنایەتی ناعەقلانی یان نافیکری دەردەکەوێ لە بواری کۆمەڵایەتی شێوەی ئایدیۆلۆژی بەخۆوەگرتوەو تەنانەت لەهەندێ مەسەلەدا دەربڕینی سیاسی خۆی لەئایدیۆلۆژیەکانی وەک( فاشیزم )دەبینێتەوە. لەبەرئەوەیە کەلەڕوانگەی ئادۆرنۆتەنها ڕێگە گرتن لەپێشکەوتنی قوتابخانەی ڕەسەنایەتی نا ئاوەزی وبلاوبونەوەی لەزەمینەی کۆمەڵایەتی سیاسی ،پێشنیارکردن وخستنە ڕووی ناخوودئاگای فرۆیدی لەپەیوەندی بە تیۆرەی ناسینی کانتیزمی نوێیەوەیە ،چونکە بەم شێوەیە هاوکات بەهاوکاری تێڕوانینی کانتی دژی دوگمای میتافیزیک خەباتکراوە .بەپشت بەستن بەفرۆید ڕوبەڕووبوونەوەی تازەی ئەو لەگەڵ ناوەڕۆکی ناخودئاگا و هەر جۆرە ئەفسانەسازییەک سەبارەت بەم ناوەڕۆکە کەتێیدا هەڵئەقوڵێ.

### 3 -ديدار لەگەڵ ڤالتەر بنيامين:

يەكـەمين ديـدارى نيـوان ڤالتـەر بنيـامين و تيـۆدۆر ئـادۆر نـۆ لەسـاڵى 1922ولەرێگـەى سيگفريدكراسـاوير ئـەنجام درا .ئادۆرنۆلەوكاتانـەدا تەمـەنى (20)سـاڵبوو كەلـەكاتێكدا كـەبنيامين (31) سـاڵ بـوو ،ئاوكاتـەش نامەيـەك لەسـەر (چـەمكى رەخنـەى هونـەرى لەرۆمانتيسـمى ئـەڵمانى ) لەگـەڵ دوو وتـارى لـەبارەى هوڵـدەر لـين و گۆتـە و وەرگـێڕانێك لەوێنەكانى پاريسى بۆدلێر بۆسەر زمانى ئەڵمانى بەچاپ گەياندبوو ئادۆرنۆ دواتر لە ڤالتەر بنيامين وەك (يەكێ‌لەبەرجەستە ترين مرۆڤانێكە كە لەگەڵياندا رووبەرووبوەتەوە) ياد ئەكاتەوە. بەگوتەى ئادۆرنۆ بينينى بنيامين بۆ واقعيەت بينينێكى ميكرۆسكۆبىيە كەژيان ئەبەخشێتە بچوكترين بەشەكانى ئەوەوە .ئەو بەشـۆكانەى وجودە تەنهاو خەمبارييەكەى بنيامين پەناى دەبردە بەر ئەوان‌و وەكو كۆكەرەوەيەكى زانستى (كلكسيونرى) كەلەناڕۆشنيەكانى دونياى شتێكى خۆيدا بۆدەست گەشتن بەحەقيقەتى هـەر يـەكێ لـەم شـتانە لەگەڕاندايـە ،ڕوانينـى بنيـامين لـەبوارى ئـەدەبيات ،هونـەر و فەلسـەفە وەك رۆڵـى غەمزەيـەك لـە هەقيقەتێكـە كـە كەبۆزيندوو هێشتنەوەيەتى ، ئەو لەنێو يادەوەريە فەرامۆشكراوەكانى‌زيندەگى و لـە لابەلاى شمەكە بەخاك بووەكـانى مێـژوو ئـەوە بۆقەڵـەمڕەوى بيركردنـەوەى ئەگواسـتەوە . بنيـامين نيگاى خۆى برێوەتە ڕابردوو ، رابردوويەك كەوەك مەرگ لەبەانبەر ئەوە و لەنێوان قسـەكانى ئەو لە جوڵەدايە .ڕابوردويـەك كە بنيـامين لـەيادەوەرى خـۆى لەكتێبى (منداڵێتـى بـەرلين)هـەر وەك پرۆسـت لـە 13بـەرگى بەرهەمەكـەيدا (لەگـەڕان بـۆ قۆنـاغى لەدەسـت چـووم )كـەبنيامين يەكەمين وەرگێڕى بوو بۆزمـانى ئـەڵمانى ،ئەوەك لەواقعيـەتى ئـەو زەمەنە دابگـەڕێ. بنيـامين شێوەى وون بوويـەكى هەيـە، كـە هاوكـات لـەيادەوەرى منداڵـى خـۆى لەشـيعرەكانى بۆدلـێر وپاريس سەدەى نۆزدەدا پرسە ئەگێڕێ.بەپێى وتەى بنيامين (لەشيعرى بۆدلێر وێنـەى ژن و وێنـەى مـەرگ هـەردووك لەوێنـەى سـێيەم كە وێنـەى پاريسـە بەيەكـەوە ئاوێتـە ئـەبن ،ئـەم ناڕۆشنيە نيشـانەى پـەيوەندى و ڕوداوى كۆمەڵايـەتى ئـەم سـەردەمەيە) بنيـامين ئـەم ناڕۆشنييە بە"وێنـەى ئاشكراى دياليكتيك" ناو ئەبا.وێنايـەك كەلـەديدگاى ئـەو هـەر وەك

وێنـای خـەیاڵی "کالألەواقیعـە سـاتەو سـاکارەکەیدا بەشـێوەی شـتێکی شایسـتەی پەرەستندەردێنێ"بەم پێوەدانگە لەتێڕوانینی بنیامین بەپێگرتنی ئابوری بازرگانی و لەگەڵ فەراهـەم هێنـانی ئیمکانیـاتی تـەکنیکی پێویست بۆبەرهـەم هێنـانی،بەرهـەمێکی هونـەری نەتەنها گۆڕانی بنەڕەتیلەکرداری تاکەکانی کۆمەڵ لەبەرانبـەر هونـەر دەردەکـەوێ، بـەڵکو بەرهـەمی هونەریش لەگـەڵ لەدەسـتدانی تایبەتـمەندی وحاڵـەتی خـۆی بەشـێوەی "بـەهای پیشـانگاهی "یـان بـەهای ئـاڵوگۆڕی دەردەچێـت هونـەر "دەرکـەوتی جوانـی "خـۆی جێهێشتووە لەستۆدیۆکانی سینەمایی بەشێوەی دەستکرد دروست دەکرێ.لەبـەر ئەمـە بەرهـەمێکی هونـەری لەپلـەی ڕسـەنایەتی ڕێوڕەوشـێك کـە لـە بەرهـەم هێنـانی هونـەری کەلتووری‌دا هـەی بوو بۆپلـەی هونـەرێکی جـەماوەری سیاسـی دادەبـەزێ کەهـەموو جـۆرە خەرمانەیەکی پیرۆزی لەدەست داوە ،تایبەتمەندێتی تاقانەودەرکەوتن یەکجارە،سەرکەوتنی هونەریحەوتـەم لەسـەر بەرهەمـەکانی دیکـەی هونـەری وەك دەسـەڵاتی قەڵـەمڕەوی گشـتی لەسـەر قەڵـەمڕەوی تایبەتمەندیـە ،کەبـە وتـەی بنیـامین ئەسـتێرەی سینەما و دیکتـاتۆر و قارەمانـانی ئـەون .بەقسـەی بنیـامین بەشـەریەت ئـەمڕۆ ئامادەیـە کـە تەنانـەت ژیانـە نالەبارەکەشی بخاتە نمایشەوە، لەپەیوەندی بەهەستی پاکی جوانیخۆی لەزەتی لێببینێ .

لەتێڕوانینی ئەو بۆئـەم جـۆرە شـێوازە جوانـی کردنـەی سیاسـەت ، لـە فاشـیزمدا بـەرچاو دەکەوێ و لەکاتێکدا کەلەبەرانبەر کۆمۆنیزم هـەوڵ بۆسیاسی کردنی هونەر ئەدا . بنیـامین لەڕوبەڕبونـەوەی لەگەڵ دەربڕینی ئایدیۆلۆژیای هونـەر لەسیسـتەمە سیاسـی–کۆمەڵایـەتی یەکانی سـەدەی بیستەم کەلەسـەر بنامـای عـەقڵ گـەرایی ئـامرازی و ڕوانینێکـی تـەکنیکی لەجیهاندا وەسـتاوە لەپـەیوەندی بەهونـەری جـەماوەری "کەچەندایـەتی دەخاتـە شـوێنی چۆنایەتیەوە " سوریالیزم بەدوایین پایەی نواندنی عەقڵی ئەورووپایی‌دەناسێنێ.بەوتەی ئەو "ئەورووپا لە(باکونین)بەدواوە لەهەر جۆرە بۆچونێکی ڕادیکاڵی لەبارەی ئازادی بێبەش بووە سوریالیستەکان جارێکی دیکە ئەم تێڕوانینەیان گرتوەتە بەر " . بەبڕوای بنیـامین ئـەزموونی شۆڕشی سوریالیزمی لەچەمکی ئازادیدا ، لەبنەڕەتدا لەسـەر بنـەمای سیاسـەتی شـاعیرانە وەستاوە کەئامانجەکەی بەخشینی مەودای مەستی کامەرانی‌یە بەشۆڕش لەرێگەی نوسین و

بەرهەمی نوسەرانی سوریالیزمەوە .ئەم دیالیکتیکی مەستی وکامەرانی‌یە بەشێوەی "ئیلهامی دونیایی" لەنوسینەکانی سوریالیزمی وەك رامبۆ ، لۆتەر ئادمۆند و ئاپۆلیز (کەبنیامین ئەوانی وەك بونیادنەری قوتابخانەی سوریالیزم ناو ئەبرد )بەرچاو نەکەوێ.بەلأم بنیامین هاوکات سەرنجی خوێنەری بۆلای ئەم "ئیلهامە دونیایی یە " لەرۆمانی (ناجا)ی بەرهەمی (ئاندەر برۆتۆن) ڕاتەکێشێ .دونیایی(ناجا)"دونیای بچوکی" سوریالیستەکانە کەبرۆتۆن بەڕاڤە کردنیەوە خەریك ئەبێ . "ڕاڤە کردنی" کەبەوتەی بنیامین (دواین دالدەگای عەشق)ە .عەشق بە"جیهانی شتەکان و رونیایترینی ئەوان پاریس" پاریسی سوریالیستەکان ومانایەکی وێناییە .کە ئیلهامی دونیای سوریالیستەکان ئێمەی پێ‌ئاشنادەکا " ئەم ناسینە هەر وەك گەڕانێکی خەوناوی‌یە لەکۆلأنەکانی پاریس کەسەرچاوەی خۆی لە ئیلهامی دونیاییانەی بیرکردنەوەی خوینەرێکی چیرۆکدا ئەبینێتەوە. بیرکردنەوەیەك بەوتەی بنیامین رۆلی بێ‌هۆشکەری هەیە کە ئینسانەکان لەتەنهایی خۆیاندا بەکاری ئەدێنن.مەسەلەی" تەنهایی " ناوەندی بنەڕەتی ژیان وبۆچونەکانی ڤالتەر بنیامین پێك ئەهێنێ .بنیامین لەروانگەی بونەوە ،لەتەنهاترین نوسەرانی ئەم قۆناغەی ئەوروپا یە."تەنها" لەبەرانبەر ژیانی کەلتوری ئەورانی ڤالیمار ،"تەنها "لەبەرانبەر بەربەریەتی نازی ودواجار "تەنها"لەروبەڕوبونەوە لەگەڵ یادەوەریەکانی خۆی وەك قارەمانێکی حەماسی لەبەرانبەر مەرگ .مەرگێك کەبەوتەی بنیامین لەگەڵ نەمانی چەمکی ئەزەلییەت ڕوخسارێکی نوێ بەخۆوە گرتووە ، بەشەرییەتی ئەمڕۆ لەکلأوڕۆژنەی ژوری داخراوە وە چاوی بڕیوەتە چۆنێتی مەرگی بێکفن ودفنی خۆی لەسەر تەختی نەخۆشخانەدا . بنیامین لەبەرانبەر ئەم جۆرە واقعیەتە ،تەنهایی ئەکاتە پیشە ،تەنهایی‌یەك کەهەر وەك تەنهایی کەسێتیەکانی رۆمانەکانی کافکاو رەهەندی وێنەکانی (پۆل کیلیە)یە .هەروەها تەنهایی بەشێوەیەکی هەیران و سەرگەردانی عیرفانی لەوێنای دیالیکتیکی شەقامی یەك سایدی کۆماری ڤالیمار،لەپاریس بۆدلێرو سوریالیستەکان ،لاهوتییاتی یەهودی (لەژێر کاریگەری گرشوم شویلم) لەماتریالیزمی مارکسیستی(لەژێر کاریگەری برێخت ). بەم شێوەیە خۆکوژی

بنیامین لەساڵی1940لەسنووری فەرانسا و ئیسپانیا ،وەك هاوارێكی نارەزایەتی تاكێكە تەنهایە لەجیهانی توندو تیژی ئایدیۆلۆژیە مرۆڤ خۆرەكان.

## د-وتووێژی بنیامین ئادۆرنۆ

ڤالتەر بنیامین لەوبیرمەندانەیە كە ئادۆرنۆ ی خستۆتە ژێر كاریگەرییەوە .قۆناغی هاورێیەتی وهاوكاری ئەم دووبیرمەندە هەورازو نشێوی زۆری هەبووە . ئەم هەورازو نشێودی ئەم دوانە هەندێ جار بەهاوكاری یەكتر و هەندێ جاریش بەتەنهایی بریویانە. بەهەمان شێوە كەپێشتریش ئاماژەمان پێدا . بۆچونەكانی بنیامین لەم قۆناغەدا لەلایەكەوە گرفتاری مەسەلەی عیرفانی یەهودی و لەلایەكی دیكەوە لەروبەروبونەوەدی لەگەڵ ماركسیزم بوو. رەنگە گرنگترین فاكتەری سەرنج راكێشانی بنیامین بۆكەلتووری یەهودی (بێجگە لەبەرەسەن یەهودی بوونی خۆی )، هاورێتی نزیكی لەگەڵ (گرشۆم شوبلیم) و ئەندامیەتی ئەو لەگەڵ كۆری رۆشنبیرانی رادیكالی یەهودی لەتەمەنی لاویدا بوو . بەڵام شارەزایی تەواوی بنیامین لەكتێبی پیرۆز (الكتاب المقدس)ی ئاینی یەهود بووە مایەی پەیودست بوونی ئەو بەم مەزهەبەوە ،ئەگەریش بنیامین بەراستی باوەرێكی هەبوو ،باوەری ئەو زیاتر لەزەمینەی هونەر وجوان ناسییەوە بوو، بەپێچەوانەی زۆر لەرۆشنبیرانی یەهوودی ئەو كاتە ،هیچ جۆرە پەیوەندییەكی لەگەڵ سەهیۆنیزمدا نەبووە لەلایەكی ترەوە هاورێیەتی بنیامین لەگەڵ ئارنست بلۆخ و برێخت ئەوی لەبۆچوونی ماركسیستی نزیك ئەكردەوە.

ئاشنایی ئادۆرنۆ لەگەڵ بنیامین دوای گەرانەوەی لەڤیەننا رەنگێكی نوێی بەخۆوەگرت. لەساڵی 1927بنیامین لەبەرلین ئادۆرنۆی بەكۆمەڵێ هاورێیانی خۆی ناساند ..لەم سەفەردا ،ئادۆرنۆ لەگەڵ بلۆخ ،برێخت وكۆرت وایل و هانس ئایسلر (كەدواتر لەساڵی 1944كتێبی بەهاوبەش لەگەڵ ئەم لەژێر ناوی "مۆسیقا بۆ فلیم"نووسی )ئاشنابوو.ئەومەسەلانەی كەبیری كەسانی ئەم گروپەی بەخۆوە خەریك ئەكرد ،مەسەلەی ماركسیزم و پەیوەندی ئەو لەگەڵ فەلسەفەی هێگڵ بوو . ئەم پرسیارە بەتایبەت لەپەیوەندی لەگەڵ لۆكاچ (بەتایبەت كتێبی مێژوو ویژدانی چینایەتی )وە كارل كۆرچ بایەخێكی تایبەتی هەبوو ،بەڵام ئادۆرنۆ

لەوکاتانەدا مەیلێکی زیاتری بۆ بۆچوونەکانی کانت نیشان ئەداو هەوڵی ئەدا ئائەوپەڕی توانا گفتو گۆیەك لەنێوان جیهانبینی مارکسستی و فەلسەفەی کانت ڕێکبخات . رەنگە ئەمە بۆخۆی یەکی لەو هۆیانە بوبێ کەئادۆرنۆی لەگەڵ بنیامین زیاتر نزیك دەکردەوە. بنیامین لەپێش ئەمەوە لەساڵی 1918 وتارێکی لەبارەی فەلسەفەی کانت بەچاپ گەیاندبوو . بەبڕوای ئەو " ناسین و جیاکردنەوەی توخمەکانی تێڕوانینی کانت بۆفەلسەفەی ئایندە بایەخێکی زۆری هەیە " بەوتەی بنیامین فەلسەفەی داهاتوو ئەرکی ئەوەی لەئەستۆیە کەتیۆری ناسینی کانت بکاتە سەر شاری ئامانجی خۆی ، بەم جۆرە فەلسەفە لەتوانایدا دەبێت تابەگەڕانەوە بۆچەمکەکانی کانت پەیوەندی خۆی لەگەڵ زانست و مەزهەب و هونەر دیاری بکات . لەلایەکی ترەوە ئادۆرنۆش لەپەیوەندی لەگەڵ لێکۆڵینەوەکەی خۆی لەبارەی کانت فروید ، سەرنجێکی تایبەت بۆفەلسەفەی کانت ئەگەڕێنێتەوە . هەرچەندە جێباسە کەلەکۆتایی (دەیەی 1920) لەگەڵ ئەوەی وتوێژی ئادۆرنۆ وبنیامین سیمایەکی نوێی بەخۆوە گرت . لەگەڵ گۆڕینی بابەتی نامەی ئادۆرنۆ(لەبەر ڕەت کردنەوەی نامەی یەکەم لەلایەن کۆرنلیۆس )وە دەستپێکردنی توێژینەوە لەبارەی کێرکگارد لەژێر چاودێری پۆل تلێچ کەلەوکاتەدا مامۆستای فەلسەفە بوو لەزانکۆی فرانکفۆرت، لەبۆچونەکانیدا زیاتر لەجاران ئاگاداری مەسەلەی مارکسیزم بوو . ئادۆرنۆ نامەی مامۆستای خۆی لەساڵەکانی 1929–1930 داناو لەساڵی 1933بلاوی کردەوە . بەڵام ئامانجی ئەو لەدانانی ئەم نامەیە، بەتەنیا بۆگەیشتن بەپلەی مامۆستایەتی نەبوو لەزانکۆی فرانکفۆرت . چونکە ڕەخنە لەفەلسەفەی کیرکگارد بەبۆچونی ئەو سەرنجیشە لەسەر ئیگزیستانیستەکان و بەتایبەتیش بیری مارتن هایدگەر . هەرچەندە ئادۆرنۆ بەرەخنەگرتنی لەکریکگارد سیستمی فەلسەفەی هیگڵ و توێژینەوەی ئەو لەبارەی مەسەلەی بونی تاك بەسەرکەوتوئەزانێ، بەلام بەهۆی مەیلی بۆمارکسیستی خۆی لەوقۆناغەدا بۆچوونی کیرکگارد بەڕووتی لەمەودای مێژووی دیالیکتیکی ئەبینی . بەوتەی ئادۆرنۆ ڕەتکردنەوەی تیۆری وجودی کیرکگارد جۆرە واقیع بینییەکی ناواقیعیە ، لەبەر ئەمە "بۆیەخشینی مەودایەکی ڕەخنە گرانە بە بابەتە گرنگە هزرییەکانی کیرکگارد، ئەبوایە ئەوانی پەیوەند بەرەخنەی کۆمەڵایەتی لەبەرچاوبگیرێ " .

ئادۆرنۆ بۆ پایەو ڕیشەی ئەو ڕەخنە كۆمەڵایەتیە لەو كاتەدا سوودی لەفەلسەفەی ماركسیستی وەر ئەگرت و هەوڵی ئەدا لەگەڵ ئەزموونە جوانناسیەكانی خۆیەوە هەماهەنگی بكات بەم پێیە نووسینەكانی ماركسی لاو لەلایەكەوە ئەزموونە نوێكانی شۆنبرگ لەبواری مۆسیقا لە لایەكی‌ترەوە كەم كەم شكڵێكی تازەی بەبیری ئادۆرنۆ ئەبەخشی . ئادۆرنۆ لەساڵی 1931 بەپلەی مامۆستای فەلسەفە چووە زانكۆی فرانكفۆرت ، ناونیشانی هاتنە گۆی بەرای ئەو(بابەخی ئەمرۆكەی فەلسەفە )بوو. بەبۆچوونی ئادۆرنۆ دەبوایە فەلسەفە لەم سەردەمەدا و لەبنەڕەت دا ڕۆڵێكی دیالیكتیكی ماتریالیستی بگێڕێ . بەڵام لەگەڵ هەبوونی ئەو بۆچونەی كە ئادۆرنۆ لەوكاتەدا لەسەر ماركسیزم هەی بوو ، لەچەمەرەی كلاسیكی ئەودا ئەرۆیشتەدەرەوە و لەم ڕو وەو لەپەیوەندی لەگەڵ زۆر فەلسەفی لەگەڵ بیرمەندانی دیكەی ماركسیزمی ئەو سەردەمەی ئەورووپا وەك (لۆكاچ ) دەكەوتە دژایەتییەوە . بۆنموونە چەمكی (مێژوو )لەبۆچوونی ئادۆرنۆ بەشێوەی گشتێك ئەئەخرایە ڕوو،بەڵكو لە ڕوانگەی ئەودا مێژوو شێوەیەكی پارچە پارچەی بەخۆوە دەگرت . چونكە بەپێچەوانەی هێگڵ : ئادۆرنۆ مێژووی بەشوێنێی تاقانەیی ناوەزو واقیع دائەئەنا . بەوتەی ئادۆرنۆ (مێژوو لەحەقیقیەت دایە ، بەڵام حەقیقەت لەمێژوودانییە ) ئەمە بەومانایەیە كە حەقیقەت مێژوویە ، بەلاّ م واقعیەت مێژوویەكی ڕاستە قینەی نییە . واتە بەپێچەوانەی هێگڵ ، مێژوو بەناچاری مەودایەكی عەقلانی بەخۆیەوە ناگرێ . بەدەستە واژەیەكی تر "مێژوو (لەخوودی خۆیدا) خاوەن عەقڵێك نییە ". ئەم ڕستەیە یەكێ لە بیرمەندانی دیاری ئەو سەردەمەو یەكێ لەهاوكارانی نزیكی ئادۆرنۆ لەكتێبێكیدا لەژێرناوی " سەرەتایی فەلسەفەی مێژووی بۆرجوازی " . نووسیبوی ، ئەم بیرمەندەش ماكس هۆركهایمەر بوو.

## 5-ئاشنایی لەگەڵ هۆركهایمەر پەیوەندی لەگەڵ "دەزگای لێكۆڵینەوەی كۆمەڵایەتی فرانكفۆرت"

ئادۆرنۆ بۆیەكەمین جار لەگەڵ هۆركهایمەر لەكۆڕو كۆبونەوەكانی فەلسەفی هانس كۆرنلیۆس ئاشنا بوو . لەو ڕۆژانەدا هۆركهایمەر لێكۆڵینەوەی لەبارەی فەلسەفەی كانتەوە دەنووسی . ئەولەساڵی 1922 دا بەنووسینی نامەیەك لەبارەی (كانت)ەوە بەپلەی دكتۆرای

فەلسەفە گەیشتو لەساڵی 1925 یش بەنووسینی نامەیەکی دی لەم بوارەدا پلەی ماموستا"استاد" ی لەزانکۆی فرانکفۆرت وەرگرت . لەو سەردەمەدا هۆرکهایمەر بەپێچەوانەی ئادۆرنۆ بەتوندی کەوتبووە ژێرکارێگەری بۆچوونەکانی شۆبنهاوەر و رەشبینی فەلسەفەکەیەوە . هۆرکهایمەر بەهەمان شێوە کەخۆشی نووسیویەتی : چەندان ساڵ لەگەڵ ئەم فەلسەفەیەدا هەماهەنگ و نزیك بووە ،تەنانەت بەوتەی خودی ئەو ، دەزگای لێکۆلینەوەی کۆمەلایەتی "فرانکفۆرت"یش لەسەرەتای کارەوە و لەسەر بنەمای تیۆری رەخنە گرانە خۆی لەسەر بنچینەی دووجۆر رەوتی فیکریدا دانابوو . لەلایەکەوە بۆچوونی مارکسی و لەلایەکی ترەوە هزری فەلسەفەی شۆبنهاوەر . رەنگە یەکێ لەو هۆکارە گرنگانەی کەبۆتە هۆی گۆرانی رێورەوشی لێکۆلینەوەی دەزگاکە ، هەلبژاردنی هۆرکهایمەر بەسەرۆکی دەزگاکە بوو . هۆرکهایمەر لە تەمووزی 1930(لەگەڵ ئەوەی کە یەك ساڵ پێش ئەوە بووەتە مامۆستای فەلسەفەی کۆمەلایەتی زانکۆی فرانکفۆرت) وەك سەرۆکی نوێی" دەزگای لێکۆلینەوەی کۆمەلایەتی فرانکفۆرت" هەلبژێردرا. پلەیەك کە تا ئەو کاتە کارل گرۆنبرێك لە ئەستۆیدا بوو، گرتیە ئەستۆ. لێرەدا بەپێویستی دەزانم ئاماژەیەکی کورت بە مێژووی دامەزراندنی دەزگای لێکۆلینەوەی کۆمەلایەتی فرانکفۆرت بکەین. ئەم دەزگایە کە دواتر لەژێر ناوی "قوتابخانەی فرانکفۆرت" ناسرا لە(3ی شوباتی ساڵی1923)دامەزراو لە (22ی‌حوزەیرانی ساڵی 1924) دا بەرەسمی دەستی بەکار کرد. بیری سەرەتایی ئەم دەزگایە لەلایەن کەسێك بەناوی فیلکس ڤایل لەساڵی1922خرابووە روو ، ڤایل دکتۆر بوو لە زانستە سیاسیەکان و لەو کاتەدا بەهۆی پەیوەندی تایبەتی بە مەسەلەی مارکسیزم لەگەل کۆمەلە کەسانێکی وەك کارل کۆرچ، لۆکاچ ، فریدریك بۆلۆك و کارل ئەکۆست و ڤیتفوگیل هاتووچۆی هەبوو.

لەسەرەتادا وابریار بوو کەدەزگا لەژێر ناوی (دەزگابۆمارکسیزم )و لەدواییدا بەناوی (دەزگای لێکۆلینەوەی کۆمەلایەتی ڤیلکس ڤایڵ ) دەست بەکار بکات ، بەلام ڤایڵ ئەم پێشنیارانەی رەت کردەوە و دواجار بریار درا کە دەزگاکە بەناوی (دەزگای لێکۆلینەوەی کۆمەلایەتی ) کاری خۆی دەست پێبکات . خاوەن ئمتیازی (دەزگای لێکۆلینەوەی

کۆمەڵایەتی فرانکفۆت ) باوکی ڤیلکس ڤایل کەناوی (هێرمان وایلە ) بوو لەبازرگانی دانەوێڵەدا سامانێکی زۆری وەدەس هێنابوو بەم جۆرە کە سەرنجمان دا دەزگاکە بەرەسمی لەساڵی 1924 تاساڵی 1930 لەئەستۆی کارڵ گرۆتبریك دابوو . لێکۆڵینەوە بەراییەکانی دەزگاکە بەهۆی نزیکی گرۆتبریك لەمارکسیزم لەسەر پایەی میتۆدۆلۆژیای مارکسیزمی بەرەو پێش ئەچوو . هەروەها دەزگاکە پەیوەندییەکی نزیکی لەگەڵ حزبی سۆسیال دیموکرات و حزبی کۆمۆنیستی ئەڵمانیا وسازمانی مارکسی ئەنگلس موسکۆدا هەبوو ، تەنانەت سێ کەس لەهاوکارانی ئەو کاتی دەزگاکە (ڤیتفوگیل-بۆرکنادو گومپرن) ئەندامی حزبی کۆمۆنیستی ئەڵمانی بوون ، (کارڵ کۆرچ)یش بۆلایەنی چەپی حزبی کۆمۆنیستی ئەڵمان K.P.Dکاری دەکرد . لەسەر قسەی مارتن ژای مێژوونووسی قوتابخانەی فرانکفۆرت لە کتێبی ( خەیاڵی دیالیکتیکی ) هۆرکهایمەر یش لەو سەردەمەدا پەیوەندی بەم حزبەوە هەبوو . بەڵام بەهەموو جۆرێك بەهاتنە سەرکاری هۆرکهایمەر دەزگاکە سیمایەکی نوێی بەخۆوە گرت . بەرە بەرە دوژینەوەی رەهەندە فەلسەفیەکان لەحالەتی رووکاریانەی خۆی دوور کەتەوە . رەنگە هۆی ئەم رەشبینیەی فەلسەفەی هۆرکهایمەر بێ کە دەزگاکە بەقووڵی خەریکی لێکۆڵینەوە بوو بێت لەبارەی چینی کرێکارو وەرچەرخانەکانی مارکسیزمی ئەوکاتەی ئەورووپا.

هۆرکهایمەر لەگەڵ پەیوەندی کردنی بەسازمانەوە بڕیاری‌داکەلقێك بۆسازمان لەجنێڤ رێك بخات. بەشی سویسرای سازمان خرایە ئەستۆی پۆلۆك . لەوکەسانەی کە لەوسەردەمەدا لەگەڵ دەزگا هاوکاریان هەبوو ، ئەتوانین ناوی (لیولۆڤنتال ، ڤیتفوگیل ، هەنریك کرۆسمن ، ئیلکسەندەر کوێرە ، ویلهام رایش ، کارڵ کرۆچ ، کۆرت لوین ) ببەین ، لەگەڵ ئەم بیرمەندانەدا ناوی سێ دەروونناسی بەرچاو دەردەکەوێ ، کەدوای ماوەیەك بەکۆمەڵی ئەوانە پەیوەستن ، کارڵلانداور (سەرۆکی دەروونناسی سازمانی فرانکفۆرت )هانریش مینگ و ئاسراوترینی ئەمانە ئەریك فرۆم کەلەساڵی 1932 هاوکات لەگەڵ پەیوەندی کردنی لەگەڵ هربەرت مارکۆزە بەسازمانی لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتی فرانکفۆرت دەستی بەهاوکاری کردن لەگەڵ ئەوان کرد ، دەزگا (سازمان ) شێوەی لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتی

فەلسەفی خۆی لەسەر بنەمای تیۆری تازەتر دانابوو کەبەدژایەتی لەگەڵ تیۆری کەلتووری تەقلیدی ویا باشترە بڵێین کۆمەڵگای بۆرژوازی "رەخنەگرانە " ناوبرا. ئەم" تیۆری رەخنەگرانە " یە لەسەر بنەمای روانگەیەکی رەخنەگرانە لەکۆمەڵگاو کەلتووری ئەوکاتەی ئەڵمانیا دانرابوو. لەواقیعدا تیۆری رەخنە گرانە کە "سازمانی لێکۆڵینەوەی فرانکفۆرت " وەك رێ و رەوشی تێروانینی تیۆری خۆی گرتبووە پێش . لەگەڵ کاریگەری لەبیر وبۆچوونی بیرمەندانێکی وەك ومارکس ، کانت ، هێگڵ ، شۆپنهاوەر لەڕووبەڕووبوونەوەی راستەوخۆ لەگەڵ دەرکەوتنی عەقڵانی بوونی هەرچی زیاتری دام و دەزگا کۆمەڵایەتییەکانی ئەو سەردەمەی ئەورووپا کەبارێکی ناعەقلانی بەخۆوەگرتبوو نماکردنی سەرمایەداری دەوڵەتی مۆنۆپۆڵو وەرگرتنی بەشێوەیەکی نوێی دەوڵەت لەرەهەندەکانی دیسپۆتیزم و بیرۆکراتی بونیادنرابوو . دەرکەوتنی نازیزم لە ئەڵمانیاو هاتنە سەرکاری ستانیلیزم لەشوورەوی هەروەك دوودیاردەی سیاسی :کۆمەڵایەتی و هێزی کۆمەڵگای نوێ ودەسەڵاتی بێ پرسیاری ئایدیۆلۆژی لەزەمینەی کەلتورو هونەر ، بیرمەندانی قوتابخانەی فرانکفۆرتی خستە سەر ئەوەی کەبۆلێکۆڵینەوە لەبارەی ئەم دیاردانە ، بگەرێنەوە بۆ سیستەمە فیکرییەکانی سەدەکانی پێشوی ئەورووپا. شێوازی بۆچوونی رەخنەگرانە لەحەقیقەتدا لێکۆڵینەوەیە سەبارەت بەهۆکاری وێرانی کەلتوری رۆژئاوا و مەسەلەی لایەنە تاریك و ناهاوسەنگیەکانی تاك بوو . بەبڕوای هۆرکهایمەر تەنیارێگەی ڕەبەڕووبونەوە لەگەڵ تیۆری کۆمەڵگی بۆرژوازی ، توێژینەوەو روتوو وێژ لەگەڵ ئەو تیۆرە لە هەناوی خودی تیۆرەکە نەبێت .لەبەر ئەمە، ئەو لەسەر ئەو بڕوایە بوو کەدەبێت بانگەشە پووچەکانی ئایدیۆلۆژیای بۆرژوازی و واقیعەتی هەل ومەرجە کۆمەڵایەتیەکانی هەنووکە ڕوبەڕوی یەکتر بکرێنەوە . مەبەستی هۆرکهایمەر لەم (بانگەشەیە) چەند چەمکێکی رووت بوو کەلەلایەن میتافیزیکی ئایدیالیستی کانت و قوتابخانەی ئایدیالیستی ئەڵمانیای دوای کانت خراوەتە ڕوو . بەبۆچونی ئەو ئەم چەمکانە هەروەك لەلایەن (رێبازی ڕەسەنایەتی عەقڵ) و رێبازی رەسەنایەتی ناعەقڵ(Lirrationa Lisme) ی نوێ (بەدوای میتافیزیکی ئایدیالیستی ) بەکاربراوە . بەوتەی هۆرکهایمەر لەهەل ومەرجی هەنوکەدا (رێبازی ڕەسەنایەتی عەقڵ) لەبارێکی

ڕووخاو بەسەرچەبات . لەکاتێکدا کە (ڕێبازی ڕەسەنایەتی ناعەقڵ) لەلایەن سیستەمە دەسەڵاتدارە سیاسی و ئابوورییەکان کەڵکیان لێوەرگرتووە ، ئاتەو ڕادەیەی کە عەقڵ بۆئاستی عەقڵی مرۆڤێك کە سەربەخۆ یی خۆیی لەدەست داوەو بوەتە ئامرازی دەستی بەرژەوەندیە ئابوورییەکان،دابەزیوە . ئامانجی هۆرکهایمەر لێرەدا جیاکەرەوەی نێوان ڕەهەندی ئاسۆیی ئاوەز و شێوازەکانی پراگماتیکی ، تەکنیکییە داتە پیوەکانیەتی . لەم پەیوەندیەدا ئەکرێ بڵێین زۆر لەبەرهەمی بیرمەندانی قوتابخانەی فرانکفۆرت و بەتایبەتی نووسینەکانی هۆرکهایمەر و ئادۆرنۆ لەسەر بنەمای مەسەلەی عەقڵیەت و ئەو ڕەهەندە جۆراوجۆرانەی کە عەقڵ لەمێژوو و کۆمەڵگای نوێی مرۆیی پەسەند دەکرێ و هەروەها لەسەر بنەمای لێکۆڵینەوە لەبارەی ووردبینی کەلەیادکراویان بە پەراوێزکراوەکان بوونیاد نراوە . بەم پێ یە بایەخی نوێی تیۆری ڕەخنەگرانە زیاتر لەپەیوەندیە ڕووبەڕووبوونەوە یەکە کەئەم تیۆرە لەگەڵ کۆمەڵگای هەنووکەیی‌خۆیدا هەیەتی . ئومێدی بیرمەندانی "دەزگای لێکۆلینەوەی کۆمەلایەتی فرانکفۆرت" لەگەڵاڵە کردنی ئەم تیۆرە ، لەبونیادنانەوەی سیستەمێکی فەلسەفەی داخراوی نوێ نی یە، بەڵکو هەموو هەوڵ وکۆششی فیکری ئەوان لەرێورەوشی تێگەیشتنی دنیایەکە ، کەلەوێ کامەرانی مرۆڤ ئیتر جێگەی مەبەست نییەو فیکر ئەبێتە دیل و بەندەی ڕێکخراوەیی عەقڵانی کۆمەڵگا . لەبەر ئەمە بیرمەندانی قوتابخانەی فرانکفۆرت لەو سەردەمەدا کەلەژیانی فیکری خۆیاندا ئومێدیان بڕیبووە کۆمەڵگایەك کە لە هەرجۆر بەندایەتی و خنکاندنێك (هەناسە بڕینێك) پارێزراوبێت و دادپەروەری ئازادی و سەربەخۆیی سیاسی . کەلتووری بۆهەریەکێ لەتاکەکان فەراهەم بکرێت . هەروەها لەم یەککگرتویەدا ئەوان پێشنیاری زەرورەتی کرداری شۆڕشی نوێیان لەبەرانبەر خەتەری هاتنە سەرکاری ناسیونالی سوسیالیزم ئەخستە ڕوو . بەسەر کەوتنی نازیزم لەئەڵمانیا و بەهاتنە سەر کاری هیتلەرلەساڵی 1933 و دەست پێکردنی کاری ماشێنی جەهەنەمی مرۆخۆری نازی ، پێشبینیەکانی تێڕوانینی بیرمەندانی قوتابخانەی فرانکفۆرت بەرگی کرداری کردە بەر ،بەلام ئەو ئارەزوو ئومێدانەی کەئەوان سەبارەت بەدەستهێنانی کۆمەڵگەیەکی باشتر و مرۆیی تر لەدڵ و بیری ئەوان ئەژیانەوە ؛ هاوکات لەگەڵ بەشێکی

گەورە لەکلتوری دێرین ونوێی ئەڵمانیا لەنێوان کڵپەی تورەیی و ڤینی ئایدیۆلۆژیای نازی خرایە دەست فەرامۆشی‌یەوە .هاوکات لەگەڵ خەولێکەوتنی ئەڵمانیا لەباوەشی ئەفسانەی نازی ، بیرمەندانی قوتابخای فرانکفۆرتیش ، بۆ رەها بوون لەچنگی واقعیەتێکی ترسناك کە هەر ساتێك ئەوانی ئەخستە خەتەری مرگەوە .ئەڵمانیایان بەمەبەستی ڕۆشتن بۆوڵاتانی تری ئەورووپا و ئەمریکا بەجێهێشت .لەنێوان ئەم کەسانەدا ئەریك فرۆم دووساڵ پێش ئەوانی دیکە (یانی لەساڵی 1932 رێگەی تاراوگەی لەپێش گرتبوو) ولەگەڵ "سازمانی دەروون ناسی شیکاگۆ" کاری دەکرد . لەکاتێکدا کە هۆرکهایمەر ،مارکۆزە، پۆلۆك و لۆڤینال سەرەتا بۆجنێڤ ڕۆشتن و دواتر هەر یەك بەجیا لەساڵی 1934ڕۆشتنە ئەمریکا . لەلایەکەوە بۆرکنایۆ لەبەریتانیا نیشتەجێ بوو .(گرۆسمن )یش سەرەتا بۆپاریس و بەریتانیا ڕۆیشت ، بەڵام دوا جار لەساڵی 1937 ڕۆیشتە ئەمریکا . هەروەها ڤیتۆگل کەبەهۆی کۆمۆنیست بوونی ماوەی هەشت مانگ لەیەکێ لەئۆردوگاکانی نازی زیندانی بوو . توانی بەهاوکاری هاوڕێیانی فرانکفۆرت ئازادی بەدەست بهێنێتەوە ، لەساڵی 1932 ئەڵمانیای ،بۆبەریتانیا و دواتر بۆئەمەریکا جێهێشت لەپێشودا ئاماژەیەکی بچووك کرا بەدوایین تراژیدی ڤالتەر بنیامین . بنیامین لەمارسی 1933 بۆپاریس رای کرد و تا27 ی ئەیلوولی 1940 یانی کاتی خۆکوژی . سێجار بۆدیداری برێخت (لەساڵەکانی 1934–1936–1938) ڕۆیشتە دانیمارك و دووجار بەمەبەستی بینینی ئادۆرنۆ بۆ(سانریمۆ لەئیتالیا ) سەفەری کرد . بنیامین لەو سەردەمەدا لەهەڵبژاردنی ڕۆیشتن بۆفەلەستین بۆلای شولم وایان سەفەر بۆئەمریکا بۆلای بیرمەندانی تری قوتابخانەی فرانکفۆرت دوو دڵ بوو . ئەم دوو دڵییە بەرادەیەك لەلای بنیامین قووڵ بوەوە کەتا ساڵی 1940 واتا تاکاتێ کەفەرەنسا لەلایەن نازییەوە داگیر کرا، بەم جۆرە بەردەوام بوو تائەوەی کەبە کۆمەکی هۆرکهایمەر ئامادەیی وەرگرتنی ڤیزەی ئەمریکا بوو . پاریسی بەمەبەستی ڕێبڕینی کێوەکانی پیرنەو ڕۆیشن بۆئیسپانیا و دوا تر بۆ لیشبۆن بەجێ هێشت . بەڵام دوای کۆتایی هاتنی ڕێگای کوێستان وەگەیشتن بەشاری پۆرت بوی سەرسنوور ، بنیامین و هاوڕێیانی دەرگاکانی ئازادی سنووری ئیسپانیایان لەڕووی خۆیان بەداخراوی بینی . گەڕانەوەی بنیامین بۆپاریس هەروا ئاسان نەبوو .

بەتایبەت لەدوای ڕۆیشتنی ئەومالْ و کتێبخانەکەیشی لەلایەن (گشتابۆ)وە زەوت کرابوو. بنیامین کەخۆی بەزیندانی بەربەریەتی نازی ئەبینی ، شەوانە بڕیاری دا ، کۆتایی بەژیانی خۆیبهێنێ بەخۆکوژی بنیامین سەرشاری هێوری ڕۆژگاری تاکایەتی لەبەرانبەر ، نەزانی و توندوو تیژی ڕۆژگاری جەماوەر بەچۆك داهات.

## 6-ئادۆرنۆ و یەکەمین هەولْ بۆگەڵاڵەکردنی تیۆری ڕەخنەگرانەی هونەر

ئادۆرنۆ زۆر درەنگتر لەکەسانی دیکە بڕیاری دا پەیوەندی بکا بە(سازمانی لێکۆڵینەوە ی کۆمەڵایەتی فرانکفۆرت ) . لەڕاستیدا ئادۆرنۆ بەرەسمی لەساڵی 1938 لەئەمەریکا پەیوەندی بەکۆمەڵی لێکۆڵەرەوانی سازمانەوەکرد . هەرچەند لەماوەی ئەم سەردەمەی کە سازمان لەفرنکفۆرت دا کاری ئەکرد . ئادۆرنۆ لەنزیکەوە هاوکاری لەگەلْ گۆڤاری سازمانەکە هەبوو . ووتارەکانی ئادۆرنۆ لەم قۆناغەدا زیاتر لەبوارەکانی مۆسیقا و ستاتیکا (جوانناسی )یەوە بوون، بەپێچەوانەی هۆرکهایمر کەبنەمای لێکۆڵینەوەکانی خۆی خستبووە سەر بنەمای ووتو وێژ لەگەلْ خواستەکانی فەلسەفەی هاوچەرخ و مەسەلەی ڕەخنە لەسەر عەقڵانییەت . بۆچوونی ئادۆرنۆ زیاتر لەپەیوەندی بەمەسەلەی مۆسیقا و شانۆ دەر ئەکەوێت . گومانی تێدانییە ، ئادۆرنۆ لەوساڵانە لەبۆچوونە فیکریەکانی بنیامین نزیك تر بووە ، ڕەنگە ئەم نزیکییە خۆی هۆکارێ بێت بۆئەوەی کەئادۆرنۆ وەك بنیامین میتۆدۆلۆژیای مارکسی زیاتر لە بواری هونەر وجوانناسیدا ئیشی پێبکات و کەمتر خەریکی لێکۆڵینەوە لەبوارەزانستە کۆمەڵایەتی یەکان بێت ، لەوسەردەمەدا مەسەلەکە سەبارەت بە توێژینەوە لای ئادۆرنۆ مەسەلەی ئەفراندن لەمۆسیقاو پەیوەندی ئەو لەگەلْ هەل ومەرجە مێژوویەکانی بەرهەمەکەوەیە بەبڕوای ئادۆرنۆ مۆسیقا بەشێوەیەکی گشتی هەڵگری دژایەتیەکانی ناو هەناوی کۆمەڵە ، بەرهەمی مۆسیقی وەك هەربەرهەمێکی دیکەی هونەری دەربڕی گۆڕان ووەرچەرخانی واقعیەتی دونیای دەرەوەیە . لەبەر ئەمەیە کەمۆسیقاش لەپەیوەندیەوە بەڕەوەندی وەرچەرخانی کۆمەڵایەتیدا ڕێنای جیاواز جیاواز بەخۆوە ئەگرێ ، بەم پێیە ئەکرێ بڵێین کە تێروانینی ئادۆرنۆ بۆهونەر لەبنەڕەتدا لەسەر بنەمای ناسینی

کۆمەڵایەتی لەفۆرمی بەرهەمی هونەریدا وەستاوە ، واتا بۆ تێگەیشتن لەبەرهەمی هونەری پێویست بەناسینی بونیادو پەیوەندییەکانی ئەوکۆمەڵگایە ئەکات کەلێیەوە هەڵقوڵاوە . بەم جۆرە هونەر خۆی شێوەیەکە لەژیانی کۆمەڵایەتی . بەڵام ئەوەی کەهونەر لەبوارەکانی دیکەی کۆمەڵ جیائەکاتەوە ، تایبەتمەندی نەفی کردنەوەو رەخنەگرانەکەیەتی . بە وتەی ئادۆرنۆ ، ئەگەر لەکۆمەڵگایەکدا هونەر هەیە، بەڵگەی رەخنەگرتنە لەو کۆمەڵگەیە . لەبەر ئەمەیە کە هونەر هەمیشە دابین کەر و داکۆکی کەری بەشە لەبەرانبەر گشت ، و ئاوەزی تاك لەبەرانبەری رێکخستنی کۆمەڵایەتی بووە. لەم بارەیەوە بۆ ئادۆرنۆ ، تاکێتی و هونەر وەك دوو تای تەرازوویەکن . چونکە هەر یەك بەشێوەیەك لەبەرانبەر (ئەو ئایدیۆلۆژیا کۆمەڵایەتیە کەبەپشت بەستن بە دەسەڵات و توونددو تیژییە وێرانکەرەی خۆی هەوڵئەدا بۆمل پێکەچ کردنی مرۆڤەکان بۆلۆژیك و بەرژەوەندییە ئابووری و سیاسیانەی خۆی ) بۆبەرگری لەسەربەخۆیی خۆی زۆرانبازی ئەکات . لێرەدا بەروونی تێ ئەگەین کە ئادۆرنۆ بەچ شێوازێك وەکو لۆکاچ و بنیامین لەتێزە فیکریەکانی مارکسی لە بواری هونەرو جوانناسی کەڵك وەرئەگرێ . ئادۆرنۆ لەنووسینەکانی دا چەندان جار لەبارەی تێزە ماکسییەکانی وەك بەهای گۆڕینەوە ، بەهای بەکارهێنان خەسڵەتی فتیش کالا ، بەرهەم هێنان و بەکار هێنان ئەدوێ . بۆ نموونە یەکێ لەوبوارە هونەریانەی کە ئادۆرنۆ ی بۆلێکۆڵینەوە لەبارەی ئەوەوە ئەگەڕێتەوە بۆئەو تێزانە ، بواری مۆسیقایە . لەڕاستیدا بواری مۆسیقا بەشێکی گەورە لەبیر کردنەوەی ئادۆرنۆ پێك ئەهێنێ . رەنگە یەکێ لەو هۆیانەی بایەخدانی تایبەتی ئادۆرنۆ بەمۆسیقا ، پەیوەندی نزیکی ئەو بە جەوهەری دونیای بەسیستەم بووی سەدەی بیستەمە . لەبۆچوونی ئادۆرنۆ بارێکی نوێ کە مۆسیقا تیایدا ئەرئەکەوێ لەپەیوەندیەکی ڕاستەوخۆیە لەگەڵ پلەی تاك لەکۆمەڵگەیەکدا ئەبێت ، کەلەوێدا ئیدی قسە بۆ وتن نەماوەتەوە و پەیوەندی نێوان مرۆڤەکان دابەزیوەتە سەر هیچ . بەڵام مەرگیئاخاوتن و لەنیمکان دا ئەبوو ی پەیوەندی مرۆیی تاکە نیشانەی دوونیای نوێنییە . چونکە بەوتەی ئادۆرنۆ هەستی بیستنی مرۆڤیش رەوتێکی بەرەو رابردووی گرتوەتەبەر . بەبڕوای وی ئەم دیاردەیە بەناچاری پێبەپێی خەسڵەتی فتیشی یە ، کەمۆسیقای تیادا بەهرەمەندە . ئادۆرنۆ

لەیەكێ لەووتارەكانی خۆی لەژێر ناوی "خەسڵەتی فتیشی مۆسیقا پاش رەوەی بیستن " لەساڵی 1938 ئەم مەسەلەیە بەرۆشنی دەردەخا . كەئەمانی بیستن لەپەیوەندی راستەوخۆیە لەگەڵ پێشكەوتنی زانستی تەكنیكی و میكانیزمی بەرهەم هێنان. لەراستیدا بەوتەی ئادۆرنۆ كەم و كوڕی هەستی بیستن و لەبەر یەك هەڵوەشانی پلەپلەی مۆسیقا ، تەواوكەری یەكترن . بەقسەی ئەو "گوێگرانێك كەلەبەر كەم و كوڕی هەستی بیستن ، بەومناڵانە دەچن كەزمانی مۆسیقایی منداڵانە ئەخرێتە ئەستۆی ئەوان " ئەم بیسەرانە هەرچەندە زیاتر وەڵام بەمۆسیقا كاڵایی و بەكارهێنان كەلەبازاردا دەخرێنە ڕوو بدەنەوە ، زیاتر دەكەونە ژێر دەسەڵاتی نیزامی ئابووری بازاری . لەبەر ئەمەیە كەئادۆرنۆ خراپی بەكار هێنانی هەستی بیستن وەك خەتەرێك بۆهونەری مۆسیقا و بەرهەمی كەلتووری رابووردوی بەشەری دادەنێ . مۆسیقا كە ببێتە شێوەیی بەبەكارهێنانی زۆرە ملێ'پایەداری‌و وەستاوی خۆی لەدەست ئەدا . بۆنموونە مۆسیقایەك كەلە رادیو بڵاو ئەكرێتەوە . مۆسیقایەكە بەپلەپلەی خراپ وساكار دەڕوا ، تاوەكونەوەی كەشێوەیەكی گاڵتە ئامێزو نوكتاوی بەخۆیەوە دەگرێ . بۆچوونی ئادۆرنۆ سەبارەت بەڕادیۆ دواتر شێوازێكی كۆمەڵایەتی وەردەگرێ و بەدوو وتار لەساڵی 1940 ، یەكێكیان لەژێر ناوی "لەمەڕمۆسیقای خەڵكی " ، (بەهاوبەش لەگەڵ جۆرج سیمیسۆن) و ئەوی دیكە بەناوی "رەخنەی كۆمەڵایەتی مۆسیقای رادیۆ " (2) چاپ كرد . ئەم وتارانە هەروەكو ئەو وتارەی سەبارەت بەخەسڵەتی فتیشی مۆسیقا ، لەو وتارانەن كە ئادۆرنۆ لەسەردەمی نیشتەجێبوونی لەئەمریكا نووسیونی .

تێڕوانینی ئادۆرنۆ لە بارەی مۆسیقا لەو وتارانەی دەورانی ئەمریكا لە درێژەو پەیوەندی بەو بۆچونانەوە هەیە كە ئەو وتارانەی سەبارەت بە مۆسیقا لە دەورانی ڤییەننا ، فرانكفۆرت و بەریتانیا شدا هەی بوو .

دواتر ئادۆرنۆ هەریەك لەو وتارانە و كۆی ووتارەكانی كردە كتێب ، لەوانە ئەو كتێبانەی كەسەبارەت بەمۆسیقای گۆستا و ماهیلەر لەژێر ناوی "ماهیلەر:سیمایەكی مۆزیكاڵ mahler:one physionamic musicale (1960)" و لەبارەی ئارنۆلد شوینبرگ و ئەیكور ئەستوایشكی لە ژێر ناوی (فەلسەفەی مۆسیقای نوێ Philosaphied

Demeacnkusik) "1949" ، لەمەر مۆسیقای ریچارد ڤاگنەر لەژێرناوی (وتار لەمەلا ڤاگنەر –Rersuh ubcrwagner) "3" (1952) ئەوەی بەشێوەیەکی گشتی لە وتارو نووسینەکانی ئادۆرنۆ سەبارەت بەمۆسیقا بەرچاو ئەکەوێ ، پێش هەر شتێك هەوڵێکە ، لەرێگەی رەخنەی دەسەڵاتی پرۆسەی بەرهەمهێنان وبەکارهێنانی لەبواری کەلتووری مۆسیقا . لێرەدا رەخنەی ئادۆرنۆ لەبەرهەمهێنان لەسەر جۆری "نوع" شێوازەکانی ئەو، کەلەوانە بەرهەم هێنانی سەرمایەداری و سوسیالیستی یە . چونکە مەبەستی فیکری ئادۆرنۆ لەئازادی تاك داهێنانی هونەری ئەو، رەها لەهەر قەید و بەندێکی نیزامی ئابووری سیاسیدا کورت ئەکرێتەوە . ئادۆرنۆ بۆگەشتن بەم ئازادیە بەرەوتێکی خوودبینی دیالیکتیکی ئەبینی کە لەگەڵ رەت کردنی پۆزەتیڤانەی خود ولۆژیکی یەکسانی کە تواری کۆمەڵایەتی شێوەیەکی دیالیکتیکی نیگەتیڤی بەخۆوە دەگرێ ، ئەم دیالیکتیکە بەئازاد کردنی رەهەندی نایەکسانی لەژێر دەسەڵاتی گشتی و یەکسانی لۆژیکی سەلماندن خوازی کەتواری لەئارادابوو ، وەك ئەڵتەرناتیڤی کەلتوری ئازادیخوازی لە کۆمەڵگەی تەکنیکی و لەبن ئەهاتوی بەشەری جێگەی گەڵاڵە کردنە . ئادۆرنۆ توانای هەبوونی ئەم ئاڵتەر ناتیڤە کەلتورییە تەنها لەهونەردا دەبینێ . چونکە تەنها هونەرە کەتوانای دەربڕینی بێ وڵاتی (ناکجا ئاباردی )هەیە کەئەوبە (بیگانە غیر ) ناوی ئەبا، بەتایبەت کە میتافیزیکیش بەتێروانینی ئادۆرنۆ لەقۆناغی وێرانی خۆی بۆ (نزیکەی هیچ ) دابەزیوە. لەم رووەوە یادەوەرەی ئازارو رەنجی رابووردوو تەنها لەوێنای بەرهەمی هونەری دا ئەکرێ ببینرێ. لەم نێوانەدا مۆسیقا زیاتر لەهەموو شێوە هونەرییەکانی دیکە ئەتوانێت "دژایەتی بەلەچارنەهاتوەکانی واقعیەت " لەشێوازی خۆیدا بخاتەروو بەم شێوەیە لەمۆسیقادا پەیوەندی نێوان کۆمەڵگاو هونەر ئاشکراتر لەهونەرەکانی دیکە نیشان ئەدرێ ئادۆرنۆ ئەم پەیوەندیە لەنێوان بیسەر وەك بونەوەرێکی کۆمەڵایەتی و داهێنانی مۆسیقا وەك پێشکەوتن یان بەرەو دواوەی هونەر لەناو کۆمەڵگادا پایەدار ئەکا ، مەسەلەیەك کەلەبواری مۆسیقادا هزری ئادۆرنۆی سەرقاڵکردووە، رۆڵێکە کە هەموو وێنەیەك لەمۆسیقا لەکۆمەڵگادا ئەیگێڕێ . ئەوەی لێرەدا ئەبێتە جێ پرسیاری ئەو ، کامە مۆسیقا بەفەرمانی نیزام و بنەمای کۆمەڵ جێبەجێ ئەکاو کامەیان بەرەخنە گرتن دەستی لێ ئەدا .

جیاوازی نێوان ئەم دوو جۆرە مۆسیقایە لەوە قووڵترە کەبکرێ لەیەکیان نزیك بکەینەوە . لەبەر ئەوەی ئادۆرنۆ لەسەردوو جۆر مۆسیقای جیاواز قسە ئەکا . لەلایەکەوە مۆسیقایەك کە ئارێك لەگەڵ واقعیەتی یەکسانی کۆمەڵگا، لەتوێژینەوەی سەرپشکایەتی کەلتووری لەدەست چوە . لەلایەکی دیکەوە مۆسیقایەکی عادەتی کەوەك بەهاوتایبەتمەندی لۆژیکی یەکسان و ژیان ومۆسیقای رەسمی کۆمەڵ ، لەمۆسیقایەکی دووبارە بوەوەو سەرگەرمی دەردەکەوێ . بۆنموونە مۆسیقای (جاز ) کەماوەیەکی درێژە وەك ئێزەیەك بۆخەبات و بەر هەڵستی و ئارەزای ڕەش پێستەکان قسەی لەسەر کراوە ، بەبڕوای ئادۆرنۆ نیشانەی ئارەزایی و بەرهەڵستی ڕەش پێستەکان بەرانبەر سپی پیستە نژادپەرستەکانی ئەمریکایی نییە ، بەڵکودەربڕی بارێکی رۆحی و دەروونی‌یە کە فەرمانبەداری کوێرانەی ڕەش پێستەکانە لەکۆمەڵگا سپی پیستەکاندا هەڵئەقوڵێ . ئادۆرنۆ مۆسیقای جاز بەنوێنەری بارزی (دەرکەوتە ) هونەری جەماوەری ئەزانی ، بە وتەی ئەو "لەجازی بێ‌جوڵەدا ، جوڵەیەکی هەمیشە یەکسان ئەبێتە جێگرەوەی زەمەن " . بەدەربڕینێکی دیکە ، دوبارە کردنەوەی ئاوازێك و یا ئاهەنگێك بەمانای دەسەڵاتی شوێن لەسەر زەمەنە لەمۆسیقای جاز . ئادۆرنۆ وەستانی زەمەن لەفەزای جاز بەپێشاندەری نەمانی تاکایەتی و سەرپشکاتی تاك ئەناسێنێ.

مۆسیقای جاز بۆتاکێکی مەجبوور تەنها لایەنێکی سەرگەرم کردن و بەسەر بردنی هەیە بیسەری مۆسیقای جاز هیچ جۆرە ڕۆڵێکی کاریگەری لەبیستنی‌دا ئانوێنی لەڕاستیدا لەژێر کاریگەری کەشی زاڵ و دووبارە بوونەوی دەنگەکان لەپلەی کارای تاکەوە بۆپلەی بەر کاری جەماوەری دادەبەزێ. ئەم کاردانەوە و ژێرباریەی تاك لەکەشی مۆسیقای جاز ، دەربڕی قبووڵکردنی ئیزامی ئەو کۆمەڵگایەیە ئەك بەرهەڵستی کردنی لەلایەن ئەم مۆسیقایەوە ، لەم رووەوە ئادۆرنۆ مۆسیقای جاز بەیەکی لەمۆسیقا خراپەکان لەقەڵەم ئەدا. ئەم مۆسیقایە لەسەردەمی سەرمایەداری بازاڕی شێوەی فتیشێك بەخۆوە ئەگرێ‌و بەلەدەستدانی رەگەزی رەخنەگرانەیە کەمۆسیقای رەسەنی بەکالا ئەبوودا هەیەتی ، دەگۆڕێت بە کالایەکی سەلمێنراوی کۆمەڵگایەکی ئیداری . بەقسەی هێبەرت مارکوزە لەوتارێك لەژێرناوی (لەمەڕ تایبەتمەندی "ئیسپاتی "کەلتور )لە1937 : (کەلتوری خۆسەپێن

سەرەتا دژ بەکرداری "بوونە شت" دەکەوێتە بەرهەڵستی تاسەر ئەنجام بکەوێتە جەنگیەوە ().

ئادۆرنۆ ناوەڕۆکی مارکسی فتیش هەروەکو مارکس لەپەیوەندی لەگەڵمەسەلەی بەرهەم هێناندا لێکۆڵیوەتەوە . بەبڕوای ئادۆرنۆ لەبواری مۆسیقا بەرهەم هێنانی کەلتووری خەڵکی شان بەشانی پرۆسەی ستاندەر سازی . لەڕوویەکەوە تەواو کەری ئەم کرداری ستاندەر کردنەیەی مۆسیقا ، تاکرەوانە دەرکەوتوو ، ئەم وەهمە بەجێدەهێڵێ کەهەر تاکێك خۆی ناهەنگ و یا هونەرمەندی خۆشەویستی خۆی هەڵدەبژێرێ . لەکاتێکدا کە پێشتر بۆئەو بیستراوە و دیاری کراوە . لەم روە وە "بیسەرانی مۆسیقای بەسەربردن (تفرجی )خۆیان بابەت یان بەدروستی بەرهەمی هەمان میکانیزمێکی کەبەرهەمی مۆسیقای خەڵك دیاری دەکەن " . بەم جۆرە کەلتوور هاوکات لەگەڵ نیشاندانی رۆڵی پۆزەتیڤی خۆی لەکۆمەڵگە ، هەمو تاکەکانیش ئەکاتە ئالیەتی دەستی خۆی .ئەم کەلتوورە لەخۆنامۆگەرایە کەئادۆرنۆ دواتر بە"پیشەی کەلتووی " ناوی ئەبات ، وەك دەسەلاتی گشت لەسەر بەش، واتە دەسەلاتی رێکخراوەی کۆمەلایەتی بەسەر بەرژەوندیەکانی تاك دەر دەکەوێت . ئادۆرنۆ لەدژایەتی لەگەڵ بەیانێکی بەم جۆرەی کەلتور ، لەکەلتور وەك (بەرهەڵستی هەتاهەتایی بەش لەسەر گشت ) ئەدوێ .

ئەو ئەم بەرهەڵستیەی جارلەجار زیاتر لەداهێنانی هونەریدا دەبینێ ، کەبەپێچەوانەوە (پیشەی کەلتوری ) (کەجگە لە بەرهەمی هونەری بۆبەکار هێنانی جەماوەری لۆژێکێکی دیکەی نیە ) هەوڵ بۆلابردنی نرخی کالأیی و بەکار بەری کۆمەڵگە لەهەوڵدانی تەکنیکە نوێیەکان لەبواری مۆسیقادا ئەدات . بەم پێیە دژایەتی ریشەیی لەتێروانینی ئادۆرنۆ دەکەوێتە نێوان دووجۆر مۆسیقاوە ، لەلایەکەوە مۆسیقایەك کە لەرێی بەهاکانی بازارەوە هەنگاو ئەنێ‌و لەلایەکی دیکەوە مۆسیقایەك لەدژی ئەوان هەڵدەستێ . بەو جۆرەی کە پێشتر وترا . بەبڕوای ئادۆرنۆ مۆسیقای جاز و مۆسیقای جەماوەری نیشانگەری مۆسیقای فتیش و ستاندارد کراوێکە کەلەپەیوەندی نزیك لەگەڵ پاش رەوی هەستی بیسەریی گوێگران لەمجۆرەمۆسیقایەوە هەیە. ئادۆرنۆ ئەم دووجۆرە مۆسیقایە

بەشێوەی مۆسیقای تازە دانانی ، بەڵکو ئەوان بەشێوەیەکی ناشرین و لەکەدار کردنی مۆسیقا ئەزانی ، ئادۆرنۆ دەستە واژەی (مۆسیقا ی نوێ) لەدرێژەی ئەو ناونیشانەی کەمۆسیقازانانی "قوتابخانەی ڤیەننا "(4) لەساڵانی 1920 گەلآڵەیان کردبوو کەڵکیان لێوەردەگرێ. ناشنایەتی ئادۆرنۆ لەگەڵ ئەم قوتابخانەیە بۆیەکەمین جار لەساڵی 1925 لەسەفەرەکەی بۆ ڤیەننا دەستی پێکرد . ئادۆرنۆ لەدوای دیدارەکەی لەگەڵ (ئالبان بیرگ ) و بینینی ئۆپەراکەی و (تیرزێگ) و لەڤیستیڤاڵی فرانکفۆرت (ماین ) لەساڵی 1924 دا ، بڕیاری رۆشتنی بۆ (ڤیەننا ) دا . ئادۆرنۆ لەماوەی ئەو سێ‌ساڵەی کەلەڤیەننا بوو ، خەریکی خوێندنی هونەری مۆسیقا و پیانۆ لە لای ئالبان بیرگ و(ئیدوارد ئەستو ئەرمەن ) بوو. هەروەها نیشتەجێ بوونی لەڤیەننا فرسەتێك بوو تا ئادۆرنۆ لەگەڵ شۆئینبرگ دەربرینی مۆسیقای نوێی ئەو ناشنا بێت.

7-شۆئینبرگ و مۆسیقای نوێ

ئەوەی لای شۆئینبرگ سەرنجی ئادۆرنۆی بۆ لای خۆی راکێشاوە ئەوپلەو پایە مۆسیقاییە تایبەتە بوو کەمۆسیقای ئەو لەو سەردەمەدا هەی بوو . لەراستیدا شۆئینبرگ لەگەڵ خستنە پشت سەری لۆژیکی مۆسیقا کەلەماوەی سێ سەدە لەمێژووی مۆسیقای رۆژئاوایی تەوەرەی بنەڕەتی خۆی لەناوەرۆکی تۆنالیتە ئەبینییەوە ، مەودایەکی ئەزمونی نوێ لەبواری مۆسیقادا دەستی پێکرد . شۆئینبرگ تۆنالیتەی بەیاسای سروشتی ئەبەدی (مۆسیقا) دانەئەنا . لەبەر ئەمەش لەجێگەی پەیڕەوی لەبەهاکان و شێوازی کلاسیکی مۆسیقای رۆژئاوا ، لۆژیکی دەروونی ئافەرینشی بەرهەمی مۆسیقای وەك قیاسی جولەی ئەو دائەنا . رێبازی تازەی شۆئینبرگ لەمۆسیقا بەپەیوەندی لەگەڵ ئەزموونی جوانناسی مۆسیقازان لەمۆسیقادا و توانایی ئەو لەکەڵك و هەوڵدانی هونەری ئەو پیشان ئەدرا . شۆئینبرگ زمانی مۆسیقای نوێ کە لەسەر پایەی هاوبەش لەدوانزە دەنگی بەدوای یەکدا هاتوو بونیاد نرابوو ، خستنیە جێگەی سیستەمی هارمۆونی کلاسیك . ئەو ئەم هونەرە تازەیەی لەمۆسیقادا لەدوای ناوێك کە لایی بۆریتس لێنابوو ، "داهێنان – لەگەڵ دوانزە دەنگ–Tonen"ی ناو نا ، کەئەزمی خۆی لەڕیشەی ڕەدیفی بەدوای یەکدا

هاتوودا (Serie) ئەبینێتەوە . ریشەی رەدیفی لەحەقیقەتدا شێوازێکە کە وەك ئەو مۆسیقارانەی ئەم دوانزە دەنگە بەبێ دووبارەبوونەوە لەسەر بنچینەی کارکردی هەربەرهەمێك دەکاتە جێ کەڵك وەرگرتن . ئەم شێوازە کە لەژێر ناوی مۆسیقای رەدیفی (Serial) ناسراوە ، دواتر لەلایەن ئەنتان ویبرمن (لەقوتابیانی شۆنبێرگ) ، (هیربوڵن و(ئەشتۆکە هاوزن) یش، بووە مایەی کەڵك وەرگرتن . هەرچەندە کەشۆنبێرگ لەو بروایە دابوو کەشێوازە نوێیەکەی ، رەگەزێکی تازەی بۆمۆسیقای کلاسیك زیادنەکردووە بەڵکو لێشی کەم دەکاتەوە ، بەڵام گومانی تێدانییە کەشۆڕشی شۆنبێرگ لەبواری مۆسیقادا، کەش و هەوای مۆسیقایەکی نوێی پێبەخشیوە کە بونیادەکانی مۆسیقای لەقەیدو بەندی (نا حەقیقەت non-verite) خۆی ئازاد دەکرد بەڵام جۆرە پلەی (نا-حەقیقی) کەبەرهەمی مۆسیقای لەپەیوەندی و بەندایەتی بەسیستەمی پێداویستیە کۆمەڵایەتییەکان وەدەست دەێنێ. لەلایەن ئەزموونێکی نوێ لەبواری مۆسیقاکە بیرەوەری مۆسیقای پرەکە گەورەیی و ئازادی هونەری سەدەی نوزدەهەم زیندوو دەکاتەوە، خرایە دواوە. مۆسیقای شۆنبێرگ ئاگای رووناك بێن رابووردوی بۆهونەری مرۆڤایەتی نائومێد و لەخەوی سەدەی کۆتایی گەڕاندەوە. لەگەڵ شۆنبێرگ ، هونەر بەجەرگی و دەرفەتی وەستانەوەی بەرانبەر بەهابازاڕی و ڕەمەکیەکان دووبارە دۆزییەوە . لەم رووەوە بەوتەی ئادۆرنۆ بزوتنەوەی رەخنەگرانەی ئەم شێوەیە لەمۆسیقا بووەهۆی دابڕانی پەیوەندی ئەو لەگەڵ گشت ، ئەم دابڕانە هۆیەکی کەم نییە ، بۆئەوەی کەبەرهەمی رێبازی شونبرگ ئیتر بە(بەرهەم ) دانەنرێ میتۆدولۆژیای مۆسیقای نوێ ، دەروناسی مۆسیقایی ، بەرهەم وداهێنەرو بیسەرەکەی دەگۆڕی . واتە بەرهەمی مۆسیقایی ""تەنها وەڵام و رێگە چارانەی رازە تەکنیکیەکانە و دروست کەری مۆسیقا تاقانە کەسێکە کەزانستی دیدەوانی ئەوان و تێگەیشتنی مۆسیقای خۆی هەیە " . ئەم وەڵام و رێگە چارانە لەجموجوڵی مۆسیقاییدا بەرجەستە دەبن ، کەلەتێڕوانینی ئادۆرنۆ : بەهۆی ئافەرمانی خوڵقێنەری مۆسیقا لەخواستی جیهانی مۆسیقایدا خۆی خودان شێوازێکی دیالکتیکیە . ئادۆرنۆ ئەم شێوازە دیالیکتکیە بەتایبەتی ریشەیی (واریاسیون ) ئەزانێ ، کەخاڵی جوڵەیی تەکنیکی دوانزە

دەنگی (قوتابخانەی شۆنبرگ ) ە . بەبڕوای ئ... مۆسیقا تەنها لەلایەن تەکنیکی دوانزە دەنگییەوە ، دەسەڵاتی خۆی بەدەستدێنێتەوە . بەڵام ئەم مەسەلەیە تەنها بەجۆرێك ڕێی تێدەچێ کەلەم تەکنیکە غەرق نەبێت . لەم ڕووەوە ئەبوایە کە " خوڵقێنەری مۆسیقای دیالیکتیکی، پێشگیری لەدیالیکتیك بکا " . تەنها ڕێگەی پێشگرتن لەبزاوتی‌دیالیکتیکی ئامرازی مۆسیقایی ، ڕەهایەتی کاری مۆسیقایە ، واتە دروستکەری مۆسیقا لە" دەسەڵاتی ڕەها ئامرازێکە ، کە خۆی دروستکەری ئەوبووە " ئەم ئازادییە بەوتەی ئادۆرنۆ لەهێزێکی بیرچونەوەدا دەردەکەوێ کەئەن فیست (Subjctivite) موزیکاڵ دروستکەری مۆسیقا لە "لایەنی ووردی بەرهەم کەلەیادەرەری هەمیشە ئامادە لەخۆیدا هەڵکەوتووە" دائەنێ . بەم جۆرە شۆننبرگ سوننەتی مۆسیقای بەناوی "ئامادەی فەرامۆشکراو " لەلایەن "تەکنیکی فەرامۆشی" خۆی زیندوو دەکاتەوە. مۆسیقای نوێ وەك "حەقیقی ترین شووشەیە (بتری‌یە )لەدەریا " ئێش و ئازاری پڕوپوچی جیهانی سەرگەردان و وونکراو لەفەرامۆشی ڕەهای خۆیدا ئەوازش دەکات .

### 8-سەرەتای تارلوگە

نوێکردنەوەی شۆننبرگ لەبواری مۆسیقادا بەسەدەی درەوشاوە لەخوڵقاندنی هونەر لەسەردەمی ڤالیمار لەقەڵەم ئەدرا . بەڵام ئەم نوێ کردنەویە لەبۆچوونی ئیزامی فیکری ئایدیۆلۆژیای میللیگەراو پارێزگارانی وەك ناسیونال-سوسیالیستی هیتلەری کەسنووری مۆسیقای خۆی لە شێوەی ڕۆمانسی ئەڵمانیا ئەبینێتەوە ، وەك شێوازێکی داتەپیو لەهونەردا لەبەرچاو ئەگیرا کەپێش گرتنی ئەبووە ، کاری بنەرەتی سیاسەتی کەلتوری رایشی سێیەم . لەلایەکەوە بەرەسەن یەهودی بوونی (شۆننبرگ ) یش ، وەك زۆربەی هونەرمەندان و بیرمەندانی یەهودی ئەو کات ، دەکەوێتە بەر مەترسی گیانییەوە . بەڵام شۆننبرگ لەویەهودیانە بوو کەچارەنووس ئەوی کەیاندە شوێنێ ، کە دورخرایەوە بۆیەکێ لەئوردوگاکانی نازی . ئادۆرنۆش هەر وەك شۆننبرگ و هاوبیرانی فرانکفۆرتی خۆی ڕێگەی تارلوگەی هەڵبژارد . بەڵام درەنگ تر لەوانی دیکە ڕویشتە ئەمریکا . چونکە کە لە ساڵی 1934 ، واتە ساڵێك دوای هاتنە سەرکاری هیتلەر ، بەرەو بەریتانیا سەفەری کرد و ماوەی چوار ساڵ لەمورتون کالگ لەشاری ئوکسفۆرد خەریکی

لێكۆڵینەوە بوو . لەو لێكۆڵینەوانە "نامەیەك لەبارەی مۆسیقای ڤاگنەر " كە ئادۆرنۆ دواتر تەواوی كرد . ئادۆرنۆ لەسەفەرێكی كورت كەلەمانگی شەشی ساڵی 1937 ڕۆیشتە نیویۆرك و بەهاوكاری هۆركهایمەر و هەندێكی دیكە لەهاوكارانی "ئەنیستیتوی لێكۆڵینەوەی كۆمەڵایەتی فرانكفۆرت"بە تەحقیقی هەل ومەرجە شیاوەكان بەكاری توێژینەوە لەئەمریكا خەریك بوو . ئەم هەل و مەرجانە بەرادەیەك بۆ ئەو لەبار و باش بوون كەئادۆرنۆ لەڕۆیشتنی بۆ ئەمریكا دوابریاری خۆی دا . ئادۆرنۆ لەشوباتی ساڵی 1938 بەپلەی سەرۆكی بەشی مۆسیقای "نوسینگەی لێكۆڵینەوەی رادیۆفۆنیك " پرینستوون (كەلەژێر چاو دێری پۆل لازارزفلد بەڕێوەدەبرا ) دەستی بەكار كرد. ئەمە سەرەتای قۆناغی تاراوگەی ئادۆرنۆ بوولەئەمریكا . تاراوگەیەك كە ڕێگەی قۆناغێكی نوێ لەڕەوتی گۆڕانی فیكری ئەندامانی دیكەی "قوتابخانەی فرانكفۆرت " كردووە

پەراوێزەكان :

() ئەم وتارە لەساڵی 1982 لە پاریس نوسراوە .

2- ئەم وتارە لەساڵی 1940 لەنوسینگەی لێكۆڵینەوە رادیو فۆنیە دانشگای پرینستون بەشێوەیەكی شەلەعی لەلاین ئادۆرنۆ خوێنرایەوەولەساڵی 1945 چاپ كرا.

3- "وتار لەسەر ڤاگنەر لەساڵی 1937-1938 نوسراوە ولەساڵی 1952 لە فرانكفۆرت چاپ كرا"

4-كۆمەڵەیەكی نێو دەوڵەتی بۆ مۆسیقای نوێ لەم سەرچاوەیەوە كراوە بە كوردی - مدرنها - رامین جهانبگلو تهران : نشر مركز، 1376

# زیندان.. پرۆسەی سڕینەوەی خود..

کاسترۆ مەجید

**ڕەنگە** سەرەتایەکی پێویست و دەوڵەمەند سەبارەت بەبابەتێکی وەك (زیندان) کە زەقترین و بەرچاوترین پرۆسەی دژە ئینسانییە، کارێکی ساکار نەبێت، ئەویش چونکە قسەکردن لەچەند ڕوێکەوەیە، لەڕووی پرۆسەیەکی ئاوا تۆقێنەردا هەمیشە پرسیار و تێڕامانیترو قوڵبوونەوەی دیکەمان لەبەردەم زیاد دەکاتو ب... امیش کۆمەڵێك پرسیار بێوەڵام دەمێننەوە، چونکە هەر کاتێك کەباسی(زیندان) دەکرێ، ئەوا ڕاستەو ڕاست زیندانی ئینسانەکانمان دەخاتەوە یاد..زیندانیکردنی خەون و ئایندەی ئینسان بەرلەجەستەی.ئێمە لێرەدا خۆبەدوور دەگرین لەسەر جیاوازی زیندانەکان لەڕووی شەرعیەت و ناشەرعییەتی کەسی زیندانیکراو. خۆبەدوور دەگرین لەوەی دەسەڵاتەکان پۆلێن بکەین بەسەر دەسەڵاتێکی تۆتالیتاریی یاخود دیموکرات. لەجیاکردنەوەی جۆری دەسەڵات و فەلسەفەی دەسەڵات ، ئەگەرچی لەڕووی سەردەم و مێژووی سەدەجیاوازەکان مامەڵەی حوکمڕانەکان بەڕووی زیندانەکان قۆناغی جیاواز جیاوازی بەخۆیەوە بینیوە، بەڵام هەموو ئەم جیاوازییانە حەقیقەتی کەسی زیندانی ڕەتناکاتەوە ئەو حەقیقەتەی کە هەمیشە سزای زیندان دروشمێکی زەقی گوتاری مانەوەی ئەو دەسەڵاتانە بووە. هەروەها هەوڵمانداوە بەپێی بوار توخنی کەسی زیندانکراویش نەکەوین، پۆلێنمان نەکردوون بەسەر موستەحەق و ناموستەحەق، تاوانبارو بێتاوان، شۆڕشگێڕ و نیشتیمان فرۆش. هەوڵمان نەداوە جیاوازی کەسی زیندانیکراو لەڕووی کۆمەڵایەتیو سایکۆلۆژی و هەروا ڕۆشنبیرییەوە بخەینەڕوو، مەبەستمان نییە کە کەسی نیشتیمانی و نانیشتیمانی بخەینە ناو گۆمێکی مەلەکردنەوە،

مەبەست ئەوە نییە زیندانیکردنی منالێك لەسەر دزینی پارچەیەك كێك(بسكویت) لەگەڵ دزینی سەروەت و سامانی نەتەوەیەك هاوجۆربكەین، یاخود نرخ و بەهای زیندانییەکی سیاسی لەکەسێکی نیشتیمان فرۆش بەرزتر راگرین و جیاوازیان بۆنەهێڵینەوە، یان زیندانێك وەك ئەوەی لە هەیئەی کەرکوکدا هەیە و لەگەڵ زیندانێك وەك ئەوەی لە کوردستاندا دەبیندرێت نێوانیان بسڕینەوە، بەپوختی دەمەوێبڵێم کە مەبەست لێرەدا بەهیچ جۆرێك بۆ نرخکردنی ئەو جیاوازییانە نییە.

من لەم باسەدا سەرەڕای ئەو جیاوازییە زەق و گەورانەی کەناکرێ هەر لەبنەڕەتەوە بەراوردکاریان بۆ بدۆزمەوە، لەگەڵ ئەمەشدا هەوڵمداوە لەسەر ئەو رستەیە کاربکەم کە"کەسانێك لەناو زیندانەکاندا پێیان دەگوترێ مرۆڤ" بەمانایەکی دیکە : ئەم خوێندنەوەیە لەراستیدا هەوڵێکە لەدوای پرۆسەکەوە دەستپێدەکات. ئەو مەوداو هۆکارانە جێدێڵێ کە دەبێتە هۆی فڕێدانی کەسێك/ ئینسانێك بۆناو ژوورە تاریکەکانیزیندان. هەوڵ دەدەم رادەو شێوازی کاردانەوەی ئەم پرۆسە خەتەرناکە (پرۆسەی زیندانیکردنی مرۆڤ) بەسەر لایەنە سایکۆلۆژیو جەستەیی و رۆحی کەسی بەندکراو ئاماژە پێبدەم. چونکە هەمیشە لەم مەودایانەداو بەکردن و لەبیرکردنی(ساتی ئێستا)ی ئینسانەکان لەلایەن دونیای نوێوە رووبەروومان دەبێتەوە، ئەم وتەیەی هایدگەر هەرلە بنەڕەتەوە بۆنی مەیلێکی ئینسانی بەرزی لێدێ. ئەو فەلسەفەیەی کەوا ئینسانەکان دەخاتە سەنتەرو چەقی گەردوون بەمەبەستو بە وشیارییەوە بەهۆی شیکردنەوەیەکی میتافیزیکیانەی وجودا، هەروا لەگەڵ توانای ئازادکردنی تواناکانی و دابینکردنیپێویستییەکانی ژیانی تاکە کەس*لێرەوە ناچار دەبین لەو شێواندنو وێرانکردنی دونیای دەرەوەو ناوەوەی ئەو ئینسانانە وردبینەوە.. رابمێنین لەوەی ئەو دونیا تازەیە چ خێوەتێکی چڵکنو نامۆی خستۆتە ئاسمانی ئینسانەکانەوە . یەك لەو قێزەوەنترین میکانیزمانەی کە بەهۆیەوە دەسەڵاتێك پێیوایە عەدالەتی کۆمەڵایەتی لە رێگەی زیندانەوە دەستەبەر دەکات، لێرەوە دەسەڵات هەمیشە بە حوکمی حوکمرانیەتی خۆی،زیندانو سزای زیندان لە دەرەوەی خۆیدا بە کاردەخا،بەواتا ئەگەر تاکێك لە رووی مافی هاوڵاتیبوونەوە کۆمەڵێك مافی پێبدرێت ئەوا هەر بەهۆی هەمان

بەخشینی ئەو مافە سەرەتاییانە سزای زیندانی و زیندانیکردنی هاوڵاتیەك دەبێتە مافێکی سەرەتایی دەسەڵات خۆی .

زینـدان وەك پرۆسـەی مـەرگێکی هێواش بەسـەر جەسـتەو نـاخی ئینسـانەکاندا پیـادە دەکرێت ، کە یەکێکە لە چالاکترین میکانیزمەکانی گوتاری مانەوەی دەسـەڵاتگەرایی . لـە هەمان کاتدا هەوڵێکی لەمێژینەو درێژخایەنە کە بەیەکجار دوو خواستی بنەڕەتی لە دوو کۆمەڵگای جیاوازدا لەخۆ دەگرن ، یەکێکیان دەکەوێتە نێو بازنەی ئەو کۆمەڵگا تەقلیدیانەی کە تیایدا دەسەڵات لە سەر بونیادی سزادانی جەسـتە دامـەزراوە ، ئەوەکـەی دیکـەش لـە چەشنی ئـەو کۆمـەڵگا مۆدێرنانـەن کە تیـایدا هـەمان سزا بـە سزایەکی دی دەگۆڕێتـەوە کـە زۆرترین وێرانکردن و لەناوبردنی وجودی ناوەوەی ئینسانەکان لە خۆ دەگرێت.

ئەم دوو خواستەش لەلایەك دەبنە بنەماو کۆڵەگەیەك بۆ بانگەشەو بیـانوی یاساو نەتـەوە پارێزی ، لەلایەکی تر هەر بەهۆی هەمان شەرعیەتەوە( کەزۆر جار لەلای خودی تاکەکانـەوە پشتگیری لێدەکرێت ) هەوڵی بەردەوامی ئـەو دەسـەڵاتە دەخرێتـە پێشـەوەی ئامانجـەکان. بـەواتا ئـەم پرۆسـەیە لەبنــەڕەتدا پرۆسـەیەکی دووفاقییـەو لەیـەك کـاتدا بەسـەر کەسـی بـەندکراودا دەسـەپێندرێ. زینـدان هەمیشـە ئـەو ڕێگەچارەیـە بـووە کـە تـا ئێسـتا گـەرای درێژخایەن و بەتەمەنی خۆی لەناو هەناوی هەردوو جۆری کۆمەڵگادا خستۆتەوە. سزایەکی ئەفۆتیریانەیە ڕووبێکـی لـەناو دەسـەڵاتە تەقلیدیەکانـەو ڕووەکـەی تـری لـەناو دەسـەڵاتە مۆدێرنـەکاندا توندکـردووە. ئـەو خاڵـەی کـە بە نـەگۆڕیش دەمێنێتـەوە، خـاڵی هاوبەشـی ئینسـانەکانە، لێرەدا بـەر لـەوەی چـەمکی دەسـەڵات و دەسـەڵاتگەرایی لـەو دەسـەڵات و کۆمەڵگایەی کەزۆرترین ڕووبەری تۆقاندنی لەڕێگەی زیندانەوە پیادەی دەکات بخەینەڕوو. هـەوڵ دەدەم چـەمکی دەسـەڵات لای بیرمـەندێکی وەك "گرامشـی"* دەربخـەم بـۆ ئـەوەی پەیوەندییـەك بدۆزمـەوە لەچۆنیـەتی پیـادەکردنی ئـەو سـزایەو بەسـتنەوەی بـەو تـێز و فەلسـەفانەی کە کـاتێك باس لـە دەسـەڵات دەکەن ، ئەوا ناتوانن لەبازنـەی مـاڵ تاکەکانـەوە دەرچن.

یەکێك لەبنەماکانی دەسەلأت لای گرامشی پەیوەندیدارە بە چەمکی (هەژموون) کە لە-ڕێگەیەوە دەسەلأت خۆی دەخزێنێتە نێو پەیوەندییە جیاوازەکانەوە. دەوڵەت، حیزب، کۆمەڵی مەدەنی بەلأم ئەم هەژموونە لەڕێگەی ترس و تۆقینەوە وەکو بنەمایەکی دەستپێکردن دەسەلأتی خۆی بەرهەم ناهێنێت، بەڵکو هەوڵ دەدات هێزە کۆمەلأیەتیەکانی دیکە تێڕوانینەکانی قبوڵ بکەن. هەژموون ئەو ئەڵقە گرنگەیە کەبەهۆیەوە کە کامە دەزگاو حیزب دەتوانن دەسەلأت بگرنە دەست، هەر بۆیە هەمیشە پێویستی بە میکانیزمێکە کە بەهۆیەوە ئەمانیکی ڕۆحی و ئایدیۆلۆژی لەو کۆمەڵگایەدا دەستەبەر بکات بەبێ بەکارهێنانی ئەو هێزەی کە هەوڵی کۆنترۆڵکردنی کۆمەڵگا دەدات لەڕێگای حیزب یان دەسەلأتی دەوڵەتەوە. .هەربەهۆی ئەم ڕێگەیەشەوە نەك هەرتەنها زیندان لەکۆمەڵگایەکی وەك ئێمەدا شەرعیەتی لەلایەن دەسەلأتەوە بۆپارێزراوە، بەڵکو بەهۆی کۆنترۆڵکردنی ئینسانەکان بەوەدەی یاسا پارێزییەوە. جارێکی دیکە هەمان شەرعیەت لەلای خودی ئەو تاکانەوە دەبەخشنەوە بە(سزای زیندان) چونکە سزای زیندان سزایەك نییە لەگەڵ دامەزراندنی چوارچێوەو قەوارەی دەوڵەتێکەوە بیری لێکرابێتەوە، بەڵکو بەر لە دامەزراندنی ئەو سزایە لەلایەن دەسەلأتەوە، هەروەها، تاکەکان/ ئینسانەکانی لەناودەوەرا پێویستی دامەزراندنی سزایەکی لەم جۆرە بەیەکێك لەگرنگترین و کاراترین هۆکاری دامەزراندنی خودی دەوڵەت و ئەو قەوارەیە دەبینن.بەواتایەکی دی: تاکەکانی دەسەلأت و قەوارەو دەوڵەت و نەتەوەیەك، کە لەبنەڕەتدا لەسەر فەلسەفەی سزای جەستەو دەستەمۆکردنی کەینونەی ئینسانەکان لەناودەوەرا بەدەسەلأت پەرستی پەروەردەکرابێ. ئەوا ناتوانن بەبێ ئەو سزایە توخنی دیموکراسیەت بکەون و ناوی بێنن، تەنانەت لەو باوەڕەدان کە بۆ چەسپاندنی خودی دیموکراسیەت پێویست بەزیادکردنی سزاکان و زۆرکردنی ژوورەکانی زیندان دەکات.

ئەمەش بێ چەندوچوون دەمانباتەوە سەر خاڵی ئەوەی کە لە کۆمەڵگای ئێمەداو لەدوای ڕژێمی بەعسەوە ئەم پەتایە ڕێك وراست خۆی خزاندۆتە نێو هەناوی ئەزموونی حیزبە کوردییەکان و دواتریش بۆ ناو کۆمەڵگاکەمان لەدوای ڕاپەڕینەوە.. چونکە ڕاپەڕین نەیتوانی ڕاپەڕینێکی دیکەی جۆری لەناخی کەسایەتی کوردیدا هەڵگیرسێنێ و کەسایەتیەکی تر

بەرهەم بێنن کە سەراپای لەبۆیەی مازۆشیەت هەڵنەبژێرابن. دەتوانین بەنموونەی یەکجار ساکار ئەم دەستەواژەیە روون بکەینەوە

سادەترین کەس، هەمیشە دەبینێ چۆن تاکەکان هاواری فریادرەسیانە بێت و دسپلینیان بکات. هەمیشە لەدەست کەس و نەبوونی پۆلیس و ئاسایش و زیادکردنی بنکە و رێکخراو و کۆمیتەکانەوە داواکارییەکانیان دەخەنەروو. هەمیشەلایان وایە ئەو گەڕەکەی مەخفەرێکی پۆلیسی زیاتری تیا بێت، ئەوا پاسایەکی جوانتر بەڕێوەی دەبات. ئەو خەڵکە هەمیشە لەهەوڵی زیادکردنی مزگەوتەکانەوە وەکو(باوکێکی رۆحی) دەست پێدەکەن و بەهەوڵی بەهێزکردنی دەزگاچاودێریکەرەکانەوە (باوکێکی جەستەیی) کۆتایی دێنن.

ئەم جۆرە نموونانە رەنگە لە رووکاردا ساکار بێنە بەرچاو، بەڵام لەجەوهەردا هەڵگری درێژکەردەی ئەو دەسەڵاتپەرستی و مازۆشیەتەیە کە کۆمەڵگایەکی نەخۆش و وێرانی بەرهەم هێناوە و پێی وایە هەمووکات فەرزاو گێرەشێوێنی لەدەرەوەی گورزەکانی دەسەڵات خۆی حەشارداوە.

لەکۆمەڵگایەکی لەم جۆرەدا کە حیزب باڵادەستی خۆی بەسەر بریارو تەراوی چارەسەرییەکاندا سەپاندبێ، ئەوا هەر لەرێگەی ئەم دەسەڵاتەوە بریارەکانی خۆی رادەگەیەنێ . لێرەشدا ئاساییە کە لە کۆمەڵگایەکی لەم جۆرەدا هەمیشە زیندانەکان بەرووی هەمان ئەو خەڵکانەدا ئاوەڵا بێت کە سیمبوڵی دامەزرێنەری ئەو زیندانانەن. ئەم شەرعیەت بەخشینەش بەشێوەیەکی بەرچاو بەبیانوی پاراستنی کەلتوور پاسئاوی بۆ بەرهەم دەهێندرێ، کە لەراستیدا خەتەرناکترین بیانوە، چونکە بریتییە لەو پرۆسەیەی کە راستەوخۆ لەنێو کۆمەڵگاوە بەردو ناو هەناری دەسەڵاتەوە دەگوازرێتەوە. وەکو بیانوی شکاندنی سنوورە موقەدەسەکان. ئایین، سێکس، سیاسەت.

لێرەوە هەوڵ دەدەم بچمە نێو وردەکارییەکانی سزای زیندانەوە کەبەسەر کەسێکدا پیادە دەکرێت لەم رێگەیەوە دەخوازم شیکارێکی سایکۆلۆژیانە بەسەر ئەو پەرچەکردارانەدا بدۆزمەوە کەچوار دیوارو قفڵێکی ژەنگاوی، دەیان پۆلیس چاودێرو جیاوازکردنەوەی کەسەکانی زیندان لەکۆمەڵگاو دەوروبەردا بەرهەمی دێنێت.

"زیندان" ئەو پرۆسە جودا خوازەیە کە سنوورێکی بەرنەسك، سنوری دیوارێکی ئاسنین ،دوو جیهانی یەکجار جیاوازو نامۆ بەیەك، لەیەکتر دەترازێنێ و ئینسانەکان بەسەر دوو (مـن)دا دابەش دەکات. کاتێك دەسەڵات سنورێکی فیزیکی-مەعنەوی، بۆ لەتکردن و جیاکردنەوەی دەنگەکان دادەمەزرێنێ، ئالەوێوە ئەم سنووره مرۆڤەکان دابەش دەکات بەسەر دوو جەمسەری ناکۆك، جەمسەرێك پێیوایە کە تەواوی دەزگاکانی دەوڵەت و کۆمەڵگا دژایەتی ئەو وەك(تاك) دەکەن، لەکاتێکدا جەمسەرەکەیتر رەوایەتی تاکێتی خۆی لەوەدا دەبینێتەوە پێوایە کە لەدەرەوەی زینداندایە، ئەوا تاکێکی سودمەندو ناکۆك نییە لەگەڵ بنەماکانی کۆمەڵگاو دەوڵەت، هەمیشە کەسانی دەرەوەی زیندان- دونیای ئازادەکانە(بەباوەڕی ئەوان) ئازادییەکەشیان لەو خاڵەوە دەسپێدەکات کە زیندانیی نین و فڕێ نەدراونەتە ناو سنورو دیواربەندێکی بەرزو چواردەوریان بەپۆلیس و پیاوانی دەوڵەت نەتەنراوە..هتد.. کەچی کۆیلایەتی و بەندکراوی زیندانەکان لەو خاڵەوە دەستپێدەکات کەچیتر ئەوان ئازادنین و فڕێ دراونەتە نێو شورەی بەندیخانەکانەوەو ناتوانن ئازادانە بدوێن و بجوڵێن.. کەوابێ ئەو دوو جیهانە هەمیشە لەشەرێکی بێدەنگ و کپی نابەرامبەردان.. واتە هەمیشە ماناکانیکەسێکی زیندانیکراو بەهۆی کەسێکی ئازادەوە کە لەدەرەوەی زینداندا ژیان دەباتەسەر بەدەردەکەوێ و بەپێچەوانەشەوە..کەسێك لەناکاو بەرەو زیندانەکان راپێچ دەکرێ.. هەر لەوساتەدا پرۆسەی بچووککردنەوەو سرینەوەی کەسەکە دەسپێدەکات.. سەرسوڕمانی کەسی قۆڵبەستکراو لەوساتەوە دەکەوێتە نمایش، کەلە هەردوو لاوە قۆڵەکانی بەکەلەپچەیەکی دەپەنجەیی دوو پۆلیس توند دەکرێ.. لەراستیدا ئیدی ئەوکەسە رووبەرووی راستیەك دەبێتەوە کەلەلایەن تەواوی هێزو دامو دەزگاکانی دەوڵەت و کۆمەڵگاوە دەستگیرکراوەو ئادەکاتە ئەوەی بەزۆیی هەست بەدژایەتی کردنی دەوڵەتێك بکات لەرووی تەنها( تاکێك)ەوە..هەر ئەم هەست کردنەش کە لەوساتەدا کێش و جەستەی گیراوەکە یەکسان دەکا بەسفر، لەناخیشیدا کەسایەتی دوولەت دەبێ بەسەر دوو ئاراستەی جیاوازو ناکۆك.. کەئاراستەیەکیان دەچێتە ریزی کەسایەتی بەرامبەر/ دژ، چونکە لەوساتەداو لەناخی خۆیدا هێزو ئاراستەیەکی ئەنتی خود لەرووی خۆیدا دروست دەکاو

جۆرێك لەشیزۆفرینیا كەسایەتییەكەی دەكاتە دوو لەتەوە.. یەكێكیان دەخرێتە بەردەم ئەو راستەیەی كە ئیدی (ئەو) تاوانبارە.. ئەوەكەی تریش بەردەوام لەو سەرسوڕمانە تۆقێنەرە دەخولێتەوە كەناتوانێ هەرگیز وێنای ئەوە بكات كە تەواوی كەسایەتی و خەون و حەزو ئایندەی دەخرێتە ئەودیو سنووری دیوارێكی بەرزەوە، كەوابێ ئەوكەسەی كە بێدەنگی لەگەڵ(دەسەڵات–پۆلیس) رێگەی زیندان دەگرێتەبەر، لەراستیدا ئەو پارچەیەیە كە وێنای تاوانبارێكی لەرووی‌خۆیدا نەخشاندووە كە كەسە تاوانبارەكەیە.. هەربۆیە بڕیاری زیندانی كردنی پارچەی یەكەم بڕیارێكە هاوجۆرە لەگەڵ بڕیاری دەسەڵات.. بەواتایەكی تر:كەسێك لەزینداندا تاوەكو هاوسەنگی و گونجانێك لەگەڵ ئەو ماوەیەی زینداندا دەیباتەسەر لەرووی دەروونییەوە دەستەبەر بكات، ئەوا دەبێ پێی وابێ كە بەجۆرێك لەجۆرەكان باجی هەڵەیەكە دەیداتەوەو حوكمی زیندان بەرووی خۆیدا بەجۆرێك لەرەوایەتیدا دەبینێتەوە.. بەڵام پارچەكەی تری كەسایەتییە زیندانیكراوەكە كە (بێتاوانەكەیە) ئەوا ناتوانێ وەكو كەسێك وێنای خۆی لەناو وڵاتێكی بچووكدا بكات كە(زیندانە). خەون و وڕێنەی شەوان و هەڵڕشتنی ئاخ و سكاڵای یەك بۆ ئەویتر لەناو زیندانەكاندا بەروونی نموونەی ئەمەیە.

كەسی بەندكراو لەساتەوەختی گەیشتنیدا بۆ بەردەم دەرگای گەورەی زیندان، ئیدی فڕێ دەدرێتە نێو جیهانێكی‌تر .. جیهانێك تیایدا هەرچی مومارەسە جەستەیی و رۆحی و كەسێتییەكانی خۆی هەیە ، لەوێوە پوچەڵ دەبێتەوە..بەتاڵكردنەوەی فەردانیەتی زیندانی و خزاندنی بۆ نێو جیهانێكی نادروست بەئینسان، لەگەڵ داماڵینی پشتێن و قایش وقەیتانی پێڵاو و خاڵیكردنەوەی گیرفان و پشكنین و تێڕامانی هەموو كەرەسەو كەل‌وپەلێك كە پەیوەندیەكی راستەوخۆیان بەكەسایەتی زیندانییەوە هەیە، دەسپێدەكات.

داماڵینی قایش و پشتێنی زیندانی، ئەگەر هەر پاساوێكی دیكەی یاسایی و ئەمنی ببەخشێت، بەڵام لەناوەوە تێڕامان و ووردبوونەوەیەكی قوڵی سایكۆلۆژی لەدواوەیە. كەبەهۆیەوە قورسترین و كاریگەرترین گورزی دەسپێكە دەدرێ بەناوچاوانی زیندانیداو شەپازلەیەكی ورياكەرەوەی ئەوتۆیە كەهەر لەبەر دەرگای بەندیخانەوە پێی دەوترێت:" تۆ چیتر ئەو ئینسانەی دەرەوەی زیندان نیت، كەسێكی ئێمە سەرلەنوێ داتدەرێژینەوە."

داماڵینی قەیتانی پێڵاو ،داماڵینی خەیاڵ و توانای ئازادبوون و خۆدەربازکردن دەگەیەنێ، بەستنەوەیەکی سایکۆلۆژیانەو موعتادکردنێکی راستەوخۆیە لەوەی کە هەمیشە بەنیگایەکی ئیفلیجانە بڕوانێتە توانای جوڵەی قاچەکانی و، لێسەندنەوەو زەوتکردنی بیرکردنەوەیە لەفەردانیەتی خۆی،کەوابێ هەموو هەوڵەکان لەراستیدا دەچێتە خانەی سڕینەوەو جیاکردنەوەی تاك لە کۆمەڵگا و چاندن و موتربەکردنی جۆرێك لەمەرگدۆستی لەنکاوڕا لەناخیدا بەرهەم دێنێت.

کەسی زیندانی لەرێگەی نیگاکردن و تێرامان لەباری ناوەوە وەکو کەسێکی ئازاد و لەگەڵ تێرامانی لەحاڵەتی دەرەوە- جەستەی خۆی وەك بەندیەك، ئەوا هەمیشە دەکەوێتە بەردەم بەرابەرکردنی دووجیهانی دژبەیەك و نامۆ لەناخیدا، دواتر هەستی بەناسایی بوونی خۆی لەدەست دەدا، داماڵینی قەیتانی پێڵاو و قایشی کەمەری، سوکایەتی پێکردنێکی دیکەی جۆرییەو دابەزینی تواناو دەسەڵاتی تاکە تاسنووری کەسێکی ئیفلیجو زەوتکردنی حوکمرانیەتی وکەرامەتی تاکە بەسەر خود و جەستەی خۆیدا، چونکە بەدوورکردنەوەو زەوتکردنی هەموو ئەو کەل و پەلانە هەڵبژاردنی مەرگیش لەکەسی زیندانیکراو دەسێنرێتەوە. بەدەر لەهەر مانایەك، ئەوا داماڵینی ئەمانە لەراستیدا داماڵینی هەوڵی خودکوژییە لەلای کەسی زیندانییەوە.

لێرەدا(مەرگ) رووبەرووی هێزو تواناکانی دەسەڵات دەکرێتەوە، بەرێگەی خودکوژی.. بەواتایەکی دیکە.. ئەگەر خودکوژی کەسێك لە دەرەوەی زیندان شۆڕشێکی پێچەوانەی وجودیانە بێت لەرووی حوکمی مەرگ و ئەو دونیایەی کە پێیوایە زیندانێکی گەورەیە، هەروا ئەگەر خودکوژی رەتکردنەوەی حەتمیەتێکی ئەزەلی بێت بەرووی خواوەندو سروشت.ئەوا خۆکوژی لەناو زیندانی دەوڵەت. رەتکردنەوەی دەسەڵاتی دەوڵەت دەگەیەنێ و لەهەمان کاتدا بانگەشەی هەڵبژاردنێکی ئازادانەیە کە تیایدا هەرچی مومارەسەیەکی دەسەڵاتگەرایانەی سەپێنراو هەیە بەسەر تاکدا پوچەڵ دەکرێتەوە، چونکە خۆکوژی بەر لەوەی نەفی کردنی خود بێت ئەوا نەفی کردنی(ئەویتر)ە..کەوابێ لەهەموو حاڵەتەکاندا

هەوڵی خۆکوژی لەزیندانێکدا هەوڵی فڕینە بۆ ئەودیوی سنوورەکانی دەسەڵات، بەمەش جۆرێك لەسوکایەتی کردن لەرووی ئەو دەسەڵاتە نیشان دەدا.

لێرەدا هەوڵ دەدەم لێکچوونێك لەنێوان دەسەڵاتێکی زەمینیو لەنێوان دەسەڵاتێکی ئاسمانیدا بخەمەڕوو، بەوەی کە هەریەکێکیان ئەفیکردنی خود لەسەر حیسابی جەستە بەجۆرێك لەیاخی بوون و رەتکردنەوە لەقەڵەم دەدەن، تەنها ئەگەر ئەو خۆکوژییە ئەکەوێتە دەرەوەی بازنەی بەرژەوەندیە ماددیو رۆحییەکانەوە. بۆنموونە، دەسەڵاتی دەوڵەت لەژێر ناوی نەتەوەو سنوور پارێزی بۆ هەر تاکێك سەربڵندییە ئەگەر پرۆسەی خودکوژی لەرێگەی خۆتەقاندنەوە بۆزیان گەیاندن بەدوژمن پیادەیکات، وەکو ئەو خۆتەقاندنانەوەی فەلەستینییەکان لەرووی ئیسرائیلیەکاندا دەینوێنن.. هەر بەم شێوەیەش دەسەڵاتێکی ئاسمانیش ئەو خۆکوژییە بەهەوادارانی بە(شەهادەت) دەژمێرێ وەکو ئەوەی لە ئیسلامدا بەرلە هەزاو چوارسەد ساڵو تائێستاش لەژێر ناوی (جیهاد)دا ساڵانە قوربانییەکان لەشیشان و ئەفغانستانو کوردستان و جەزائیر بەسەر یەکدا کەڵەکەدەبن.

کەوابێ دەسەڵات هەمیشە جێگرەوەی حوکمی خواوەندەکانە بەسەر مرۆڤدا، ئێمە کەباس لەهەوڵی سڕینەوەو لەباربردنی کەسایەتی زیندانی دەکەین.. تەنها ئەوەنییە کە ئیدی ناتوانن لەرووی جولەی جەستەییەوە ئازادبن ، هەروا ترسناکی ئەم پرۆسەیە لەوەدانییە کە ئەوانە لەکەمترینو سادەترین مافە سەرەتاییەکانی مرۆڤ بێبەش دەکرێن.. بەڵکو ترسناکی لەوەدایە کە کەسی بەندکراو بەقاراستەیەك تێپەر دەکرێ کە بەقۆناغی(بەشتکردن)ی ئینسانەکان تێدەپەڕێ، ئەو بەشتکردنە لەراستیدا دابەزاندنی نرخ و بەهای مرۆڤانەیانە تا ئاستی کەلو پەلو کاڵا، یاخود گۆڕینەوەی کەسەکان بەژمارە.. زیندانی ژمارە .. ژووری ژمارە.. ژمارە ئەمەندە لەریزی ژمارە.. تاد. کاتێکیش ئەم بە ماتماتیکردنەی ئینسانەکان لەبەندیخانەکاندا پیادە دەکرێ، لەگەڵ خۆیدا ژمارەکان دەخرێنە شوێنی کۆمەڵێك خەونی رەنگاورەنگو ئیحساسی مرۆڤانەوە، کە ئیدی لەوخاڵەوە زیندانەکان خۆشیان لەچەشنی چەند ژمارەیەك لەناو هاوکێشەیەکی جەبری سەختدا دەکەونە هاتوچۆ بەناو داڵان و ژوورو حەوشەی بەندیخانەدا.

يەكێك لەبنەما هەرە گرنگەكانی دەسەڵاتێك كە لەسەر سزای جەستە دامەزرابێت ئەوەیە كە هەمیشە لەسەر زەمینی مەرگدا دەواری خۆی هەڵدەدات، چونكە میكانیزمی كاری ئەو دەسەلاتەو مانەوەی بۆ ماوەیەكی درێژ لەنێو كایەكاندا پێویستی بەو دەست كەلایەیە كەبەهۆیەوە سەنتەر هێزو رووبەری قبوڵكردنی ئەو هێزە لەناو كۆمەڵگەدا فراوانتر بكات. بۆ بەرهەم هێنان و دەستەبەركردنی شەرعیەتی قبوڵكردنی ئەوهێزە لەناو تاكەكاندا ، ئەوا دەوڵەت ناچارە كۆمەلێك كابوس و دوژمنی وەهمی لەخەیاڵیان بچەسپێنێ تا بەهۆیەوە لەو پرۆسەیە بەردەوام بێت و خودی ئەو شەرعیەت پێدانەش لەكۆمەڵەوە بۆ لای خۆی بگوازێتەوە بەواتایەكی‌دی سزای زیندان ، سزایەكە لەراستیدا شەرعیەت، تیایدا دەكەوێتە دوای زیندانیكردنەكەوە، واتە، ئەوە زیندانیكردنی كەسێكە كە ناچارمان دەكات بكەوینە نێو وردەكارییەكانی دەسەلات سزای زیندانیش بەتەقدیسەوە بەباڵای كەسەكانەوە ببڕین، هەڵەیە واتێبگەین كە زیندانی كردنی كەسێك دوورخستنەوەیەتی لەكۆمەڵگاو لەبێژینگدانی تاكەكانەو جیاكردنەوەیانە، بەواتا زیندانی كردنی كەسێك بەرلەوەی زیندانی‌كردنی جەستەبێت، ئەوا كۆنترۆڵكردنی‌سایكۆلۆژیای كەسەكەیە، ئەم پرۆسەیەش بەشێوەیەكی میكانیكی دەگۆڕێ بۆ كۆنترۆڵكردنی جەستە. چونكە دەسەڵات ناتوانێ لەرێگەی بەندكردنی جەستەی ئینسانەوە تێڕوانینەكان‌و ئەو مەوداو نێوانانە لەنێوان تاكەكان بسڕێتەوە كەدەبێتە هۆی دروست بوونی كەسێكی ناكۆمەڵایەتی ولەگەڵ كەسێكی كۆمەڵایەتی، دەسەڵات ناتوانێ دەستنیشانی هۆكارو ئەوفاكتەرانەبكات‌و پرسیار بكات كە بۆچی لەگەڵ هەموو جۆرە پێشكەوتنەكانەوە هەمیشە دەبێ لەخەمی زیادكردنی زیندانەكاندا بێت. دەسەلات هیچ كاتێك ناتوانێ لەداخوازی‌و ناتەواوییەكانی ئینسانی سەردەم لەرووی رۆحیەوە تێبگات، چونكە دەسەلات هەمیشە رۆبۆتێكی زەبەلاحە بەسەر كۆمەڵگاوە كە بەپێی بەرنامەرێژی كار لەسەر ژیان‌و ئەخلاقیەتی تاكەكان دەكات.

هیچ كاتێك دامەزراندنی كۆمەڵگایەكی عادیلانە بەئەرك‌و كاری خۆی نازانێت خۆی تێكەڵی دیاردەی بێكاری ناكاو لەمنداڵانی‌سەر شۆستەو نێو كۆڵانان و شەقامەكان بەرپرسیار نییە.

هەرچەندە ئەمانە لەرووکاردا دیاردەیەکن تەمەن درێژترو لەمێژینەترن، لەتەمەنی راپەڕین، بەڵکو ئەم پاساو خولقاندنەی بەهۆیەوە دەرگای زیندانەکان بەرووی کەسەکاندا ئاوەڵاتر دەکاتەوە لەراستیدا پاساوێکی ئەخلاق بەعسییانەیەو گەراکانی خۆی لەوسەردەمەدا خستۆتەوە. بەڵام لەتێکەڵ کردنێکی خەتەرناک و لەئەنجامی کەم ئەزموونیدا کەم جار دەسەڵاتی کوردی توانیویەتی ئەوەی کە بەر لەراپەڕین رووی داوە دووبارەی نەکاتەوە.. هەمیشە بنەماو پرەنسیپەکانی حوکمی زیندان درێژکردنەوەی ئەو شێوازە بەعسیانە بووە، کەبەر لەراپەڕین بەشێوەیەکی دڕندانە جێبەجێ دەکرا، لەگەڵ ئەمەشدا هەمان زەمینەی کەشەرعیەتی زیادکردنی زیندانەکانی بەر لەراپەڕینی دەخولقاند، ئەوا دەسەڵاتی کوردی دێت نەک هەر رەتی ناکاتەوە بەڵکو لەو باوەڕە دایە کە (رژێمی بەعس) شتێک نەبووە جگە لە دەوڵەت و قەوارەیەک بەناوی(عێراق)و پێیوایە ئەو یاسایەی بۆشتێکی دیاریکراو دارێژراوە دەشێ ئێمە وەکو( دەوڵەتێک) هەمان یاسا پیادەبکەین.. سەیرکەن چۆن لەسزاکانی زیندانیکردندا هەمان ماددەو بڕگەو بنەماکانی وەکو خۆی کاری پێدەکرێت.

لەوساتەی کە کەسی زیندانی دەکەوێتە نێو دیوارە ئەستوورو بەرزەکانیبەندیخانە، ئیدی هەر لەوێوە پێویستیەکی ویژدانی لەئەخلاقیەتیدا سەرهەڵدەدا ئەو کە ناتوانێ جەستەی لەو سنوورە بخاتە ئەودیو ، ئەوا ئەو پێویستیە ئەخلاقییە هەمیشە خەیاڵی و هۆشی دەخاتە باڵەفڕە ..فڕین بەرەو دونیایەکی تر .. دونیای دەرەوەی زیندان. کەسی زیندانی هەمیشە لەهەوڵی پەیوەندیکردنە بەدونیای دەرەوە، ئالەوێوە پرۆسەی کوشتن و وێرانکردنی ئێستاو ئایندەی دەسپێدەکات و خۆی بەنێو بازنەی رابردووگەرایی دەشارێتەوە. چونکە هەمیشە بەختەوەری لای کەسی زیندانی، بەختەوەرییەکە وابەستەیە لەگەڕانەوە بۆ رابردوو، ئەم گەڕانەوەیەش بەمیکانیزمێکی دیکەی زەینیەوە گرێ دەدا کە (خەون بینیە) ..چونکە زیندان لەنێو بەری ئومێد و خەونی داهاتوی ئینسانە، زیندان یەک لەو ئامرازانەیە کەبە هۆیەوە(دەسەڵات) دەست بەسەر کەینونەی ئێستاو داهاتووی مرۆڤەکاندا دەگرێ و دەیانخنکێنێت، ئەو چیتر ناتوانێ وێنای ئەو دونیایە بکات کە تیایدا دەژی. واتە پرۆسەی زیندانیکردن حاڵەتێکی ولق وڕمان و توقێنەرە، ئەم واقیوڕمانەش

سەرەتا لەرۆحیەوە سەرچاوە دەگرێ پاشان بەرەو جەستە دەخزێت.پرۆسەی زیندان وێرانکردن و تەکاندنی ئینسانە لەهەموو هەستێکی خۆیە ئینسان زانین. پرۆسەی رووتکردنەوەیە لەهەموو مەرجێکی ئەخلاقی و بەهاوولاتی بوون. زەوتکردنی سەرەتایترین مافی ئینسانە لەرێکردن و بیستن و بینین..ئەم سێ هەستە سنووردار دەکرێ ، بەلام خەتەرناکترین ئەم زەوتکردنانە لێسەندنەوەی چاوە لە دەوروبەر ، زیندان پرۆسەی نابیناکردنێکی جۆریە کەتیایدا بەهۆی بەرتەسکردنەوەی شوێن و کەسەکان دەست پێدەکات . کاتێك دەسەلات دەسەلاتی زیندان سنورێکی دیاریکراو دادەمەزرێنی ، لەگەڵ خۆیدا زیندانێکی دیکەش لە رووی هەستەکانەوە دروست دەکات .. لێرەوە دەگەینە ئەوەی کە ئەگەر ( کوێر بوون ) زەوتکردنی هەستی بینین بێت لە دونیای دەرەوە ، واتە ئەگەر نابینایی وێرانکردن و لەبەین بردنی بینین بێت لە دەوروبەر ، ئەوا ( زیندان ) پرۆسەی نابیناکردن و زەوتکردنی دەوروبەرە لە چاو ، کەوابێ زیندان هەرتەنیا مەرجێك نیە لە داگیرکردنی ئینسان و دابڕکردنی لە دونیای دەرەوە ، بەڵکو هاوکات زەوتکردن و داگیرکردنی دونیای دەرەوەیە لە کەسی زیندانکراو .

سەرچاوەکان

*الانسان و الموت عند هيدجر ، د. عبدالرحمن الدلودي ، ستروس، فوكو .

*دەسەلات و جیاوازی ،مەریوان وریا قانع .

*نابینەی وەهم ، سیگموند فروید ، و: ئاوات ئەحمەد .

*دەروازە ، چەند تێکستێکی وەرگێردراو ، هەڵکەوت عەبدوڵلا .

# پرسی کورد..
# حەقیقەت و مەنفاکانی لەبیرچوونەوە

ئیسماعیل کوردە

**دوان** لەپرسی نەتەوەیەك، نەتەوەیەکی وەك کورد کە بەدرێژایی بوونی بێبەش لەناسنامەی نەتەوەیی و گەردوونی و مرزیی خۆی مامەڵەی لەگەڵدا کراوەو لەوەتەی هەشە خەونی بە ئازادییەکانیەوە بینیوە، لێرەوە ئەوەتا ئێستا لەنێوان وەهم و حەقیقەتدا ، لەنێوان باوەڕکردن و باوەڕنەکردندا ، لەنێوان بەهاکانی نیشتیمانپەروەری و شۆڕشگێری و خیانەتدا بەو نیمچە ئازادییە گوشاوە کە لەهەرێمێکی دووکەرت و نیشتیمانێکی پڕزامدا پێیگەشیتووە، وەلێ هێندە ئاسان نابێ و جێی ئەگەر نییە کە لەوانەیە توانایەکی زۆری بوێت بۆقسەکردن لەم بارو هەلومەرجەو گەڕانەوە بۆ مەسەلەیەکی گرنگی وەك پرسی کورد لەنێو پێشکەوتن و گۆڕانی میکانیزمەکانی سەندنی حەقە نەتەوەییەکان ، لەسەدەیەکی وەك ئەمڕۆ کە لانیکەم لەدونیای دوور لەئێمە سەدەی رزگاری نیشتیمانی و کەلتووری و نەتەوەیی بووە بۆ چەندین گەلی ژێردەستە، لێرەشەوە تەنها بەرۆچوونە نێو ئاسۆو هیواکانی ئەوتاکانەی کە لەو هەرێم یان ئەمیان ،لەو لەتە وڵات یان لەمیان دەژین و هەموو ئەو خەون و ئومێدو یۆتۆپیایانەشی کە نەتەوەیەك لەسایەیاندا دەژی، دەکرێ قسە لەسەر پرسی کورد بەتایبەتی لەو دە ساڵەی دواییدا بکەین، لەم سەرەتایەداو بەپێی گەڕانەوە بۆ مێژوو و رووداوەکانی، ئەو زەمەنەی ئازادیمان بەساتەوەختێك دەزانرێ دووبارەبوونەوەی لەئایندەدا دەکەوێتە بەردەم ئەگەرەکانەوە، قسەکردنیش لەم مەسەلەیە ئەمانباتەوە بۆ گەڕان بەدوای

چەندین مەنفا،مەنفاکانی نیشتیمانێکی بێنایندە، مەنفاکانی نەتەوەیەکی پڕ لەهیوا لەهەمان کاتدا پڕ لەشکست و لەوێشەوە بۆ مەنفاکانی بەحەقیقەت بوونی قەیرانەکان، قەیرانی کۆمەڵایەتی ، سیاسی و ئابووری و تێکشکانی هەموو دەروازەکان و دۆشدامانی سیاسییەکانی وڵات و تاسان بەرامبەر چارەنووسمان، لێرەوە مەنفاکانی پڕکردنەوەی ئێمە پڕکراون لەیادەوەریی و رووداوو شکستەکانی دوێنێی دوور و نزیک ، پڕکراون لەشکستە رۆحی و جەستەییەکان، ئازارەکان بەشێوەیەکن ئەمرۆش نەتوانراوە لەبیریان بکەین ، نەتوانراوە لەشکستەکان فێربین و خۆمان نەبینە ئاراستەکاری شکستەکانمان و نەشبینە سەرچاوەی خەونێك، کە جوانییەکانی وڵاتەکەمان تێکدا، یان تەنها رووە تاریکەکانی رەوشەکە ببینین و چاومان لایەنە گەشەدارەکان نەبینێ، لێرەوە ئەوەی گەرەکمانە لێبدوێین و مەوداو رەهەندەکانی بینینمانە بۆ حەقیقەت،بەڵام ئەوەی جێی پرسیارە کامە حەقیقەت !؟ کە دێینە سەر حەقیقەت بەومانایەی ئەگەر لەسەر پێشینەو پێشهاتەکانی بدوێین، ئێستای لەواقیعدا ببینین ئەوا دەبێ لەحەقیقەت بەر لە بوون بەواقیع و لەدوای بوونی بەواقیع بپرسین، هەر ئەوپرسەشە دەمانباتەوە بۆسەر دەروازەیەك لەدەوازەکان و پێمان دەڵێت بوەستە ئێرە مەملکەتی پرسی کوردە، ئێرە مەملەکەتی قەیرانەکانە، قەیرانێك کە وێرانکەری پرسی نەتەوەیەکی گەڕاو بەدوای شوناسێکی گەردوونیداو نەشیتوانیوە لە گەردووندا لەنێو چوار چێوەیەکدا بمێنێتەوە، لەوڵاتێکی وەکو ئێمە هەرچەند قسە لەسەر قەیرانە کۆمەڵایەتی و ئابووری و کەلتوورییەکان بکەین نیمچە چارەسەریان بۆ بدۆزینەوە، هێشتا ناگەینە ئەم حەقیقەتەی کە ئەڵێن قەیرانەکانی کوردستان ئەمانەی وتمان هیچیان نین بەر لەوەی بڵێین قەیرانەکان سیاسین، لەکوردستانێکی بەسیاسی بوودا، قەیران بەو مانایەی نا کە ئاسۆکانی لێخنن و دەروازەکانی هیوا تەواو دادەخرێن، قەیران بەمانای لەبارچوونی ئازادییەکانمان نا، لەبارچوونی ئەزموونمان نا، وەڵێ هەقیشمانە ترس و گریمانەشمان لەو لەناوچوونانە هەبێ، لانیکەم ئەگەر قەیرانەکان هەروا بمێننەوە، ئەوا شتێك نامێنێ بەناوی پرسی کوردو پرسێك دەبێتە مەنفایەکی وون، لەچوارچێوەی چارەنووسێکی نادیاردا..

ئەگـەرەكانی ئێمـە هەمیشـە ئەگـەرێكن لـەو دەسـاڵەی دواییـدا لەگـەڵیاندا ژیـاوین و لـەمنداڵدانی دەسـاڵ ئـازادی و نـەبوونی ئایندەیـەك هاتوونەتـە وجـود، گریمانـەكان ئاراستەكاری حەقیقەتەكان بوون، ترسیشمان بەردەوام بەشێك بووە لەرووداوە واقیعیەكان، خوێندنەوەیەك بووە بۆ عەقڵی سیاسی كورد و تێڕامانێك لەشكستەكانی و ناشكریێ بێهودە بەسەریاندا تێپەڕین.بۆیە لێرەوە بەكردنـەوەی چەند دەروازەیـەك دێمە قوڵایـی باسـەكە، كە پرسی كوردە لەنێوان حەقیقەت ومەنفاكانی لەبیرچوونەوەدا:

1-لەچوارچێوەی قسەكردن لەسەر پرسی كورد ، هەمیشە حەقیقەت دەمانباتەوە سەر قەیرانەكان و، قەیرانیش حەقیقەتەكانی ئەم پرسە بەرهەم دێنـێ و تێڕوانین و ڕونیایـەكی نوێمان (جاریوا پڕ لە ئومێد یان پڕ لەگومان و ترس) بەرامبەر بەدۆزی كورد پێدەبەخشێ.

2-كـورد وەك نەتەوەیـەكی نیمچـە ئـازاد لـەو دەسـاڵەی ئـازادیدا، كـەمتر سـوودی لـەو ئازادییەی خۆی بینیوە بۆئازادكردنی تاكە ژێر دەستەكانی تری نەتـەوەو ئـەوانی بەمـەنفای بیرچوونەوە سپاردوون.بەومانایەی ئەو ئازادییـەی ئێستا لەهەرێمە ئازادكراوەكـان هەیـە ، ئازادییەك نییـە خـاوەن شوناسـێكی نەتـەوەیی یـان نیشـتیمانی بێـتو هـەموو تاكـەكانی كۆمەڵگای لەخۆگرتبێ.

3-سیاسی و حیزبە سیاسیەكانی كوردستان، لـەم چەند ساڵەی دواییدا، بەقـەد ئـەوەی خەریكی قوڵكردنەوەی مەسەلە نێو خۆییەكان بوون ، لە زەقكردنـەوەی كێشە خێڵەكیـەكان ، كۆمەڵایەتیـەكان وهەرێمیـەكان و حزبییـەكان، مەسـەلەی نفـوز و گـرێ چینایەتیـەكان ، نیـو ئەوەندە بەدەنگ مەسەلە شوناسیەكانی نەتەوەكەمانەوە نەبوون لەسەر ئاستی كەلتووری و نیشـتیمانی و هـاوولاتیبوون و هـاوهیوابوون بـۆ دۆزینـەوەی شوناسـێكی كوردیانـەو كەلتوورێكی گەشەدار.

4-دیموكراسیەت و مەدەنیەت و هـەموو ئـەو بانگەشانەی دەكرێن لەگەڵ زۆری لایـەنی پۆزەتیڤیان و هەموو ئەو هەڵبژاردنە دیموكراسی و نادیموكراسیانەشی كە بەرێوە دەبرێن بەشێك بوون لەستراتیژیەتی حیزبی،حزبـە كوردییـەكان ، نـەك ستراتیژیەتی پرسـی كـورد

لەرۆژهەڵاتی ناوین و لەو شوێنە جوگرافیایەی کە بەوڵاتانی دامێنی زەمین ناونراوە، بەومانایەی خاڵی سەرەکی پرسی کورد کەرزگاری نیشتیمانییە ، خاڵێکی لاوازی بنەمای‌کارو ستراتیژیەتی سیاسی و سیاسییە حزبیەکان و دیپلۆماسیەتی کوردی بووە، لەلایەکی دیکەشەوە کوردو هەرێمە نیدارییەکانی کورد ، بەقەد ئەوەی خەریکی پارێزگاری‌کردنی سنووری دوژمنان و پاراستنی ئەمنی قەومی ئەوان بوون ، نیو ئەوەندە بیریان لە بەرنامەرێژی نەکردۆتەوە بۆ پاراستنی ئاسایش و سنووری نەتەوەیی و کەلتووری‌و نیشتیمانی خۆمان‌و لێرەوە پرسی کورد جگە لەوەی دەبێتە قوربانی ئاردزوودکانی سیاسەتی هەرێمی و ئەزموونی مانەوەی حزبیانەی حزبە کوردییەکان، لەلایەکی دیکە پێم وایە ئەم مەسەلەیە وردە وردە ئەنگێز بووە بەسەر لەدەستدانی شەرعیەتەکانی :نەتەوەیی ، نیشتیمانی بوون‌و،شەرعیەتی شۆرشگێری، کەوایکردووە ئەو حەماسەتەی تاکەکانی کۆمەڵگای ئێمە هەیانبووە بەقودرەتی قادیر و بەچاوسورکردنەوەی حزبە کوردییەکان بەر لەدوژمنەکانی ئێمە لە(تورك و عەرەب وفارس) بخەسێنرێت.

-1-

حەقیقەتی دۆزی نەتەوەیەك لەنیشتیمانێکی بەمەنفابوودا یان بابڵێین تەنجیلکراو وەك کێشەو لایەنە سیاسی و کۆمەڵایەتی و مرۆییەکانی لەسەر ئاست و مێژەکانی داننان بەحەقی شەرعی کورد لەلایەك‌و، لەو بارە بنبەست بووەی پرسی کورد لەناوەوەو لەدەرەوەی کوردستاندا و لەو دۆخەی کە کورد تیایدا لەچاوەڕوانیدایە نەگەرێکەو، لەبەرامبەریشدا بەشێك هەیە پێویستی بە دەیان و بگرە هەزاران ئەگەر وگریمانە و پێشبینی و چەندین ئاماژەی ستراتیژیی وسیاسەتی حەکیمانەی سیاسیە کوردەکان هەیە بۆ لەبارنەبردنی ئەم هەلومەرجەی ئێستای کوردستان، کەچی ئەفسوس لەو دەساڵەی دواییدا کە ئازادییەك دەبینین بەهەموو ویرانیەکانیشیەوە( لێرەوە قسەم لەسەر لایەنە جوانەکان نییە کە بەسەدانن)، پرسی کورد خراوەتە نێو بەرنامەرێژیی و ستراتیژیەتی حیزبی و هەموو مەسەلەکە کورتکراوەتەوە بۆ ئەوەی لەسەر ئاستی پرۆژە حیزبیەکان قسە لەم مەسەلە

گرنگە بکرێت کە هەمیشە نەبێ ئەوە بزانین، بێ ئەوەی ئێمە پرۆسەی رزگاری نیشتیمانیمان تەواو کردبێ، بێ ئەوەی هەموو تاکەکانی کورد لەکوردستانی عێراقدا رزگاربووبن و هەموو کۆمەڵگای کوردی بەیەك هیواوە لەسایەی ئازادیدا بژیت، ئەوا پرۆسەکانی دیکە ئێچیری بەردەم هەرەسەکانن و لاوەکی دێنە جێیباس، ئەوەی ئێمەی ئەوەی دوای راپەرینیش کەم تا زۆر لە ناوەوەو دەرەوەی حزبایەتی و جاریوا لەدەرەوەی سیاسەتیش لەکێشەکەمان رادەمێنین، تەنهاو تەنها هەست بەوەدەکەین کە پرسی نەتەوەیی و نیشتیمانی کورد چۆتە سەرخوانی سیاسەتی حزبیی وتادێ دەکرێتە پرۆژەیەکی لاوەکی لەتاکتیك و مامەڵەی حزبیانەی ناشەرعی و هەوڵی بەردەوامیش لەو میانەیەوە بۆ بچووککردنەوەی دۆزەکە دەدرێ بۆ نێو کۆڕ و کۆبوونەوەو سەر مێزەکانی کێشە لاوەکیەکان و هەوڵی زیدەتر بۆ سنوردارکردن و کپکردنی هەر هوشیاریەك یان بەئاگاهاتنێك لەمەڕ ئەو مەسەلە سیاسی و کۆمەڵایەتی و کەلتووریانەو هەموو ئەو روانینەش دەدرێ ، کە دەبنە زەمینەی چەواشەکارییەکان و لەژێر باری دروشم و دێوەزمە و زەبەلاحیەتی حیزب و دام و دەزگا بێشومارەکانی داپلۆسینی کوردانە، کاربۆ لەباربردنی هەرچی شێوازی خەباتی ئۆپۆزسیۆنی هەیە دەکرێ. تادەگاتە چاوبەستنی یەکەیەکەی تاکەکانی کۆمەڵگای ئێمەی کورد. سیاسەتی بەحیزبی کردنی هەموو دام و دەزگا و بوارە خزمەتوانیەکان ومۆنکە نەتەوەیی و نیشتیمانیەکانیش بۆنەوەن، کە بەردەوام لەبەرچاوماندا بیانەوێ واقیع لەناواقیع و ناشەرعیەتدا بەرهەم بێنن وحەقیقەتیش ناوبنێن بینینێکی کوێرانە، ئەوەی ئەمرۆ ئەوە یەك بەدوای یەکەکانی راپەرین و منداڵانی کوردی لەسەر رادێنرێ شتێك کەمترن لە پرۆژە دژە کوردییەکانی بەعسیزم لەکوردستانی بەر لەراپەرین، بەڵام لە بۆتەی حزبی خێڵەکی کوردیداو بەمیکانیزمێکی کوردانەی ئالۆزیکی. ئەوەیە کە پرسی کوردمان بەرەو لەبیرچوونەوەیەکی سەیر دەبات، کە دەشڵێین بەمەنفاکردنی پرسی کورد، مەبەستمانە بڵێین کە پرۆژە حزبیەکان هەموو ئامانجەکانی تریان لەبیر بردینەوە، مەبەستمانە بڵێین کە پرسی نەتەوەیەك و هیواکانی و ئایندەشی تادێت لەسەر دەستی حیزبی کوردیدا دوا دەخرێن، لێرەوە کە ئەگەرەکانی بەئاگاهاتنەوەی ئەوەیەکی میللەتەکەمان بەپەرۆشەوە لەپرسی

نەتــەوەیی و نیشــتیمانی و کــەلتووری خــۆی دەپرســێتەوەو هــەموو مــەودا سیاســی و کەلتووری و کۆمەڵایەتیەکانی تــا دەگاتــە ســنووری ئاشــکراکردنی مــەنفاو بنبەست بوونــی مەســەلەکان و هــەمی جوگرافیــای دۆزەکــە، بەهوشــیارییەوە دەیانبینــن و ئۆبــاڵی هــەر تێکشکانێکیش دەزانن چۆن لەئەستۆی سیاسیەکان وئەم یان ئەو لایەنی سیاسی دەخا بەکوردستانی هێشتا رزگار نەکراویشدا(مەبەست بەشی داگیرکراوی کوردستانە لەلایەن رژێمی بەعسی عەرەبی شۆفێنی) ئەم مەسەلەیەو چەندین تێبینیتر وامان لێدەکەن ، هەست بکەین کە لێرەوەیە سیاسەتی حزباندنی هەمووومان، حزباندنی عەقڵمان و بیرکردنەوەمان، جیا لەوەی کە بێهۆشکردن و چەواشەکاریەکی روونە، بەرەو ئەگەری دوورکەوتنەوەشمان دەبات لە پرسی راستەقینەی کورد کەبەدەرە لە هەرچی پرۆژەی حزبییە، وامان لێدەکات دورکەوتنەوەکان بەچەندین فەرسەخ پێوانە بکەین و، لەمەنفاکانیدا بەدوای خەونەکانماندا بگەرێن. ئەلێرەوەو کەهاتینە سەر قسەکردن لەسەر کرۆکی ئەو مەسەلانەو بەدوا داگەرانی حەقیقەتی شتەکان ، جاچ لە سونگەی سیاسیەوە یان لەبواری کۆمەڵایەتی و کەلتورییەکان، یان لە روانینمان بۆ مەسەلە چارەنوسسازەکان کە پەیوەندی کەم تازۆریان بەئێمەمانانی ئەوەی ئایندەی ئەم وڵاتەوە هەیە، لێرەشەوە بێشك بەسەر چەندین قەیراندا دەکەوین، ئەو قەیرانانەی بوونەتە بەشێك لەپێنەگەیشتنی عەقڵی سیاسی کورد و نەبوونی بەرنامەیەکی عەقڵانی بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ کێشە ناوخۆیی و هەرێمیەکان، یان لە هەر پەیوەندییەکدا لەگەڵ داگیرکەرانی کوردستان لە (تورك و عەرەب و فارس)، بەومانایەی قەیرانەکان لەجیاتی ئەوەی ببنە هۆی بەکارخستنی هەموو تواناکانی نەتەوەیەك کە ئارەزوویەتی لەپێناو ژیانێکی ئاسودەدا سەری دابنێن و تواناکانی بۆ مەسەلە چارەنووسسازەکان بکاتە ئەنجامێکی ئیجابیانەی قەیرانەکان، ئەبن بەرنامەیەکی هیواییانەی ئاسودەبەخش بەرهەمبهێنن، یان ئەم هەل و مەرجانە ببنە هۆی پیاچوونەوە بە سەرجەمی سیاسەتەکان لەمەر پرسی نیشتیمانی و نەتەوەی کورد و هەوڵی ئاراستەکردنی چارەسەر بدرێ ،لەوڵاتی ئێمەدا بەردەوام قەیرانەکان، قەیرانە سیاسەکان، دیبلۆماتیەکان و سەربازیەکانیش، یەك رێچکەیان بەسەرکردایەتی حزبە خێڵەکیەکانی کوردستان داوە ، ئەویش رێچکەی تونێڵە

تاریکەکانی سیاسەتی هەڵپەرستانە و وەهم و خۆبەزلزانی بوون ،تانەگاتەشەمەندەفەری خیانەت وەك بەشێك لە سیاسەتی حزبیانەی کورد، کە هەر زەمەن وحزبێك بەهەموو مێژوو و سەروەرییەکانی و ، بەهەمی خەبات و شکستەکانی و بەهەموو شەهید و زیندووەکانی پلێتی بۆ بڕیوەو سەرکردەیەکیش شوفێری بووە، لێرەوەیە بابڵێین ئەوی لەلایەن حزبە کوردیەکان لۆژیکە (خیانەت) دەبێتە پرۆژەیەکی فریادرەسانە لەسەردەستی داگیرکەران و بەچارەسەری قەیرانەکانیش ناوزەد دەکرێ، لێرەوە نایەینەسەر ئەو یادەوەرییە رەشانەی کە بەدەوام ئەوەی دوای راپەرین وێران دەکات و وەرەقەی دورشمە زلەکان ئاشکرا دەکات، لێرەوەیە کە قسەکردن لەسەر پرسێکی شێواوی وەك پرسی کورد دەمانباتەوە سەر تونێلی قەیرانە بنبەست بووەکان و قەیرانەکانیش لەمەودا حەقیقیەکاندا ، لەسەر زەمینی واقیعدا و لەنێو کەشکۆڵە بەسەرچووەکان، ئەو حەقیقەتەیە کە دەبێتەوە بەرهەم هاتوێکی واقیعی و هەموو ئەگەر و گریمانە پێنەگەیشتوەکانی حزبمان بۆ دەردەخات، خەبات و دروشمەکانی حیزب بەتاڵ دەکاتەوە و پێمان دەڵێت بێتوانایی سیاسی و ناکارامەیی سیاسیەکانمان توانای چارەسەری پرسی من و تۆیان وەك کوردێك لەو وڵاتە پڕ ئافاتە نییە، بەڵکو ئەگەرەکان پێماندەڵێن کە ئەو پرۆژەیەی کە بەشێك لەحزبەکان پێیانە بۆ مەسەلەی نیشتیمانی ئێمە، بۆ دەرچوون لە قەیرانە سیاسی و ئابووری و ناعادیلانەکان ، پرۆژەیەکە لەقەیرانێکەوە دەمانباتە قەیرانێکی تر و لە تونێلێکی تاریکدا نامان گەیەنێتە ئایندەیەکی دیار، لەقەیرانی شەری سیاسیانە بۆ شەڕی سەنگەرەکان لەوێوە بۆ شەری پەنجەکانی خۆمان و وێرانکردنی مەمەلەکەتێك لە هیوا و لەوێشیانەوە بۆ نەفی کردنی هەموو بەرامبەرێك کەبە(نا) وەڵامێکی پێبێ و باری سەرنجی لە پیشێلکاریی سەروەریەکانی ئێمەی تاکی کوردا هەبێت، لێرەوە بەدواداگەڕانی حەقیەت گریمانەی قەیرانەکانە و ئەگەر بشمانەوێ قەیرانەکان شیتاڵکەین کەوا بێشك حەقیقەتەکان بەردەوام بەرهەم دێن و ئێمەش گەشبین ناکەن، بەرامبەر بە ئایندەو مەودا دورەکانی یان ستراتیژیەتی پرسی نەتەوەیی کورد.

-2-

کاتێك لەدەروازەی دووەمەوە بێینە سەر مەسەلەکەو لەسەر پرسی کورد قسان بکەین دەگەینە سەر ئەو حەقیقەتەی کە هێزە سیاسیەکانی کوردستان ، جیا لەوەی لەدوای راپەرینی جەماوەری نەیانتوانی بەرگری لەوخاکانە بکەن کە بەپشتیوانی پێشمەرگەو جەماوەر لەدوژمنی لەمێژینەی کورد رزگارکرابوون، جاچ ئەو داگیرکردنەی بەناوی عێراقی عەرەبی و چ لەمێژووداو لەژێرناوی ئیسلام کە بێشك قەتلوعامی خەڵکی کوردنشینی ئەو دەڤەرانەیان بەحەلاڵ زانیووە. دوای ئەوەی راپەرین دەکەوێتە بەر شکست و هەڵگەرانەوەی چەندین کەس لە کەسایەتی خێڵەکی وکۆنەجاش لەراپەرینی جەماوەری ،دواجار سەیر لەوددایە کە سەرکردایەتی سیاسی کورد قەناعەتی بەومانەوەیە دێت لەو بەشەی ئێستای هەرێمی دوولەت و سارد دەبێتەوە لەسەر پرۆسەی رزگارکردنی هەرێمە داگیرکراوەکانی وەك(کەرکوك و خانەقین وشەنگار و دەورروبەری)و دەکەوێتە بەرگورجێکی کەمەرشکێن لەبێ ئومێدی لەبەردەم روانینی ئامانجە ستراتیژییەکان، ئەمەشمان وابینی کە دوای لێژنەی تەنسیق و کێشانەوەی ئیدارەکانی رژێم لەهەرێمە کوردییەکان و (کەرژێم بێ سێ ودوو گەیشتبووە ئەو باوەڕەی کە جارێکی دیکە ناتوانێ لەوناوچانەدا حوکمی فاشیانەی خۆی بکات) کەچی لەخەون و خەیاڵی حیزبە کوردییەکانماندا شتێك ، مەسەلەیەك ، پرسێك نامێنێ بەناوی پرسی رزگاری نیشتیمانیو هەموو ئەو کوردانەشی کە تەنها بۆ چەند ساتێك ئازادییان بینی و لەژێر حوکمی بەعسدا ئێستایان بەسەر دەبەن، دەخرێنە مەنفایەك و مەسەلەی ئازادکردنیان تەئجیل دەکرێت، بەڵام کام تەئجیلکردن، لەدەساڵدا لەناو ئایندەیەکی بێ ئومێد و نادیاردا دەگوزەرێن وچاوەکانیان بەردەوام لەچاوەڕوانی رزگاریدان.

جگە لەم مەسەلەیەش کە نەمانی پرۆژەیەکی سیاسی و سەربازییە بۆ ئازادی نیشتیمانی نەتەوەیی نەوتاکانەی کۆمەڵگاکەمان، هەموو هەوڵەکانی دیکەی بەرەنگاربوونەوەی پرۆسەی بەعەرەبکردن، راگواستن و بەبەعسیکردن و گۆڕینی شوناسی نەتەوایەتی کورد لەوهەرێمە داگیرکراوانەدا لەبیردەچنەوە، پێشمەرگە دوای شکستە یەك لەدواییەکەکانی خۆی و خەریك بوونی بەشەڕە نێوخۆییەکان ، باوەڕ بەپشوێك دێنێ کە لەناوبەرگی دوژمندایە، پێشمەرگە

چالاکیە کوردژێنەکانی لەیاد دەچنەوەو ئەبێتە فەرمانبەرێکی چەك لەشان و قەناعەتی پێدەهێنن و لەبیرەدەبەنەوە کە هێشتا قۆناغی رزگاری نیشتیمانی بەنیوە چڵی ماوەتەوە،لەبەرامبەر ئەو بێ هیواییانەی پێشمەرگەو نەمانی حەماسەتی شۆرشگێری خەڵك، بەعسیش بەئارامی خۆی لەرووی جوگرافیاو ئەتنوگرافیاوە هەموو پرۆسەکانی بەرێوەدەبات، لێرەوەیە کە ئێمە دەساڵە باس لەئازادیبوونی خۆمان و عەقڵمان و یادەوەریمان و تۆڵەو تفاقمان دەکەین و بەچەندین گەمەدا تێدەپەرین کەچی ئەو ئازادییەی ئێمە نابێتە هەڵگری شوناسی هاوهیوابوون و نیشتیمانیانە. لەلایەکی دیکەوە کاتێ هەر حیزبەو پێیوایە ئەو فریادرەسی خەڵك بوودو تەنهاو تەنها بەیەك رەهەندانە پرۆژەی بەناو نەتەوایەتی و حیزبیانەی خۆیان دەخەنەروو، ئەگەرێکەو دەمانباتەوەسەر ئەوەی بڵێین ئەم خۆبەکەڵەگا زانینە، بەومانایەیە کە نەتوانراوە هەمان ئەو ئازادییە پرخەوشەی کە ئێستا لانیکەم ئێمەی لەسایەدا دەژین، لەرێگای رزگارکردنەوە بەهاونەتەوەکانمان رەوابیبینین و کاربۆ ئازاد بوونیان بکەین،کارەساتەکەش لەوەدا دەبینینەوە کە سەرکردایەتی سیاسی کورد ونیکتیفاکردنی حیزبەکوردییەکان بەوبەشە ئازادییەوەو خۆبواردن لەپرسێکی گەورەتر کە پرسی کیانی سیاسی ونیشتیمانی کوردە، هەرەشەیەکە وامان لێدەکات گومانمان لەهەموو ئەو ئازادییەی ئێستاش هەبێت بەوەی کەدەشێ ئێمە لەبەردەم خەتەرێکدا بین و ترسمان لەراوەستاوی ئەو ئازادییە هەبێ، بەپێوانە لەسەر ناکارامەیی و ناتوانایی ئێستای سەرکردایەتی سیاسی خێڵەکی کورد و گەمە کارەساتبارەکانیان، هەر لەشەری ناوخۆ و ناوەدانکردنەوەی زیندانەکان و( کوشتنی خەڵك لەسەر ئەوەی خوانەخواستا بلێت کوردم یان کەسێکی نیشتیمان پەروەرم و خیانەت قەبوڵناکەم) تادەگاتە بێنومێدکردنی نەوەکان و تۆقاندنیان، بەرنامەیەکی بێوێنەی ناعەقڵانی سیاسەتی کوردییە، ئەم سیاسەتەی هەندێ لەحیزبە کوردییەکانیش جگە لەوەی تەواوکردنی ئاکار و ئەخلاقیاتی بەعسە، لەبارپردنی پرسی کورد و هیواکانی کۆمەڵگاکەشمانە، هەر ئەمەش وامان لێدەکات واقیعێکمان بخاتە بەردەم کە لەدەرەوەی لێکدانەوە سیاسییەکانی ئێستایەو حەقیقەتی پرۆژە ناکامڵەکانی حیزبەکانمان بۆ ئاشکرادەبێت، بەمانای ئەوەی دوای دەساڵ ئازادی و بەر لە هەڵایسانی

شەڕی نێوخۆیی کوردستان وئێستای سەردەمی نەشەڕ نە ئاشتیش، بۆمان هەیە بپرسین ، کوانێ مەسەلەیەك ، کوانێ حەماسەتێك جگە لەبڤە و نەگوتن لەسەر پرسی کورد و بارومەرجی لە قۆناغی ئێستاماندا، حیزبە کوردییەکان جگە لەوەی هاتنەوەو، پرۆژە نیشتیمانیەکانیان دواخست چیان لەکەشکۆڵدا ماوەتەوە، جگە لەبەخۆداچوونەوەو شەرمگرتن بەرامبەر بەئازادنەبوونی زیاتر لە دوو ملیۆن کەسی کورد لەو هەرێمە داگیرکراوانەدا، بۆمان هەیە بپرسین کاتێك 80٪ خەڵکی کوردستان لەناوەوەو لەهەندەرانیش لەگەڵ ئاشتیدا بن و حیزبەکان و بەرژەوەندییە تەسکەکانیان ئەنجامی نەدەن، بەچ حەقێك باس لە شەرعیەتی جەماوەری دەکەن کە بێگومانیان دەکەین لەکۆمەڵگای هوشیاری ئێستای کوردیداشەرعیەتی شۆرشگێریشان بێئارامە، ئەو ئیدارانەی ئێستا دەیانبینین بەشێکی زۆری سیستەمی خێڵ بەرێوەیان دەباو درێژکراوەی مەوسیمەکانی خێڵن و بەوەهەم بوون بەئیدارەی مەدەنی،جێی پرسیاریشە کە بۆ دەبێ پرسی کورد وەك پرسێکی نەتەوەیی و نیشتیمانی چارەنووسساز لەبەرنامەو مەهامی حیزبەکان نەبێت،(ئەمەو ترسنۆکی حیزبە بەتەمەن و بێتەمەنەکان وەك تەمبەڵخانە کە هەر بەناو ئۆپۆزسیۆنن) لەلایەکی دیکەوە زەبرێکی توندی لەمەسەلەکان داوە و ئەوانیشی کردۆتە دوکانی ماقوڵ لەجیاتی ئەوەی میوە فرۆش بن (بەیاننامە وسیاسەتی هەڵپەرستانە)فرۆشن و داشی نێو هەموو کارەسات و وێرانیەکانیشن.( لێرەوە مەبەستمان نییە شەرعیەتی خەبات و بوونی پرۆژەی سیاسی لە حیزبە کوردییەکان بسەنێنینەوە، وەلێ دەبێ پرۆژەکان لەچوارچێوە نیشتمانی و نەتەوەییەکان بەرێوە ببرێن).

جێگای خۆیەتی لەوانەش بپرسینەوە کە بەناوی شەرعیەتی ناشەرعیەتەوە خۆیان بە نوێنەری خەڵك دەزانن و مێوانی ئەنجومەنی نیشتیمانی حیزب و وەزارەتەکانی حیزبن،کەتاوەکو ئێستا چەند زاتی ئەوەیان کردووە ئەگەر ناماقوڵی نەبێت بۆیان، قسەبکەن لە دانانی پرۆژەیەکی نەتەوەییانە و ئارەزوومەندانەی کورد بۆ رزگاربوونی یەکجارەکی خاکە داگیرکراوەکان؟ بۆ لەمەهامیاندا نەبووە ریفراندۆمێکی جەماوەری بکەن لەسەر پەیوەندییە حیزبیەکان بەرژێم و لەسەر چارەنووسی ئانیدەی هاوڵاتیانی کورد لەبەردەم ئەو گەمەو

سیاسیەت و خیانەتی حیزبدا، بۆ جارێك نەیانپرسی کە بۆ دەبێ سەروەرت و سامانی نیشتیمانی لە شەڕە ناوخۆییەکان سەرفبکرێت؟ کە بێشك ئەو سەرمایە ماڵیەی کە کورد لەو دەساڵەدا بەهەدەریدا بەشی رزگارکردنی هەموو خاکی کوردان و لاوازکردنی رژێمێکی دیکتاتۆری وەك بەعسیشی دەکرد، بەڵام لەکوێوە ئەم قسانە دەکرێن لەشوێنێك کە ماڵی حیزبەو نوێنەرانی ناشەرعی میللەتیش مێوان!!؟؟

بەدڵنیاییەوە لێرەوە دەڵێین هەموو ئەو دەزگایانە دورخراوەن لەوەی بتوانن لەبەردەم حیزبدا و لەنێو کایەکانی پرۆژە حیزبییەکاندا قسە لەم مەسەلانەبکەن و وەك (پەرلەمانتارانی دونیا سەرچاوەی گوشاربن) و بەرژەوەندییە نیشتیمانیەکان رەچاوبکەن.. لەناو ئەو هەموو قەیران و بازاڕو بێناگایانەدا، شەڕی ناوخۆش پرۆژەکان هێندەی دیکە دوادەخات و خەونە حیزبیەکانیش لەم هەرێم و لەویان گەشەدەکەن، داهات و سەروەتی وڵاتیش لەو تانجیلکردنە سەرفدەکرێت،کە شەری نێو خۆییە، شەڕێك بۆ حەوت ساڵ دەچێ گەلی کوردستانی خواروی بەخۆیەوە خەریك دەکا هەرچی توانای ماددیو مەعنەوی و حەماسەتی شۆرشگێری ونیشتیمانپەروەرێتی هەبوو کردنی بەمەنفایەکی لەبیرکراوو مەسەلەی رزگاری خاك، ناسنامە وتاکە ژێر بارەکانی بەعس بوونەتە مەسەلەیەکی لاوەکی و ئەم سەنگەرو ئەم تەپۆلکەش لەناو کوردستانی رزگارکراودا بوونە خاڵی سەرەکی کێشەکانی حیزب.

لەو مەوداو فەزایەشدا پرۆسەی حیزبیانە و خێڵەکیانەی دژە رزگاری(ئەگەر نەلێین دژە شۆرش بەرێوە بران) بەوەی حیزب پێیوایە مادامەکی گوندەکەی خۆی رزگارە ،وەك ئەوە وایە هەموو وڵات رزگاربێت و نیمە خاکی خەڵکمان داگیرکردبێ. بەرێوە چوونی ئەو پرۆسانەش (لەپاڵ شەڕە یەك بەدوای یەکەکانی ناوخۆ) دووبارە بوونەوەیەکی مێژووییانەی رووداوەکانبووە لەلایەك و خۆدووبارەکردنەوەیەکی حەقیقەتیانەی سیاسیە کوردەکانیشە لە گواستنەوەی هەموو گەمە تەواونەکراوەکانی شاخ بۆ ناو شارو لەسەردەم و شوێنی جیاوازو بەمیکانیزمێکی مۆدێرنانەتریشەوە، ئەم گەڕانەوەیە جگە لەوەی پاشەکشەی بەرنامەی رزگاری نیشتیمانییە، دروست بوونی بەرەیەکی خیانەتکاریشە لەم یان لەو قۆناغی

رزگاریدا، خەوبینین بەتاك رەهەندی و یەك دەسەلاتی حیزبیانەی حاکم لەولاتدا، یەکێکی دیکەیە لەو فاکتەرانەی کە بۆتە هۆی ئەوەی مەسەلەیەك لەگۆڕێدا نەمێنێ بەناوی پرسی کورد و هەرچی تواناش هەیە لەو بوارەی باسمانکرد سەرف بکرێت و پرسی کورد بکرێتە پرسی مانەوەی حیزب و بنەماڵەو بەگ و سەرەك خێڵەکان. لێرەوە نامانەوێ پۆلێنی ئەم حیزب یان ئەمیان بکەین و بۆ ئەو مەرجەعیەتانەیان بگێڕینەوە کە بێشك دەتوانن خۆیان لەقسەکاندا پۆلێن بکەن و بەئێمەشی بلێن کە سەر بەکام بەرەو مەرجەعیەتی کارەساتەکانن.

شتێك هەیە کە دەبێ ئەو لایەنانە ببینن کەخەو بە یەك دەسەلاتی و یەك حیزبیانەی حاکم لەودەڤەر یان لەم هەرێمدا دەبینن، کە ئەگەر ئەو بارەی ئێستاش وەك دیفاکتۆ(ئەمری واقیع) بەرێوەدەچێ جگە لەتێکدانی ئاشکرای ئەزموونی بەرێوەبردنی کوردستانە ، لەباربردنی ئازادی و دیموکراسیەتیشە کە خەڵك ئەیانەوێ لەسایەیدا بەمافەکانیان شادبن. ئەمەو ئەوبارە، دامەزراندنی سەرەتاکانی دیکتاتۆریەت و تۆتالیتاریەتی حیبزبیە بەناوی پارێزگاریکردنەوە، بەلام ناکرێ سیاسیەکانی کورد بەتایبەتی ئەوانەی بۆ رزگاری و ئازادی خەڵك تێکۆشان لەوە بێئاگابن، کە بۆنەتەوەیەکی خاوەن هیوای ئازادی و گەراو بەناومێژوودا بۆ سەندنەوەی شوناسی نیشتیمانی و نەتەوەیی خۆی، ئەو مەسەلانەی کە ئەوان حیزب خۆیان پێوە خەریك کردووە گەورەتر نین و نموونەی بەپەند بوونی بەعسیش زۆر بەرچاوە کەچۆن لەکوردستاندا و بەحەماسەتی کورد بۆرزگاری، کران بە تەیری ماقوڵ وتووشی شکستێك کران کە عەرەب و ئەریتە شۆڤێنیەکەیان هەر لەسەردەمی ئیسلامدا تا ئێستاشی لەگەڵ دابێ بەخۆیانەوە نەیانبینیبوو.

ئەمەوپاساوە سیاسیەکانی ئەمرۆ بەشێکن لەقەیرانی سیاسی کوردستان، کە خۆیان لەخۆپارێزی دەبیننەوەو کەرو لاڵ لەبەردەم مەسەلەی رزگاری (خاك)دا دەوەستن و، گوتارەکانی ئەم پاساوانە گەمەیەکی حزبیانەن و دروستکەری وێنەی وەهمین لەیانەوەری تاکی کورددا بەناوی تاکتیك و سیاسیەتکردن، ئەمەو بەراوردەکانیش کە لەگەڵ گەلانی تری ژێردەست دەیانکەن تاسەرئێسقان بەراوردی بنبەستو دۆڕاون، لێرەوەیە دەپرسین ئەبێ

چیبێت وا لەسیاسیەکانی کوردبکات بەردەوام لەگوتارە سیاسیەکانیاندا پرسی کورد بەکێشەی فەلستینیەکان ببەستنەوە؟ کە بێشك ناکرێ یەهودییەکانیش بە گوناهبار بزانین، کە سەردەمانێك وەك ئێمەی کورد مەسەلەکەیان لە گێژاوی مرۆڤبووندا دەسوڕایەوەو ئەمڕۆ توانیویانە بگەنە مەبەستی سیاسیان بۆ دیاریکردنی چارەنووسیان لەسەر زەمینی ئیسرائیلدا، بۆیە با عەقڵی سیاسی کورد بەئاگابێت و تێبگات کە دروستکردنی ئەو پەیوەندییە وەهمیانە ، جگە لەوەی دەرچوونە لە واقیعی پرسی ڕزگاری کورد، لەلایەکی دیکەوە ناتواناییە لە دیاریکردنی ئەم لایەن و فاکتەرانەی کە بەدەر لەو وەهمانە کێشەی کوردیان پێ پتەو دەکرێت و هاوکێشەی بەرژەوەندییەکانیش دەگۆڕن،(سیاسیانی کورد ئەرانەی لە پشرووی سیاسیدا کات بەسەر دەبەن پێیانوایە دەبێ دڵی عەرەبەکان ڕازی بکەن و باس لە ڕزگاری کەرکووك نەکەن، ئەمەش لەترسی گەلەکۆمەی عەرەبی بۆ سەر کورد ) ئاخۆ ئەمەیان سیاسەتە یانە مەهزلەیە؟ لێرەوە وەڵام بۆ ئێوە بەجێدەهێڵین. ئەگەرچی ئەم قسانە بەشێك لەحەقیقەتیشیان تێدانەبێت بەڵام بەشێکیشان حەقیقەتن. نەچوونە ناو ئەو هاوکێشانەش کە کێشەی کورد و فەلەستینیەکان بەیکەوە گرێبدات ، دیبلۆماسیەتێکی هوشیارانەیەو ڕوانینێکی ستراتیژیانە لەئایندەی ئەو هەرێمەی ئێستای ڕۆژهەڵاتی ناوین و بەهێزترین کارتی هەڕەشەی کوردیش بەرامبەر هەر هەڕەشەیەکی هەرێمی ڕزگارکردنی تەواوی خاکی کوردنشینە لەداگیرکەری شۆڤێنی عەرەب لەعێراقدا.

پرسیارێکی ئارامتر ئەوەیە کە بۆدەبێ خەونی کوردێك لەکوردستانی ئازادکراودا،چەندین فەرسەخ جیابێت لەخەون و هیوا و ڕوانینی ئایندەییانەی کوردێك لەکەرکوك و، شەنگار و خانەقین، بۆدەبێ کوردەکانی ژێردەستی بەعس بێئومێد لەبەرامبەر هیواکانی ئازادبوون بژێن و ڕقیان لەهەڵوێستی سیاسیانەی حیزبە کوردیەکان بێت کە نەیانتوانیوە هەوڵی ڕزگاییان بدەن ، چ پرسیارێك دەکەن کە دەزانن حیزبەکان مەسەلەی ئەوانیان کردووە بە کارتێکی تەنجیلکراوی ناوگیرفانی سیاسەتی حیزب لەلایەك و بەرژەوەندییە هەرێمیو نێو دەوڵەتیەکانیش لەلایەکی دیکەوە.لێرەوە پرسیارکردن لەسیاسیەکان تەنها ئەوەیە کە (دەبێ.. .. کەرکوك خاکی کوردان بێت؟!) یانە بۆدەبێ ئێمەی

هاوولاتیانی کوردستان ، ئەو گەیشتن بە شوناس و ئازادییەی خۆمان بەحەقیقەت بۆ ئەوانیش دابین نەکەین. لەکاتێکدا کە ئەوان شوناسی نەتەوەییان لە خەتەردایەو خەتەر لەسەر ئەمان، پرسی کورد بەرەوهەڵدێر دەبات، لێرەوە ئاگاییەك گەرەکە بەدەربێت لەسیاسەتی حیزبی و یان حەق وایە بیریك لەوهوشیاریە نەتەوەییە بکرێتەوە کە ئێستا بەرەو برەوێك دەچێ لەکوردستاندا بۆ ئەوەی توانای مانەوە و بەرخودان بەرامبەر لەناوچوون بەرقەراربێت. کەدیارە ئەمە لە خەتەری لەناوبردنداییەو ،بەرنامەحیزبییەکانیش بەشێك لەو لەناوبردنی هوشیارییە نەتەوەییەیان بەردەکەوێت، کە لەرێگای سیاسیەتی نابەجێیان دەیگۆڕن بۆ هوشیاری حیزبیانەو کەلتووری رەجعیانەی خێڵەکی و بیرکردنەوەی تەسك.

کاتێ گەلی کورد لەخاکە داگیرکراوەکاندا لەژیان و گوزەرانێکی ناهەمواردا دەژی، دەبێ لە بڕیاری ئەنجورمەنە حیزبیەکەی نیشتیمان بپرسین چییە وادەکات کۆمەك بە (کۆسۆڤۆ)یەك بکات کە دەیان دەوڵەت لەناتۆ و یەکێتی ئەورپاو جیهانی ئیسلامی بەهانایەوە چوون و لەبەرامبەریشدا سەدان وهەزاران ماڵی کورد نەبینێت ، یان ترسی ئەوەی هەبێت باسیان بکات، کە رۆژانە لەسنوورەکانیعێراقی عەرەبی بەرەو هەرێم دێن و رژێمی شۆڤێنی عەرەب لەعێرقدا لەسەر خاکی باب و باپیرانیان دەریان دەکاو، گەڕەك و کۆلان و منداڵی و زەمەنەکانی ژیانیان لێدەسەنێتەوە، کۆمەك کردنی کۆسۆڤۆ جگە لەوەی گەمژەییەکە لەسیاسەتی کوریدا، نەبوونی پرۆژەیەکیشە بۆ ئازادکردنی هاونیشیمانیانی کورد لەژێر دەستی بەعسدا، جگە لەوەی گومانە لە ئەگەرێك کە ئێمەی تاکەکانی ئەم کۆمەڵگایە بەئازادو نائازادەکانمانەوە، بەشێك بین لە مامەڵەیەکی سیاسیانەی حیزب وخێڵ و کەسانی ئازادبین لەنیشتیمانێکی ئەتکراو و فرۆشراودا ، ئەمە گومانێکەو، ئەخاسما واقیعیش لەدەروازەی ئەم گومانەوە بمانباتەوە سەر حەقیقەت.

-3-

پرسی کورد له دهروازهی سێیهمهوه یهکراست دهتوانین بڵێین گهڕانهوهیه بۆ گۆڕانی چهمکی شۆڕشگێڕی ومهغزاو مهودا دژهکانی لهسهردهمی راپهرین وهك قۆناغێکی دیکهی خهبات و شێوازێکی نوێی حیزبایهتیکردنی بهحیساب مۆدێرن و شارستانی.

کاتێك هێزه سیاسییهکانی کوردستان لهشاخ و لهمهلهکهتی بێدانیشتوانهکانی کێودا دهجهنگان و بهرهنگاری ههژموونی شۆڤێنیهتی بهعس دهبوونهوه،جگهلهوهی لهشوێنگهی خۆیان ههڵگری شوناسێکی شۆڕشگێڕی و شهرعیهتی جهماوهرێکی یاخیبوو بوون، لهلایهکی دیکهشهوه ههڵگری ناسۆرییهکانی خهڵکانێکی زۆر بوون لهناو شارهکانی کوردستان و بگره عێراقیش، بهومانایهی پشکداریکردن لهو خهباته سیاسی و چهکدارییهی شاخ و سهرووهرییهکانی و لهههمان کاتیشدا لایهنه خهوشدارهکانیشی، بوو بوو به بهشێك لهژیان و مانهوهی حهماسهتی خهڵکی کوردستان له پێناو مهسهله کهلتووری و نهتهوهیی و شوناسییهکانی خۆی لهزمان و ترادسیۆن و دابه کوردهوارییهکانیان بۆمانهوه لهبهردهم ههرهشهکانی رژێمی شۆڤێنی عهرهبی عێراقی و پرۆسه بهدناوهکانیان لهژێرناوی (ئهنفال و کیمیاباران و جینۆسساید)دا، شۆرش و هێزهسیاسییهکانی ئهو دهمه( مهبهست چارهکه سهدهی دوایی سهدهی بیستهمه) خاوهنی شهرعیهتی سیاسی و خهباتێکی بێوینهی نهتهوهیی و نیشتیمانی بوون و ،پرسی کوردیش لهمێز وبازووی (پێشمهرگه)کانی ئهوێ دهمێدا وێنا دهکرا بۆ گهیشتن بهئامانج و مهرامی میللی، میللهتێکی وهك کوردی ژێردهستی بهعس.

لێرهوه دهکرێ بێینه تهرهف ئهو چهند ساڵهی دوای راپهرین (بهر له بهرپابوونی شهڕی نێوخۆ) که هێشتا هێزه سیاسییهکانی کوردستان خاوهنی شهرعیهتی خۆیان بوون و جێگای گومانی خهڵکی نهبوون، لهبهردهم ههموو ئهگهرهکانیش پیرۆزییهکانیان نهدۆراندبوو، لهبهردهم خهڵکانێکیشدا که خهمی ئازادییان لهخهمی نان و مردن پێ پیرۆزتر بوو ئومێدێکبوون سهراپای ئێمهمانانی لهخۆدهگرت، ئهم چهند مهسهلهیه ئهگهر وهك سهرهتاییهکی باش لهقهڵهم بدهین بۆ روانینهکانی کورد لهئاینده‌یهکی باشتر، ئهوا ئهوهی ئێمه لهدوای ئهو زهمهنه دهیبینین و رێك دوای شهڕی ناوخۆ و ، لهلایهکی دیکهش که

بەبەراورد لەگەڵ هەموو گەلانی داواکار بۆ ئازادی دەبینین، دیاردەی(دژە شۆرشبوونە) لەوانەیە حیزبە سیاسیەکان لەم بۆچوونە نیگەران بن، وەڵێ ئەوەی حەقیقەتە ئێمە تەنها لەسەر ئەو ئەکسە سەرەتاییەی راپەرین و دەرمنجامەکانی کۆچڕەو، ئەو بریارەنادەین کە بریاری هاتنەوجودی (رەوتی دژە شۆرش و گەرانەوە بۆ مەرجعیەتی بەعسی و پەشیمانبوونەوە بوو لەهەر شتێك کە ئێمە (لایەنە هەڵپەرستەکان) نەمانکردبێ) ئەمەش لەژێر باڵی دانوستانە حیزبیەکان لەگەڵ رژێم و بەرکاربوونی سیاسەتی هەڵپەرستانەی رژێم لەگەڵ سیاسیە کورددکان و بێئاگاییان لەمەسەلە نەتەوەییەکان بەرەو ئاکامێکی خراپ برا.

دژە شۆرش بوون، دیاردەیەکی زەق و بەدبوود، لەکاتێکدا کە رەگی ئەم دیاردەیە لەو پاشماوانەدا سەریان هەڵدایەوە ، کە لێبوردنی گشتی بەرەی سیاسی کورد لەسەردەمی سەرەتای راپەریندا رایگەیاندبوو، شەرعیەتەکانی شۆرش و راپەرینی پێ لاوازکردن، کە دواجار وەك بینیمان ئەو لێبوردنە دەبێتەوە لەمپەر لەبەردەم ئەزموونی جەماوەری کوردستان و لەئەکسەکاندا دژی هەر خەباتێکی جەماوەری بوونەوە. کاتێکیش دێینە سەر دوان لە دژە شۆرشەکان، لەهەڵوێست و مەغزاکانیان، ئەبێ سەرەتایەك بدەینە سیاسەتی هەڵوەشاندنەوەی بونیادی کۆمەڵایەتی و کەلتووری کۆمەڵگای کوردی لەلایەن بەعس و بەرنامەی پاکتاوکردنی گەلی کورد،بۆنەوەی تێبگەین کەبەعس بەهوشیارییەوە پیادەی ژیاندنەوەو دارشتنەوەی زیاتری سیستەمی کۆمەڵایەتی خێڵەکی کرد لەکوردستان و لەژێر ناوی (جاش) و ئۆردووەکانیان ،هەموو رەگەزە کۆنگەراکانی کۆمەڵگای کوردیان خستەوەروو ، ئەمە جگە لەبەرهەم هێنانەوەی سیمبولە رزیوەکانی ئەو کۆمەڵگایە کە( میر و بەگ و،ئاغاو ،کوێخاو ...تاد) بوون.

بەرێوە بردنی ئەم پرۆسەیەش ناکرێ بەبێئاگایی لەقەڵەم بدرێت کە دەرمنجامەکەیان ئانەوەو ژیاندنەوەی چەندین دوژمنایەتی کۆن و خێڵەکیانەی نێوان خێڵەکان بوون ، کەتاوەکو ئێستاش رەگ و ریشاڵیان لەناو پێکهاتەی کۆمەڵگای کوردیدا ئامادەگی هەیە. هەموو ئەو ئۆردووە جاشانەشی کە لەدەمی بەر لەراپەرین دژی شۆرش بوون و، لەراپەرین خزانە نێو

شۆرش، دواجار لەنەکسەی راپەریندا بوونەوە بەشێك لەخێڵەت و دژبە شۆرشی کوردستان کەوتنەوە تەقەکردن لەهاولاتیانی کورد، بەومانایەی کە راپەرین لەگەڵ هەموو سەرەوەرییەکانی بەشێوەیەکی بنەبڕکراو نەیتوانی ئەو بونیادە خێڵەکی و گەلەجاشیە(جاشگەلیە) بەلانی کەم لەکوردستانی ئازادا کۆتایی پێبێنێ دواجار حزبە کوردییەکانیشی تێوەگلاند، ئەم ناتواناییەش بەشێوەیەکی راستەوخۆ لەو فەزایەدا بەرهەم هات کە شۆرشی کوردی بەشێك لەسیما خێڵەکیەکانی بەروخسارەوە مابوون و لەژێر ددەمامکی شۆرشگێری ناراستەقینەدا لەبۆسەدابوون. لەلایەکی دیکەشەوە بەشێك لەمێژە سیاسیەکان ئاوێتەی ئەو پێکهاتەو پاشماوانە بوون کە بەعس لەکوردستاندا چاندبوونی و لەژێر ناوی حورمەت و پیاوماقوڵ و سیما پارێزی خێڵ و عەشرەت و ماقوڵگەراییەکانی دیکە، کەوتنە خۆ بەهێزکردن و دواجار حیزبی خێڵ بوو بەبەشێك لەسیاسیەتی کوردی و ئەمەکەر بەناوی پرسی کوردو لەپەناشدا بەعەقڵی خێڵدوازانە چەندین رێوشوێن بۆ بەرێوبردنی پرۆسەی دوژمنکارانەی مێژوویی و سەرنگۆمکردنی سەرۆك خێڵەکان لەسەردەستی حیزبی خێڵەکی کوردی کرانە ستراتیژ و تاکتیکی سیاسیانەی مانەوەی کیانی خێڵ/حیزب و بەرنامەرێژی بۆ پاوانخوازییە حیزبیەکان و ئاژاوەکانی ئەم چەند ساڵەی دوایش گەواهی دەری ئەم مەسەلەیەن. لەرووی کۆمەلایەتیشەوە کێشەی کۆمەڵ و مەسەلە جینایەتیەکان لەو ولاتەی ئێمەدا کە لەهەندێ شوێندا هەرنەبوون و لەهەندێ دەفەریشدا پرۆسەی دروستکردنیان بۆ بەرێوەبرا بوون بەبەرنامەی حیزبی شێوە خێڵ، جگەلەمە کێشە ئابوورییەکانی نێوان حیزبەکان و گومرگ و سامانی ولات بگرە تادەگاتە سنوری نفوز و گەمەسیاسیەکانی نێوخۆ، وایانکردووە جارێکی دیکە پرسی نەتەوەیی لەکۆشکی مەسەلە لاوەکیەکاندا بە لاپەرەیەکی بێ مەئواو ئاییندەیەکی بەمەنفا بڕاو بگات. حەقیقەتی ژیاندنەوەی ئەم کێشە ناوخۆییانەش جیالەوەی کە پەیوەندی راستەوخۆی بەعەقڵیەتی سیاسی کوردییەوە هەیە ، جاچ لەژێر باری قورسایی تێکنەگەیشتنی ناوخۆیی بێت یان لەژێر گوشاری دەرەکی، ئەوا ئەگەرەکانی بەئاکام گەیشتنی پرسی کوردی خستەلاوەو دوائاکام گوتاری خوێن لەنێوان ئەم حیزب و ئەو حیزبداو ئەم خێڵ و ئەمیتریان سەریان

هەڵدا کە بەشی هەرە زۆری لەسەر نەبوونی بەرنامەیەکی پێکەوەژیان و بەمەدەنی بوونی کۆمەڵگا بەرێوە چوون، لەسەردەمی ئازادیدا ئەم مەسەلانە بوون بەزەروورەتی خۆسەپاندنی حیزبە کوردییەکان لەو شوێنانەی کە نەدەکرا بەشوێنی نفوزی خۆیان بزانن، مەسەلەیەکی دیکەی وروژێنراو و دروستکراو،دامەزراندنی حیزبی ئاینییە لەکوردستاندا (وەك ئەوەی لەمێژوودا کورد زۆر سودی لەو ئایینە بینیبێ جگە لەقەتلوعامکردن)، بەسەرهەڵدانی ئەو گوتارە ئیسلامیەش لەکوردستاندا و هەموو ئەو ئاژاوانەشی کەنرانەوە گومانی ئێمەی زێدەترکرد لەسەر پرۆژەی حیزبە نەتەوەیی و نیشتیمانیە پێشکەوتنخوازەکان کە هەمیشە خۆیان بەو دووبەرەکیانەوە خەریك کرد. بەمەش لەسیاسیەتی کوردیدا سەرەتای تێکەڵکردنی دوو شێوە گوتار دێنە پێشەوە کە: یەکیان گوتاری ناسیۆنالیستی کوردی پێشکەوتنخوازەو ، ئەمیتریان دژە رەوت و دژە ناسیۆناڵ و خێڵەکی و ئیسلامییە کە ئەمەی دووەمیان بەبەراورد لەگەڵ وڵاتانی دیکەی ئیسلامیدا کەمتر و بەڵکە هەر نەیانتوانیوە گوتارە ئیسلامیەکەیان لەپێناو پرسی نەتەوەیی کورد بەکار بێنن.

ئەمەو سەرهەڵدانی دووگوتاری سیاسی حیزبە ناسیۆنالیستەکانی کوردستان و دووپرۆژەییان لەشێوازی ژیان و کیانی سیاسی کورد لەگەڵ رژێمە داگیرکەرەکانی کوردستان لەلایەك و، گوتاری دژە ناسیۆناڵی ئیسلامیش لەلایەکی دیکە، ئەو مینبەرانەبوون لەبەردەم کێشە ناوخۆییەکاندا مانەوەو پرسی نەتەوەیی کوردیشیان کە قۆناغێکی دیکەی رزگاری نیشتیمانییە جا چ لەرێگەی خەباتی سیاسی یان دیبلۆماتی یان چەکداری بێت، خستەوە بواری تەنجیلکردن و بەمەنفا سپاردن. ئەوەی حەقیقەتی مەسەلەکەش روون دەکاتەوە نەبوونی پرۆژەیەکی سیاسی یەکگرتووی کوردییە لانیکەم لەستراتیژدا لەسەر مەسەلەکانی،هەم بۆ ئەوەی سیاسیەتێکی یەکگرتوومان هەبێت ، هەم لەدەستی پرۆژە ناکامڵەکانی حیزبیش رزگارمان بێت.

-4-

لەدەروازەی دوایدا کە مەیدانی خەباتی شارو پێکەوە ژیانی دیموکراسیانەی خەڵکی کوردستانەو ئاوێتە بوونە بەنەریتی شۆرشگێری ، دەروەازیەکە لەلایەک خۆی لە ئازادی و دیموکراسی و پرۆژە مەدەنیەکاندا دەبینێتەوەو، لەلایەکی دیکەشەوە مەسەلەی خەباتی شارو دۆزینەوەی شێوەیەکی مۆدێرنترە بۆ گەشەدان بەهوشیاری نەتەوەیی و نیشتیمانی لەنێو ئەو نەوانەی کە لانیکەم ئەو ئازار و ناخۆشیانەیان نەبینیوە کە سەردەمانێکی بەر لەئازادی کورد بەخۆیەوە بینیویەتی،ئەمە پرسیارکردن و بەئەنجام گەیاندنی باسەکەیە بە روونکردنەوەی شێواز و گفتوگۆکردنی تاکەکانی کۆمەڵگای کوردیمان لەناوەوەو ئەوانەشی لەهەندەرانن لەسەر مەسەلەو پرسە نەتەوەییەکان‌و دوانێك لە کارکردن بۆ هێنانە بەرهەمی نێوەندێکی کوردی یەککگرتووی دیبلۆماتیەتی نیشتیمانی بۆ کوردستان.

لێرەوە دێینەسەر باسکردن لەو نەریتە شۆرشگێرییەی کەلەرێگای راپەرینەوە، بووبەبەشێك لەژیانی خەڵکی ئازادی کوردستان، نەریتێك کەتارادەیەکی زۆر خاوەنی شەرعیەتی گۆرینی دەسەلاتی بەعس و وەدەرنانیبووە لەولاتدا، ئەو نەریتەشۆرشگێرییەی کە زیاتر لە 80٪ی خەڵکی کوردستان بەشداربوون لە قوربانیدانەکانی : لەسوتانی گوند وشارۆچکەو ماڵیان،لەپێشکەشکردنی سەرمایە زیندووەکانیان بۆ ئەم خەباتەی کە دواەنجامی خۆی لەراپەریندا بینیوە، وەلێ ئەوەی ئێمە دەمانەوێ لێرەوە قسەی لەسەر بکەین، ئەو زەمەنەیە کە لەبەیەکگەیشتنی نێوان نەریتی شاخ و نەریتی شاردا دێتەدی و تارادەیەك بەر یەککەوتنێك لەشێوازی پێکەوەژیانی شارستانیانەی ئەو دوو نەریتە بەرهەمدێت کەدواجار توێژێکی دژ لەهەمبەر نەریتی شۆرشگێری لەقاوغێکی خێڵەکیدا دروستدەکات،بەومانایەی شۆرشگێریەتی وەك دیاردەیەکی گۆرانئامێز کە خاوەنی پرۆژەیەك نەبوو بۆ ژیان لەشار، دەکرا بەپرۆسەیەکی مەدەنیانەتر کارلێك لەگەڵ ژیان وگوزەرانی شارنشیندا بکات و پەلەنەکات لە تەسلیمکردنەوەی ئەو شەرعیەتەی هەیبوو بەبریارە ئۆرگانیکیەکانی ئەو کەس و گروپ و توێژانەی کە خاوەنی میکانیزمەکانی بەرێوەبردنی بەعسیانەی دام و دەزگاکانی ولات بوون لەوسەردەمەدا(سەردەمانی بەعس لەکوردستان) کە بێشك ئەمە وایکرد لاوازی و بێبەرنامەیی شۆرش‌و نەبوونی خوێندنەوەیەکی پێشوەختە بۆ پێشهاتەکانی راپەرین و

ئازادی بەدەربخات، لەوانەیە بیویژدانی بێت بۆ ئێمە کە ئەوەی راپەڕینین بڵێین هیچ بەرنامەیەك بۆرزگاری نەبوبێت، وەلێ دەبێ ئەوەبزانین کە بەرنامەی رزگاری پێویستی بەردەوامی بە بەرنامەو سیاسەتی بەئومێدبوونی مەدەنیانەش هەبوو.

پرۆسەی دیمکوراسیانەی خەڵك لەدەنگدانی پەرلەمانی و چەندین پرۆسەی تری هەڵبژاردنەکان کە خۆیان لەونێوەندە حیزب و سەندیکایانەشدا بینیەوە، ئەگەرەکانی پێکەوەژیان و سیستەمێکی دیموکراسیانەی زیاتری بەئومێدەوە بەخشیە خەڵك، بەڵام ئەو پرۆسانە ئەوجار تەنها کرانە تێکلی مەسەلە سەرەکیەکانی کۆمەڵگای کوردی و لەپەنایاندا بەردەوام گەرای دیکتاتۆریەت و قبولْ نەکردنی بەرامبەر گەشەیپێکراو، بەرنامەرێژی دیموکراسیانەی تاك رەهەند و تام دیکتاتۆریانە بوو بە رێرەوەی قسەکردنی سیاسیانەی حیزبی و ئەو سەندیکار نێوەندانەش کە بەپاشکۆیی و سیاسیەتەکانی حیزب رازی بوون لێرەشەوە زەمینە لەبارکرا بۆ بەرێوەچوونی پرۆسە نادیموکراسیەکان و ئیئتیلافە گوماناویەکانی حیزبەکان لەپێناو لەمپەر دروستکردن لە خەباتی ئۆپۆزسیۆنی کە ئێستا لەکوردستاندا بەراستەقینەیی وجودی نییە، ئەوەی هەشە ژێر باربوونی هێز سیاسیە گەورەکانەو مەبەدەنی تەسلیم بوونە بەواقیعێك کە خۆشیان باش هەست بەو مەترسیانەی دەکەن.

بەوشێوەیە مەسەلەی پاشقوڵ گرتن لە دیموکراسیەت و مەسەلە مەدەنیەکان لەژێر سایەی بەرنامە خێڵەکی وحیزبیەکاندا کراوە بە ستراتیژیەتی نێوخۆیی و دەرەکی و پەیوەندیدار بە ئاسایشی حیزب و ئەمنیەتی سەرکردە دیکتاتۆرەکانی کورد(ئەوانە دەگرێتەوە کە سیماکانی دیکتاتۆریان بەئێوچاوانەوە درەوشاوەیە) ئەمەو خەون و خەیاڵکردن و خۆخەریککردن بەومەسەلانەش ئەو زەمینەیەبوو کە وا لەحیزبە کوردییەکان بکات پرسێکی وەك رزگاربوون و زیاتر پیادەکردنی دیموکراسیەت لەبیر بکرێت و بکرێتە خاڵی لاوازی ستراتیژیەتی خەبات لەپێناو چارەنووسی رزگاری کوردستان، ئەم خیانەتکردنە لە نەریتێك لەسەر دەستی توێژاڵێکی خێڵەکی و دژە شۆڕش و دژبە دیموکراسیەت ومەدەنی بوونی کورد، بووە هەڵسوڕێنەری هەموو پرۆژەکان بۆ لەبیربردنەوەی پرسی سەرەکی کورد کە

لەلایەك پرسی رزگاری نیشتیمانیەو لەلایەکی دیکەشەوە بەدیموکراتیزەکردنی سەرجەم بوارەکانی کۆمەڵگای کوردی و بەمەدەنی کردنی عەقڵی سیاسی کوردە بۆ تەرباز بوون لەو عەقڵیەتە نوستالیژییەی کە بەردەوام ئەسەر و گریمانەی لەباربردنی ئەزموون و هیواکان بەمەبەستی خۆی دەگرێت.

ئەوەی ئێستاش جێی مەبەستە قسەکردنە لەسەر بەرنامەو گەلاڵەنامەیەك بۆ چۆنیەتی بەمۆدێرنکردنی بیر و بیری نەتەوەیی لە کۆمەڵگاکەماندا و بەتایبەت دۆزینەوەی شێوە گرنجانێك بۆ پەروەردان بەهۆشیاری نەتەوەیی پێشکەوتنخوازی دژە شۆڤێنیبێنە بەرهەم کەبتوانرێ لەنێو شوناسێکی نەتەوایەتی و نیشتیمانیداو لەسەربنەمای قبوڵکردنی هەموو نەتەوەو کەلتوور و زمان و نەریتی لە،کورد جیا ، بۆنەوەی هوشیارییە نەتەوەییەکە لەچێوەی مەبدەئە نیشتیمانیەکان و پێک وەژیانیمۆدێرنانە گەشە بەلایەنە پۆزەتیڤەکانی بدات. بەو واتایەی ئەو حەماسەتە نەتەوەیی و هوشیارییەی کە لەسەردەمەکانی بەرایی راپەڕیندا کە زۆر پێویست بوون ،ەکرێ لەبەرامبەر دوژمنان و لەچوارچێوەی ستراتیژییەتێکی نەتەوەیی گەشەی پێبدرێت،وەلێ لەسەر ئاستی ناوخۆ ئەوهوشیارییە نەتەوەییە لەلایەك ئەبێ بە مەبدەئە مەدەنیی و مرۆییەکان و میکانیزمە دیموکراسیەکان تەیاربکرێت، لەلایەکی دیکەوە لەو هەیمەنە حیزبیە بپارێزرێت کە تەنهاو تەنها هوشیاری نەتەوەیی لەبەرنامەو پرۆگرامەکانیدا دەبینێتەوە، بەواتای تێکەڵنەکردنی هوشیاریەکی شوناس نیشیمانی و نەتەوەیی بە هوشیارییەکی حیزبی بەرتەسك.

لایەنێك کە جێگای قسە لەسەر کردنە بۆ گەشەپێدان بەو هوشیارییە ، جەختکردنە لەسەر نەوەکانی ئێستای بەردەوام لەژیان و واقیعی کوردستان، لەو تێلەنیگایەوە کە ئەو نەوانەو خەڵکی کوردستان باشتر دەکرێ بەسیاسەت و شێوە تاکتیکێکی حەکیمانەی پابەند بەمەبدەئی پێکەوەژیان لەکوردستانێك بۆ هەموو نەتەوەکان و نیشتمانێك لەئازادیدا ، زیاتر تەفاهومی ئەو بارە بکەن کە شێوەی داکۆکی کردن لەو ئامانج و هوشیارییە نەتەوەییە بەرامبەر بەشۆڤێنیەتی گەلانی داگیرکاری خاکمان، پێویستی بەناسینی شوێنگەی خۆمان و کاردانەوەکانی ئەوانیشەوە هەیە، بەوماذ یەی ئەگەر قسەکردن لەمەندەران لەسەر پرسی

نەتەوەیی و هەموو ئەو لایەنە گەشانەی کە دەوروژێنرێن لەناو ئارامیەکانی ئەورووپاو رۆژئاوادا، ئەگەرچی خزمەتێکی فرەخاس بەگەشانەوەی هوشیاری نەتەوەیی دەکات، بەلام ئەوەی دەبینرێت لێدوان و قسەکردنی کەمتر خاوەن بەرپرسیارێتی ئەو ئازادیەن کە ئێستا لەکوردستاندا بوونی هەیە، لەهەنداران و ئەو کەسانەشی قسە لەپرسی کورد دەکەن ، کە حەقی شەرعی خۆیانەو ئێمە لەو بەراوردەمان دژە حەقیان نین، وەلێ بۆشمان هەیە بەوخوێندنەوەیە بلێین قسەکردنێك لە پرسی نەتەوەیی لەئەورووپادا لەوانەیە زۆر ئاسانتر و بێ بەرپرسیارێتی تر بێت ، جگەلەوەی کە کەمتر پێویستی بەبیرکردنەوە هەیە بۆ تاکتیك و بەرگرتنەوە لە کاردانەوەکان لەسەر زەمینی واقیعیی کوردستاندا و لەو هێلە تەماسانەی کە خەلکانی دانیشتوانی کوردستان لەبەرامبەریدا رۆژانە لەگەل نەتەوە رەگەز پەرست و شۆڤێنیەکان(لەتورك و عەرەب و فارس) ژیان بەسەر دەبەن، لێرەوە مەبەستمە بلێم گوتاری نەتەوەیی لە هەندەران جگەلەوەی ستراتیژخوازە کە تارادەیەکی زۆر ئاشکراکەری لایەنە نهێنیەکانی پرسەکەیە و پەرۆشیەکی دیاریشە، وەلێ شوێنگەی جوگرافی گوتارەکە کەمتر گوزارشتە لەواقیعی ئێستای کوردستان و نیشیمانی حیزبەکان، نکۆلیش لەوە ناکەین کەوەك لایەنی رۆحی و سایکۆلۆژی و هوشیارییە عەقلییەکانی تاکی کورد بەنارمەیەکی ستراتیژیانەی پرسی نەتەوەییە لەئاییندەیەکی تەنجیلکراودا، بەلام زۆر جار لەگوتارەکاندا جیاوازی لەگەل واقیع و دووری لەحەقیقەتەکان بەرچاودیارن.

بەپێچەوانەی ئەم رەوتی گوتارە نەتەوەییەی هەندەران کە کوردەکانی دانیشتوی ئارامی ئەوێ کاری بۆدەکەن، هوشیارییەکی دیکەو گوتارێکی دیکە لەسەرزەمینی کوردستانی ئازادو لەنێو خەلکانی راپا لەنێوان ئاییندەو مەترسیەکانی دەوروبەر گوتارێکی تارادەیەك بەرپرسیارترەو تاکتیك خوازترە لە هەلسوکەوتکردنی واقیعیانەو سیاسیانە لەگەل مەسەلە نێوخۆیی و دەوروبەرییەکاندا. بەومانایە بۆ پرسی نەتەوەیی کورد دووگوتار هەن، گوتاری نێوخۆی نەتەوەیی نیشتمانی تاکتیك خواز لە کارکردن بۆ ستراتیژیەتێکی ئارام ، دووەمیان گوتاری نەتەوەیی ستراتیژخوازە لەهەندەران کە کەمتر لەبەردەم هەرەشەو مەترسیەکانی ئەمنیدایە، ئەوەی جێگا ئەهەمیەتی پرسی کوردیشە لەم نێوانەدا هەم لێك نزیکبوونەوەی

ئەم دوو گوتارەیە بۆ کارکردنێکی هاوبەشانە لەناوەوەو دەرەوەی وڵاتدا لەپێناو پرسێکی یەکگرتووی کوردی ، کەدواجار زەمینەخۆشکەربێت بۆ بەرهەم هێنانی نێوەندێکی نەتەوەیی دیبلۆماتی کوردی لە دونیادا لەپێناو نیشتیمانی کورد لەکوردستان. بەرەو دان بەهەردوو گوتارەکەش بەلانی کەم پرسەکە بەهێزتردەکات، بەڵام ئەوەی جێگای تێبینیە پرسی نێوخۆ پرسی نەتەوەییە لە نیشتمانێکی خاوەن پرس ، دووەمیان پرسێکی نەتەوەییە لە جوگرافیایێک کەبەدەرە لە جوگرافیای نیشتیمان و واقیعەکانی، بۆیە ئەو لێک نزیکردنەوەیە دواجار دەبێتە ئەو گوتارە دیبلۆماسیەی کە لەپێشەوە باسمانکرد.

لەرووی ئەو هوشیارییەی گوتارەکانەوە لەبەراوردا بۆ ئەم قسەی سەرەوە، ئەوە دێتەپێشەوە کە ئەگەر لەنێوخۆی وڵاتداو لەبەردەم بەرنامە حیزبیەکان وکەمتر بوونی هەستی نەتەوەیی مەسەلە نەتەوایەتی و پرسی نەتەوەیی زور لەکزیی بێت، یان ئەو مەنفایەبێت کە بەشێك لەحەقیقەتی نەتەوەیی ونکربێت، ئەوا گوتاری هەندەران مەنفایەکی دیکەیە کە سەرجەمی نیشتمانی لەیادەوەری ئەواندا ونکردووەوبەستراتیژدوانیش لەپرسی کوردیدا لەو گوتارەدا مانای گەرانەوەیە بۆ ئوناسی نیشتمانی و کەلتووری لەرێگای گوتاری نەتەوەیی وەلێ لەنیشتمانێکی بەمەنفابوودا، لێرەوە دەکرێ ئەوەش بڵێین کە هەمیشە دابرانی یادەوەری کورد بەتایبەتی لەواقیع وکەلتوور و ژیانی ئێستای لە وڵاتی ئازادی خۆیدا ، لەبیرچوونەوەیەکە لە جوگرافیەیەکی نادیاری دۆزەکان دوور لە زەمینی نیشتیمان.

بۆیە گوتاری نێوخۆ دەکرێ بە گوتاری نەتەوەیی و نیشتیمانی نێو بەرپرسیارێتی و رووبەرووبوونەوەکان لەقەڵەم بدرێ و، لەهەمانکاتیشدا گوتاری هەندەران بەبەشێك لەحەقیقەتی هوشیاری نەتەوەیی و رێگاخواز بۆ یەکبوونی هەردوو گوتار بێت لەپێناو دامەزراندنی نێوەندێکی سیاسی و دیبلۆماتی کوردیی بۆ نیشتیمانی کورد لەلایەك و بیرکردنەوە لەپاراستنی ئەمنی قەومی کورد لە هەر هەرەشەیەکی دەرەکی کە ببێتە هۆی تێکدانی ئارامی وڵات.

# ئامازەی زمانەوانی و دۆزینەوەی دەلالەتی مانا

نیهاد جامی

**ئاناماددگی** میتۆد ئیشکالیەتێکی گەورەی خوێندنەوەی دەقە، چونکە لەو کاتەدا سەر لەبەری تیۆرانینەکان دەکەونە دەردوەی هەموو میتۆدە رەخنەییەکان ، بۆیە پشت بەستن بەمیتۆدێك بۆخوێندنەوە زیاتردەمان بەستێتەوە بەخوێندنەوە کەمان و هەستی ئیلتزامیەتی نووسینمان لەلاپتەوتر دەکات ، بۆیە بەر لەوەی بریار لەخوێندنەوەی دەقێك بدەین، دەبێ بزانین ئەو میکانیزمە رەخنەیانە چین کە کەدەقیان پێدەخوێنینەوە !؟ تاچەند ئەو میتۆدە لەتوانایدایە لەناو ئەو دەقەئیش بکات ؟دواجار ئایە ئەو دەقە ئەو مەرجانەی تێدا دەست دەکەوێ کەخوێندنەوەکەمان بەهەدەردا نەبا ؟ ئەوەش دەسپێکی پرسیارە بۆخوێندنەوە، تاوەکو لەناو ئیشکالیەتەکان خۆمان بەدوور بگرین و پێویستە ئەو میتۆدەی کەدەمانەوێ بیکەینە پانتایەك بۆنوسینەوەی دەق ، مەعریفەیەکی وامان لەبارەیەوە هەبێت کەدەسەلاتمان بەسەریدا بسەپێنی ، بەوەی ئەو مەعریفەیەمان لەناو میتۆد بەرهەم هێنابێ کەدەقەکەی پێ بخوێنرێتەوە ، بەتایبەت لەو جۆرە خوێندنەوانەی نێو رەخنەی نوێ ،چونکە بەدوای کتێبە زمانەوانیەکەی زمان زانی سویسری (فردینان دی سۆسێر) بەناوی زمانزانی گشتی . دەق لەوە دەرچوو رەخنە فرمان بەبونیادەکانی بکات و بەنێگەتیڤ و پۆزەتیڤ یەکلای بکاتەوە ، بەڵکو لەرەخنەی نوێدا و بەتایبەت لەمیتۆدی سیمۆلۆژیا کەمەبەستی سەرەکی باسەکەمانە ، رەخنە دۆزینەوەی ئاستی زمانەوانی و دەلالەتی دەقە ،

کەپرۆسەیەکە بۆداڕشتنەوەی سەر لەنوێی دەلالەت ، زمان لەناو سیستمی نووسین چیتر گۆشەگیر نابێ ، بەڵکو سەرەتا لەگەڵ ( ئاخاوتن ) لەیەك جیادەکرێتەوە و دواتر ئامازە زمانەوانیەکانیش دەست نیشان دەکرێت ، بەدوای ئەوەش ئاستی دەلالی لەناو دەق دەبێتە گوتاریك بۆدواندن ، ئەوەی لەپێشتر بەنێگەتیف و پۆزەتیف دەق ناو دەبرا ، ئەوا لەرەخنەی نوێدا بەدوای زمان و ئاستی دەلالەتی دەق دێنێتە دواندن ، لەڕێگەی قسەکردنەوە لەمانا کە(ئاخاوتن ) کەناڵی گەیاندنیەتی و د اتر هەردوکیان لەڕێگەی (کۆد) ی ڕیکخەرەوە گوتاری سیمانتیکی دەق دەنووسێتەوە ، ئەستراتیژی ئەو گوتارە کار بۆنهێنی نێو نووسین دەکات ، بەدوای هەر خوێندنەوەیەك دەرگایەکی تر بۆ خوێندنەوەی دوای خۆی دەخاتە سەر پشت کە گومان لەخوێندنەوەی پێشترش بکات ، گومانیش دەروازەی ترە بۆ خوێندنەوە بەوردی لەئاستی دیدی جیاوازدوەسەیری دەق بکەین وهەر پرۆسەیەکی خوێندنەوەش لە دیدێکی خودی راڤە بکرێت ، ئەو بۆچوونەی لەرابووردودا یەقینی دەدا بەروتەکانی رەخنە گر ، ئیدی رەخنە گومان لەو یەقینە دەدات ، چونکە ئەو یەقینە تەنیا دیدێکی زاتیانەی رەخنە گرە بۆدەق، بەشکاندنی ئەو هەرەمە رەخنەییەش ئیدی لەلایەك رەخنە بوو بەخوێندنەوەی بونیادە پێکهاتە ناشکرو شاراوەکان و لە روویەکی تریش دەقی وەك رووداوێك تەماشا نەدەکرد، بەڵکو وەك جۆرێك لەزانست رەفتاری لەگەڵدا دەکات بەوەی دەق خاوەن زانستێکی تایبەتی خۆیەتی کە وەك یەکە یەکی دەلالی و سیستمی زمانەوانی مەعریفەیەکی شاراوەی هەڵگرتو وە ورەخنەش بۆ ئەوە دێت بەو مەعریفە پەنهانە ئاشنامان بکات و دەلالەتە زمانەوانیەکانی تێدا بدۆزێتەوە و (زمان /ئاخاوتن ) جیابکاتەوە بۆ ئەوەش هەوڵدەدەین لەئاستی زمانەوانی و دیار کردنی رۆڵی ئاخاوتن وەزیفەی ئامازە لەچیرۆکی (من ومارەکان ) ی رێبوار سیوەیلی بدنێە دوان ودواتر بەراوردێکی دەقەکە بکەین بەچیرۆکی (عیزائیل )ی شیرزاد حسن لەبەراودکردنەکەشدا پشت دەبەستین بەچەمکی (دەقئاوێزان ) و تاوەکو لەو روانگەیەش تشکێك بخەینە سەر رەخنەی پراکتیکی چیتر نزیك بوونی دەلالەتێك لەیەکێکی تر بەبزینی ئەدەبی ئاو نەبەین ، ئەوەی (ژولیا کریستیفا)بەچەمکی (دەقئاوێزان ) تواذی ئەو چەمکە لەشوێنی دزینی ئەدەبی دابنێ

مەبەستمان لەو کارەش هۆشیار کردنەوی ئەوانەیە کەلەناو مەعریفەیەکی کۆنی رەخنەیی و بێناگا لەرەخنەی نوێ بەردەوام کۆمەڵە دەقێك دەخەینە بەر فرمانی تێگەیشتنی خۆیان ، کەلەکاتێکدا ئەو جۆرە دەقانە پێویستە بەو میتۆدە رەخنەییە نوێیانە هەوڵی خوێندنەوەیان بدەین . پێش ئەوەی بێینە سەر دەقی چیرۆکەکە هەوڵدەدەین لەسەر جیهانی چیرۆکەکانی نووسەر لەوکۆمەڵەچیرۆکەی هەڵوەستەیەك بکەین، کاتێ بمانەوێ لەناو ئەوکۆمەڵە چیرۆکە پێوەندی دەقەکان لەگەڵ یەکتری بپچرێنین و هەر یەکەیان وەك بابەتێکی سەر بەخۆ سەیر بکەین : دەبینین لەبەردەم دیدگایەکی ناتەواو داین ، کەزۆر نهێنی ماون پەیمان پێنەبردون تامەزرۆییەك هەیە لەوەی ئەو منداڵەی لە(من ومارەکان ) دەردەکەوێ ئایندەی بەچی دەگات !؟ ئایە ئەگەر ئەوە ڕوداوێك بێ بۆخوێندنەوەئەی ئەوانی دواتر لەکوێ نهێنییەکانی بزانین !؟ چۆن دەکرێ چیرۆکەکانی تر بەهەند هەڵنەگرین !؟ هەموو ئەو پرسیارانە وامان لێدەکەن کەچیرۆکەکان یەکتر ی تەواو بکەن ، هەر بۆیە ئەگەر لەچیرۆکەکە فرۆکەکان دەرمان ڕشتنیان تەنهاهەرەشەیەك بێ لەتوولەمارەکان و بیانوییەکی چەکدارەکان بێ بۆ ئەوەی (باوە ) بەگەڵ خۆیان بخەن ، بەڵام دواتر لە (کەمانی و دوویراکە ) دا کاریگەری دەرمانەکە دەبینین .

ئەوەتا براکانی لەژووردا بریندار خستووە پزیشکەکان ووتو یانە "پانکەیەکمان بۆدابگیرسێنن و پەردەیەکی تەنکمان بدەن بەسەردا "لاپەرە 58 وەك چۆن (رەحیم دیگوڵ ) ئەو کوڕەی (من ) ی گێڕەرەوە لەدیوەخانەوە دەباتەوەلای دایەو هەندێ شەو کچەکان لێی وەردەگرن و تایاری لەگەڵبکەن ، دەبینین لەچیرۆکی (خەونەکەی خا حەبی ) دا ئەو چارەنووسی دیاری دەکرێت ، بەوەی کاتی نەخۆشی بەدەستی دکتۆرەکان دەمرێت و دواتر جارێکی تر لە "هاتنی پیاوەگەورەکان " دەردەکەوێتەوە ، لەوێدا یادەوەری بەرەو منداڵی دەمان باتەوە ، ئەو یادە وەرییەی (من ) نووسینەوەی هەستەکانی منداڵێکە لەرێگەی ئەو (من) ەوە دیدی خۆی بۆنێستاو سەیرکردنەوەی بۆیادەوە ری لەرێگەی ئەوکەسایەتی یەوە دەخاتە ژێر پرسیارەوە ، لەوەی بۆچی پرسیارەکانی بێ وەڵام بوونە ، لە(من ومارەکان ) نازەنێ زڵلەیەکی لێدەدا پێی دەڵێ شەیتان بووی ، ئەو نازانێ بو زەڵلەی لێدەدرێ و شەیتان بوونی یانی چی !؟.

کاتێ لە(خەونەکەی خاحەمێ ) ش پرسیار لەمامۆستا دەکات (وسڵ چییە ؟)
دیسان بەزللەیەك وەڵام دەدرێتەوە بۆچی پرسیارەکانی ئەو وەڵامەکانیان زللەیە !؟ ئەوەیان پرسیارێکەو ئاراستەی سیستمی ئاکارو. ماڵی کوردی دەکرێ، نەك بۆ ئەوە بکرێ کە ئەو بیەوێ وەڵامی بداتەوە . بۆیە ئەو کۆمەڵە چیرۆکە لەکەلتوورێك دەدوێن کەیادەوەری خاوەن وێنەیەکی جێگیرە تیادا ، هەر ئەو یادەوەریەشە وا دەکات لەدوودیدی جیاواز سەیری دونیابکات : دوودیدکە دواجار یەك مانا بەرهەم دێنێ لەوەی ئێمە دەکەوینە نێو دیدگای "گوناه/ گوناهبار " ئێمەی گوناه دەبێ بەبێ هەموو بیانوویەك لەدێهاتەوە بەرەو شار ڕەوە بکەین ، بەبیانووی ئەوەی ژیانێکی باشترمان بۆدابین دەکرێت ئەگەر چی دواتر شار تەنیا دەبێتە مایەی ریسوایی ئێمە، شار یادەوەری دەکوژێت بەبیانووی ئەوەی رابوردوومان جۆرێك بووە لەیادی بوونی دەبێ شار تۆڵەمان لێبکاتەوە ، دیدی دووەمیش "ئێمەی گوناهبار " رەخنەیە لەشۆڕش لەوەی ناتوانێ ببێت بەئومێدی ئێمەو هەڵگری ئەو خەونانەمان بێت، بەڵکو ئەویش زەبری زەنگێکی تر دەنوێنێ لەرێگەی دەست بەسەر داگرتنی سامان و رێگری ئەوەش ئەگەر بەحکووم بوونی هەموو باڵەکانیش نەبێت ، بەڵام رەخنەیەکە لەناو جەستەی شۆڕش بوونی هەیە ،ئەو دوودیدەیە کەدواجار پێوەندی راستەو خۆیان هەیە بەماڵ ، یەکەمیان لە(ماڵ ) دەرمان دەکات بۆکۆچ بەرەو (شار ) ئەوەی دووەمیشیان دێتە سەر (ماڵ ) بۆئەوەی ئارامی ئێمە بشێوێنێ بەدوای ئارامی و نان خواردن و پشوودانی خۆیەوە بێت ، کاتێ ئەو دیدگا کوردیە دەنووسرێتەوە ، هەرگیز شۆڕش بیر لەوە ناکاتەوە ئەم کوڕی دوێنێیە و لەناو ئەو شوێنەدا گۆش کراوە و ئەگەر (ماڵ) نەبوایە ئەویش نەی دەتوانی درێژە بە (مانەوە ) ی خۆی بدات . ئەلێرەوە کەبەدنیای چیرۆکەکان ئاشنادەبین ، کاتی ئەوەیە ئیتر بێینە سەر (من و مارەکان ) ئەو چیرۆکەی مەبەستی ئەم نووسینیە .

ئەگەر بەپێی چەمکە(سۆسێر ) یەکەی لەو دەقەدا (ئاخاوتن) مان لە(زمان ) جیاکردەوە ئەوسا ئاخاوتن دەسەڵاتی زیاتر دەردەکەوێ ، بۆئەوەی بابەت بەسەر زمان زاڵ بکات ، ئەگەر چی لەهەندێ باردا زمان دەیەوێ لەرێگەی گەمە کردن بەدەلالەتەکانی

ئاخاوتن فۆرمی خۆی وێنابکات، بەڵام دواجار دەلالەتی ترمان بۆ دەکێشێ، بەوەش رێگە دەگرێ لەوەی بونیادی شاراوەی زمان ئامازە بەرهەم بێنێت ، بەڵکو ئەوەی پەیوەندی بە خوێنەرەوە دەکات ئاخاوتنە ، ئەوەش وادەکات ئەو بۆشاییەی (خوێنەر ) لەگەڵ هەر (دەق ) یەکدا لەرێگەی گەمەکردن بەدال کە شفی بونیادی شاراوەی زمان دەکات تەسک بێتەوە ، چونکە لەوکاتەدا ( مەدلول) لە پرۆسەی خوێندنەوەلە شوێنی ( دال ) کاردەکات ، بونیشی لەشوێنی دال بەواتای دەرکردنی ئامازەیە، ئەوکاتەش زمان توانای ئەوەی نابێ فکر بخولقێنێ بەڵکو ئاخاوتن هەوڵی دامەزراندنی فکر دەدات، بەوەش ئاخاوتن وەزیفەی سەرەکی دەبێتە بەخشینی مەعریفە لەرێگای گێرانەوەی زەمەنی رووداو، ئەوزەمەنەی لە ( ئێستا)دا مناڵێك دەمانباتە ناو فەزای دەق و دەیەوێ دوو زەمەنی ترمان لا بکات بەپرسیار(زەمەنی ئایندە)و(زەمەنی رابردوو)، زەمەنی ئایندە بەخولقاندنی پرسیارێك دەمانگەڕێنێتەوە بۆ زەمەنی رابردوو ، ئەویش ئەو پرسیارەیە کە (ئایندەی من ) چیە لەکاتێکدا رابردوو کلتوری ترسی تیا خەزن کرابێت !؟ دیارە بۆ وەڵام بەم پرسیارە دەق دەبێ بگەڕێتەوە بۆ رابردوو ، وەك ئاشکراشە گێرانەوە بۆ ئەو زەمەنە لەتوانای (من ) ی گێرەرەوە نییە ترسە ئەستیەکان دەست نیشان بکات ، ئەو گەڕانەوەیە بەرەو ئەست لە تێروانینی (جاك لاکان ) ەوە گەرانەوەیە بۆ توانای زمان ، چونك ( ئەست ) و ( زمان ) بەلایەوە وەك یەك بونیاد نراون ، ئەست بەرەو تواناکانی زمان دەگەڕێتەوە ، ئەو گەڕانەوەیەش رزگاربوون نییە لە ئاخاوتن ، هێندەی بەرهەم هێنانی ئامازەیە لەناو زماندا (( دەمزانی کەناوێرم بچمە سەر ئا ودەستەکە ، دەترسام لەکونەکەیەوە بکەومە خوارو دێوەکە بێت بمخوات )) ل9..

بۆیە ئەگەر لەو دێرەوە بگەڕێینەوە بۆیەك لەزمانەوانەکانی ( قوتابخانەی ژنێف) کەخۆی بەموریدی ( سۆسێر ) دەزانێ ، ئەویش ( ئەلبێرت سیشهایی ) یە ، بایەخی فاکتەرە زمانەوانی و دەرەونیەکان لە رستەدا لەیەك جوێ ناکاتەوە . ئەوادەکرێ ئێمەش لەناو رستەکانەوە ئەوفاکتەرە دەرونیانە لەپاڵ زمانە وانیەکان فەرا مۆشی نەکەین ، ئەوکارەش بەمەبەستی دۆزینەوەی پرسیاری دەقە . پرسیار لەوەی چی وادەکات (من ) ی گێرە رەوەو پاڵەوانی سەرەکی چیرۆکەکە نەخۆش بکەوێت !؟ ئەوەش لەناو دەلالەتە زمانەوانیەکانی

رستەو دێرەکان وەڵامەکەی وەدەست دێت ، بەوەی ( کاکە ) رەفزی ئەوە رەتدەکاتەوە لەگەڵیدا بچن بۆ خانەقاو ( باوە ) ش دەست بە تەلاق خواردن و جنێو بارانکردنی دەکات و (دادە ) ش نووچرك و هەڕەشەی ئەوەی لێدەکات کە ئەیداتەوە بەقەرەجەکان ، ئەوەی دەمێنێتەوە ( دایکە ) کەتەنیا شوێنە بۆ داڵدەدان ، بۆیە فاکتەرە دەرونیەکانی ناوڕستە ئەوەمان بۆ ئاشکرادەکەن کە هۆکاری نەخۆش بوونی بۆ دۆگما بوونی پەیوەندیەکانی ماڵ دەگەڕێنێتەوە، ئەو پەیوەندیانەی تەنها لەجیهانی خەوندا لێی رزگار دەبێ، وەك دەبینین (مارەکان) بۆ رزگار بوونی منداڵەکەیە لەنەخۆشی، بەوەش سیوەیلی دەیەوێ (مان) بکاتە ئەو ئامازەیەی کە لەشێوەی (شامان) چارەسەری منداڵەکە مکات،(شامان) ئەم قەشە جادووگەرەی لەرێگەی گێرانەوەی حیکایەتەکان هەوڵی دەدا چارەسەری ئەو نەخۆشیانە بکات کە کت و پڕ تووشی مرۆڤ دەهاتن (مارەکان)یش منداڵەکە دەخەنە دنیایەکەوە کەدای بچن لەواقیع (( من مارەگەورە. کا خەفوری پلە سەلمێ دروزنەکا )) ل[8] ئەوەش خولقاندنی جیهانێکی ترە لەبەرامبەر ئەو حەقیقەتەی کە ترسیان لادروست کردووە ، ئەو ترسەی دە پەڕێتەوە نێو نەست و ، وەلأم بەپرسیارەکانی عەقڵ دەدات، مارەکەی واقیع کەدواجار لە جیهانی ( من ) دایاری لەگەڵ دەکەن و دیالۆگ لەنێوانیان دروست دەبێ ، جەستە یەکە بۆ غەریزە ، وەك چۆن ( من ) ی گێڕەرەوە لەژووری کچەکاندا دەبێتە ئەو مارەی کچەکان بۆ چێژی زاتی خۆیان ئەمەیەك سازدەکەن ، بەدوای داخستنی ژوورەکە جلەکانی لەبەر دادەکەنن تا بچێتە ژێرکراسی یەك لەکچەکان (( زۆر حەزم دەکرد لەسکی نازەنیندابم و جاری واهەبوو نۆمانگ و نۆ رۆژو نۆسەعاتەکەش تەواو دەبوو ، من نەدەهاتمە دەر، ئەمجا هەموویان پێدەکەنن و ئەیان گووت کە رانی وەرەدەر ، بایاریەکە تێك نەچێت" ( ل[10] ) .

ئەگەر مارەکە غەریزەیەك بێ نەك هەر بۆ خۆسەپاندنی نێرایەتی (پیاوەتی) بەڵکو غەریزەی شەهوەتیش بەرهەم بێنێ، ئەواگەمەی (من) لەگەڵ (نازەنین) گەمەیەکە بەهەمان شێوە لەگەڵ مارەکان "جاریێ نا.ەم چونکە نازەنین لەکۆلم دەکات " ل[14]، گەمەیەك دواجار منداڵەکە هەستی پێدەکات کەئارەزووەکانی بۆ غەریزەی شەهوەت لەئارەزووی بۆ

گەمەکان دەبزوێ ' بەوەی کاتێ"هێواش دەبووەوە ئادەستێك لەنێوان هەردووقاچەکانم بدات ،لەپردە وەستا دایدەگرتم و ئەی گوت کەمن شەیتانم زللەیەکی لێ دەدام و من ئەم دەزانی بۆ ئازەنین زللەی لێ دام "ل[15]،ئەوەش سەرەتایەکە بۆ ڕێگە گرتن لەپرسیار ، لەوەی لەو کاتەی ئارەزووەکان گەشە دەکا بەزللە وەڵامی پرسیارەکان دەدرێتەوە ، ئەو رستەیەش فاکتەرێکی تری ئەخۆش بوونی ئەو دەبێت بەوەی کۆمەڵگا نایەلێ خۆی بناسێنێت ، بۆیە ئەگەر لەدیدی(سیشهایی )ەو لەرستەکانی ناو چیرۆکەکە وردبینەوە کەنەك هەر گێرانەوەی رابردووە ، بەڵکو پێش بینی زەمەنی ئایندەش دەکات ، ئەوەش لەرێگەی تێگەیشتنی لەنەریت کەئاخاوتن فاکتەرە دەروونیەکان دەستتنیشان دەکات بەوەش دەکەوینە ناو جۆرێك لەئائامادەگی زمان ، چونکە (ئاخاوتن) نهێنی ئاشکرادەکات و ئەوەی چەکدارەکان بە (باوە )ی دەڵێن ئایانەوێ دیگوڵ و منالەکە گوێیان لێ بێت کەدەکرێ ئەو نهێنیە دواجار ببێت بەئاماژەی زمانەوانی و نێو دەق کەسەر لەبەری ئاماژەکان لەوێوە هەوڵی دەسکەوتنی مانا بدەن ، کەچی (ئاخاوتن ) نهێنیەکە ئاشکرادەکا "تووڵەمارەکان دەبات بۆ شوێنێکی تر چونکە تەیارە سەگبابەکان دەرمانیان ڕشتووە "ل[21] بەئاشکرا کردنی نهێنیەکانی ناو دەق نووسەر بونیادی شاراوە بۆخوێنەر جێناهێلی، لەئاشکرا بوونی نهێنیێ ژوورەکەش ئیدی لەوە دەگەین کەچەکدارەکان هاتبوون بۆ ئەوەی بەدەرمان رشتنی فرۆکەکان بماترسێنن و بە(باوە )ی ئاکە پیاوی ئاواییش بڵێن کەدەبێت لەگەلیان ببێت بەچەکدار،بەو کارەش گوندەکە دەبێتە مێگەلی بێ شوان ، لەمەترسی بێشوانیش هەرەشەی هەموو ساتەی مەرگ نزیك دەبێتەوە ، بۆیە (من )سزای (بەرامبەر )ی لەسەر لادەچێ و کاکە بۆخانەقا دەیبات و دادەش بە کوڕی ماڵەوە ناوی دەبات ئەك قەرەجەکان ، ئەو دێوی مەترسی هاتنەدەرەوەشی لە کوونی ناو دەستەکە لێ دەکرا ، ئیتر باوەچووە بیکوژێ . بەوکارەش شۆرش دەبێ بەگۆڕینی ئاماژەکانی ترس بۆ ئاماژەی خۆشنوودی ، ئەگەر چی ئەوە وەهمێك بێت بۆ رێگە دان بەکووشتن و دامەزراندنی مەرگدۆستی لەناو کەلتووری ئێمەدا، کە بێشك (گێرانەوە ) لەو کاتەدا لەناو( ئاستی رابردوو) دەرناچێت چونکە ئەوەی (من ومارەکان ) دەگێرێتەوە ئەوە (من)ی منالێ نییە رابردوو دەگێرێتەوە ، بەڵکو(من )ی نووسەرەکە یادەوەری منالی لەئەستی

خەفەکراویدا دەتەقێتەوەو دەیەوێ بارەو ساتەکانی منالّی بگەڕێتەوە ، تاوەك و بەسەیر کردنەوەی بۆئێستا لەرابردوو چیرۆکەکەی بگێڕێتەوە ، (گێرشانەوە ) ش فاکتەرەدەروونیەکانی لەناو ئاخاوتن .ا جێگیر کردووە تاوەکو خوێنەر بتوانێ دەلالەتی دەقەکە لەناو ڕستەکاندا بدۆزێتەوە، ئەوەش دا چەندە(ئاخاوتن)بەسەر زمان زالّ دەکات، بەلاّم ئەو کارە نەبووەتە مایەی ئەوە؛ کەنوسین دەقێکی کراوەمان پێنەبەخشێت ، بەڵکو دەق خاوەنی سیستمێکی زمانەوانی سەربەخۆیە ، کەبتوانێ دەق لەئاستی گێرانەوە بۆئاستی مانا بەرێت ، ئەوەش خاڵێکی جەوهەریە کەلەناو چیرۆکی کوردیدا بەدەگمەن دەیبینین هۆیەکەشی ئەوەیە لەو دەقەدا چیرۆك نووسەکەمان هەر بەتەنیا مەبەستی گێرانەوەی یادەوەری نیە ، بەڵکو دەیەوێ گۆڕان لەزەمەنەکان بکات بەوە ی بەهەموو ئاراستە زەمەنیەکانەوە چیرۆکەکەمان بۆ بگێڕێتەوە ، ئەوەش بەخشینی (دەقی کراوە)یە دەقێك لەئاستی گێرانەوەدا ئامارەی خۆی کە (مارە) بەرهەم دێنێ لەرێگەی (من) ی منالّەوە بۆگێرانەوە لەلایان (من )ی ئێستا (من ی نووسەر ) ، ئەوەش پەیوەندی (نووسەر) بەنووسین دەکاتە زەمەنی زات لەناو نوسین کەنووسینەوەی مێژووی زاتە بەدیدێکیترەوە ، مێژوویەك کەبوونی یەك کەلتووری مالّ رادەکات رابردوومان لەیەك بچێت ئەوەش بەراوورد دەکەین بەدەقێکی تر کە چیرۆکی (عیزانیل)ە هەولّ دەدەین شێوەی لێکچوون کەسێتیەکەکان و پێومندیان و جیاوازیان لەرووی بیرکردنەوە و ئەو گوتارەی کەدەبێتە ئامارە بۆناسینەوەی خێزان ودواتر لەناو کۆمەڵگا گوتارێکی سۆسیولۆژی بەرهەم دێنێت کاتێ سەیری هەردوو چیرۆکی (من ومارەکا ن و(عیزرائیل) دەکەین ، ئامارەکان دەلالەتی لەیەك چوو بەرهەم دێنن ، ئەگەر چی ئامارە لەسەر یەك لەچیرۆکەکان لەناو سیستمیکی زمانەوانی سەربەخۆیە کەناچنەوە سەر یەك ،بەلاّ. ئەوەی والەکات نزیکیەك بکەوێتە نێوانیان ئەو ئامارانەیان کەهەر یەك لەبەرهەم هێنەرانی دەق فرێی دەدەنە نێو نووسین ، ئەو ئامارەسۆسیۆلۆژیانەی کەلەپەیوەندی خێزانەوە سەرچاوە دەگرن و دەقەکان دەیانەوێ ئەوئامارە کۆمەلاّیەتیانە جارێکی تر بەکار بخەنەوە ، بەلاّم هەر یەکەی لەناو سیستمی جیاواز و بەخشینی دەلالەتی فیکری سەربەخۆمانا دەنووسێتەوە ، پرۆسەی نووسین لەو

کاتەدا ڕەخنەی نوێ بەدەق ناوێزان ناوی دەبات ، چونکە دەق دابڕاو نیەلە و پاشخانە مەعریفی و ڕۆشنبیریەی پێش خۆی ، بەڵکوو ئەوەی لەدەقەکاندا گرنگە زمانە ، زمانە سیتمی جیاواز بەخۆی دەبەخشێت ، ئەگەر بەزمانی (کریستیڤا) بدوێین ئەوە دەڵێین زمان کێشەکان دەگوازێتەوە بۆ ئەبستمۆلۆژیا ئەوەش وادەکات بەتەواوی ترێنی ئەدەبی بخرێتە دەرەوەی نووسین ، چوونکە نووسینەوی دەلالەتەکان لەرێگەی ئامارژەی زمانەوانییەوە فرمانێك بەئامارژەکانی ناو دەق دەبەخشێت ئەگەر دەق ناوێزان بەدووجۆر پۆلین بکەین (ئاگایی/ ئائاگایی) ئەوا (گریمانی ئائاگایی ) زیاتر دەسەپێتە نێو هاوتزیکی ئامارژەی دووچیرۆکەکە ، چونکە دەقێکیان لەسەر ئامارژەکانی ئەوی تر بەرهەم نەهاتووە ، بەڵکو هەردوودەقەکە لەسەر ئامارژە کۆمەڵایەتیەکانەوە هاتوونەتە ناو نووسین ، سیستمی پەتریارکی ئەو دونیایە کەنووسین دەیەوێ بەدەلالەتی جیاواز بنووسێتەوە (مـن) لە (مـن ومارەکان ) ئاگری جگەرەی باوك دەشوبهێنێ بەمارە گەورەکە "سەیری ڕووناکی جگەرەکەی باوەم دەکرد کەلەنا و تاریکیەکەدا وەك چاوی مارە گەورەکە دەدرەوشایەوە " ل[9].. ئەوەش بەو مانایەی کە(من) و تووڵەمارەکان سەربەنەوەیەکن ، ئەوەیەك (باوك / مارە گەورەکە ) حاوەن دەسەڵاتن بەسەریاند ا ، باوکێك لەلای (مـن) ی( شێرزادحەسەن) ، بەعیزائیل ناودەبرێت " هەر ئەو شەوە مـن زانیم ئەو عیزائیلەی لەشەوی برینەوەی هەنجیرە خۆشەویستەکەمان لەتەکتا خەوت باوکمان بوو " گەرەکی داهۆڵەکان (چیرۆکی عیزائیل )لاپەرە "137"، چونکە لەش لەوماڵەدا وون بووە ، فریادڕەسەکەی مردووە ، مردن وەك ئاراستەیەکی بایەلۆژی و قەدەری ئامادەگی لەشی کووشتووە ، چوونکە بەوەستانی (لەشی زیندوو) کار کردن لەدەرەوەی پرۆسەی لەش ، بانگە شە بۆمردنی خۆی دەکات .

لێرەدا تۆزێکی تر لەسەر پەیوەندی عیزائیل و جەستەی باوك دەمێنینەوە ، ئەو پرسیارەی ئاراستەی نووسین دەکرێت لێرەوە دێتە نێو تێرامانەوە کەپەیوەندی باوك بەلەشەوە چیە !؟ دیارە باوك وەك لەشێکی ئازاد و داتەپیو ڕێگای هەموو چالاکیە فیسۆلۆژیەکان دەگرێت بەهۆی سەرجەم یاسا ئاینیەکانو نەریتە کۆمەڵایەتیەکان لەشی مناڵەکانی کلۆم داوە ، ڕێگا نادات ئەوان خاوەنی لەشێکی ئازادبن ، بۆیە گەمەکردن بە لەش

بەپەناگەیەك دەزانێ، چونكە پێیوایە منا ـەكان بەهۆی لەشەوە تووشی بەد رەوشتی دێن ، ئەوەش بەپێی ئەو چەمكە كۆمەڵایەتیەی كەلەش تەنها دەبێ لەنێو سیستمی خێزان پیادە بكرێت ، لەشی باوك عیزرائیلی منالەكانە، بۆئەوەی ئەوان لەدەرەوەی چێژی لەشەوە بن ، بەمەبەستی دەرنەچوون لەماڵ ، باوكێ، لەكاتێكدا ئازادی بەلەشی خۆی داوە چ كاتێك ویستی لەگەڵ لەشی دایك تێكەڵ دەبێ، ئەچی لەشی منالەكانیشی كووشتووە ، دایك وەك منالەكان لەشیباوك بەعیزرائیل دەزانێت ، ئەو خۆ بە وەكاشەیەكەوە دەبینێ بۆرزگار كردنی لەشی ، چونكە باوك دوور لەچێژی هەردوو رەگەزەكە سەیری دەكات ، لەلای ئەو عیزرائیلێكە بۆی هەیە گیانی هەموویان بكێشێ، پرۆسەی زایەند بەگیان كێشان دەزانێت ، دایك بەر لەوە ی بچێتە نێو ژیانی هاو سەری ئومێدێكی هەیە بەوەی لەنێو پەیوەندی هاوسەری لەشی داخراو ئازادبكات كەچی دواتر تێدەگا ت (جەستەی بەرامبەر ) رێگای ئەوە نادات ئازاد بێت ،بەڵكو تەنها بۆ چێژی خۆی سەیری جەستەی دەكات ، بۆیە دایك بەو حەقیقەتە گەیشتوە كەپێكهاتەی خێزان توانای رزگار كردنی لەشی داخراوی نیە ، بۆیە پەنا دەباتە بەر ئەو خەونە ... ... ڕێگا ـ كەرە ، بەڵام وەك هەموو ئەو ئیرۆسیانەی كوژران لەشیش توانای رزگار بوونی ... . ... لەكاتی تەسلیمبوونی بەلەشی باوك ئیدی لەلای منالەكانی ئەو ژنەمیهرەبانەی باوك رازی دەكات لەئاستی منالەكانی بەگوناهبار دەناسرێت ، كەئەوەش تەسلیمبوونی دایكە بەغەریزە و پشت كردنە سۆزی منالەكانیەتی ، كەئامادە نیە گوێ لەهاواریان بگرێت" دایكە توخوا بێخەلەكەت جیاكەرەوە .. چیتر لەگەڵ ئەو دێوە مەنوو .. هەناسەكانی هالآوی دۆزەخن . وەی لەو ددانە زەردەكانی كەجگەرەژەهراوی كردوون .. تۆ چۆن دڵت هات جگەر گۆشەكانی خۆت بۆئەو بفرۆشیت " ل[127] ، دایكیش كەسێكە لەژێر جەوری باوك دەناڵێنێ وەا، منالەكانی ئازار دەخوات ، دوای دەرچوونیش لەماڵەوە جارێكی تر دێتەوە بەهەمان شێوە ملكەچ دەكا بۆ ئەو دەسەڵاتە ، چونكە هاتنەوە بۆ ماڵەوە . گەڕانەوەیە بۆ نێو نوێنی باوك ،باوك كەوەك عیزرائیل لەناومال دەناسرێ فەرمان رەوای (منال .. ژن .. درەخت.. دیوار )ە ، هەوڵی سڕینەوەی پەیوەندیەكانی ئەو ماڵە دەدات ، لەوانە بڕینەوەی دار هەنجیرەئە پچڕانی پەیوەندیەكانی خێزانە بەسرووشتەوە

، کەسەکان لەدیدی دایکەوە بەپچڕانی ئەو پەیوەندیە تووشی شکست دێن ، ئەوەش شکستی یادەوەری زەمەن و لێڵکردنی داهاتووە . "سەمە مردنی ئەو کچە لەئەستۆی تۆدایە "ل[128] ، "سەمە.. ئەوەش هەر ئامی دار هەنجیرەکە بوو لەعنەتی وەکاشەیە "ل[130].

چونکە دایک بڕوای ڕەهای بە بەها پیرۆزەکان هەیە، کەئەویش بەنەفرەتی گیانێکی پیرۆز دەزانێ، بڕینەوەی دار هەنجیرەکە داڕزانی پەیوەندیە ئەڵقە گرێدراوەکانی ماڵە ، دایک هەموو کارەساتێکی ئەو ماڵە بۆدار هەنجیرەکە دەگەڕێنێتەوە، منالی دەمرێ و دەستی یەکێکی تر دەشکێ پاڵەوان لەباوەشی ئازێ دەبێ و فەرهاد هێلانە کوکوختێکانی دەڕوخێت، ئاشکرا بوونی عیزرائیل وەلانانی دەمامکی میکافیلییەتی دایکە ، چونکە دایک شوناسی عیزرائیل لەمناڵەکانی دەشارێتەوە ، بەڵام دوای باڵق بوونی پاڵەوان ، ئەوە کەشف دەبێ کە (عیزرائیل )ئەوەی دێتە نێو پێخەفەکەی دایکە وە لەشی باوکە ، ئەو کەسە یە کەدار هەنجیرەکەی بڕیوەتەوە و هەموو پەیوەندیەکانی ئەو ماڵەی پچڕاندووە ، بۆیە ئەو کەسە وەهمییەی دایک بەعیزرائیلی ئاسمان ناوی دەبات، دەرکەوت هەمان عیزرائیلەکەی ماڵە ، کەواتە باوک لای دایک عیزرائیلە ، بەڵام بەو ناوە بەفریشتەی ئاسمان دەیشارێتەوە "دایکە ئەی تارمایی ئەو زەلامەی هەمدێ شەو لەژوورەکەماندا هات و چۆ دەکا .. ئاو دەخواتەوە .. دەخزێتە ناولێفەکەی تۆ ؟" ل137 . باوک کاتێ بزانێ لەشی بەرامبەر نایەتە ژێر بار ئەوا هەوڵی ترساندنی دەدات بەهۆی سزای داهاتوو ،بۆئەوەی مەترسی گوناهێکی گەورەی بەرامبەر ڕابگەیەنێ "سبەی جوومعەیە.. خواغەزەب لەتۆ دەگرێ "ل139، ئەویش بێ دەسەڵاتی باوکە بۆ تێکەڵبوون بە لەشی دایکەوە ، ئەو لەو کاتەدا لەبەرامبەر لەشی داخراودا کەسێکی بێ دەسەڵاتە و هەموو خولیایەکیشی لەو ساتەدا تێکەڵ بوونە بە بەرامبەر ، تێکەڵ بوون بە لەشی مردوو خولیای عیزرائیلەکە تەنها چێژیش بۆخۆیەتی و لەشی مردوو (دایک ) لەو پرۆسەیە چێژوەر ناگرێ ، چونکە ئەو لەدەرەوەی لەزەت دەژی بەهایەکی چێژبەخشی لەلایەن بەرامبەرەوە پێی نادرێت .

ئەو نووستنە لەلایەن (ڕێبوار سێوەیلی) لەچیرۆکی (من ومارەکان )هەمان دەلالەت بەرهەم دێنێتەوە ، بەڵام زمان ئاراستەیەکی تر بەمانا دەبەخشێ ،لەوەی باوک ناپارێتەوە،

بەڵکو داوادەکا ، کاتێ دایك ئایەتە ژێر بار پەلامار دەدرێت "باوە بەدایەی گووتوە کەدایە بۆنی خۆشەو دایە پێی ووتوە وەختێ نیەو ئەم شەو ماندووە ، ئەمجا باوە تووڕە بووەو پەلاماری دایەی داوە ، دایە ناڵاندویەتی و منیش ئەم وێراوە شتێك بڵێم ، باوەش دوایی پرخەی هاتووە و منیش چوومە لای دایەوە و زانیومە دایەلەتاو ئازار گریاوە "مـن و مارەکان ل11 . دیارە پەیوەندی غەریزە ی (من ) ی دەقەکان جیاوازن بەهۆی تەمەن و گەشەی فیسیولۆژی جەستەیانەوە ، لە(عیزرائیل) دا (من) لەتەمەنی باڵق بوون دایە و هەست بەغەریزەی خۆی دەکات و (نازێ ) شەیدای کردووە "هەر لەژێر هەنجیرەکەی تۆدا هەردوو باسکم لەقەدی دەئاڵاند و هەڵم دەبڕێ ناهەنجێرێك لێ بکاتەوە .. دەم و لووتم لەو چاڵە گیر دەبوو کەناوێرم ناوێ بێنم دایکە " ل130 . کەچی( من ) لە (من ومارەکـان ) منداڵێکەو بەلأم هەست و ئارەزووی بۆغەریزە هەیە لەسەر ئەو بنەما سایکۆلۆژیەی کەئارەزووەکانی مرۆڤ بۆ غەریزە لەمنداڵیەوە دەستپێدەکات "من کوڵی نازەنینم لەکوڵی دادە پێخۆشترە " ل11 زمان لەکارکردن بەدال مانای جیاواز بەرهەم دێنی کەئەوەش بەڵگەیە بۆ سەر بەخۆیێ سیستمە زمانەوانیەکان ، لە (عیزرائیل ) دا دایك دوای ئەوەی هەستدەکات کوڕەکەی شەیتانی بووە ، ئیدی رێگا بەخۆی نادا لەگەڵ باوك بخەوێت "ئیتر چیتر لەتەکتا نانووم .. تەواو ئیدی شوورەییە .. منداڵەکان گەورە بوون .. عەیبە هەموو لەیەك ژووردا بنووین " ل136 کەچی لە(من ومارەکان ) کاتێ (نازەنین ) بەدایکی دەڵێ کوڕەکەی شەیتانە هەستی سێکسی دەبزوێ ، باوك بەپیاو سەیر دەکات و لەگەڵ خۆیدا دەیباتە دیوەخان بۆ لای میوانەکان ، دایکەکەش لەکاتی نووستن وەك دایکەکەی (عیزرائیل ) ناکات ، نەك هەر هیچ ناڵێت بەڵکو بەبێ قسە لەگەڵی دەخەوێ بەجیاواز لەشەوانی رابردوو "باوە وەك منداڵ لەدایە ئەپاڕێتەوە و دایە ئەو شەوە هیچی نەدەگووت ، من هەر لەژێر پەتۆکە تێنەدەگەیشتم بۆ دایە ئەم شەو هیچ ناڵێت و باوەش هەر بەقوربانی دایە ئەبێت " ل16 .

ئەگەر چی ئاخاوتن تووڕەیی هەڵەیەکی نێو زمان دێت ، بەوەی گەر دایە بێدەنگەو هیچ ناڵێت باوە بۆچی وەك منداڵ دەپاڕێتەوە !؟ یا ئەوە سیفاتێکی (باوە)ش بێت کە لەنێو نوێن هەر بپاڕێتەوە، ئەگەر چی ئەو پرسیارە مەبەستی نووسینەکەی ئێمە نیە بۆیە

جێیدێڵێن، چونکە مەبەستی ئێمە لەوە دادەنێرەدا تەنها قسەکردن بوو لەچەمکی دەقناوێزان ئەو چەمکەی هەر بەتەنیا لەئیدیۆلۆژیم دزینی لەناو دەق دەرنەکرد ، بەڵکو ڕەخنەیەکی نوێی هێنا یە ئارا، ئەویش (ڕەخنەی ئەبستمۆلۆژی ) بوو ، کەدەق .. ژیانی ڕۆشنبیری تێکەڵ بەژیانی کۆمەڵایەتی دەکات ، بەوەش دەق دەکات بەزانستێك کە مەعریفە بەرهەم دێنێت ، ڕەخنەش لەو کاتە دا ڕۆڵی لەدەق کەمتر نابێت ، بەڵکو وەك دەق هەوڵی دەرخستنی ئامازەکان دەدات ، ئەوەش گەڕانەوەیە بۆ دەقەکانی پێشوو بەوەی بزانێت لەناو دەقەکەدا ئەو نهێنیە چیە کە زمان دەینووسێتەوە وەك لە (من ومارەکان) دا زمان لەڕێگەی (ئامادەبوونی مەعریفی ) ئامازەکانی ناو زمان دەنووسێتەوە ، بەوەش لەبەرامبەر دەقی (عیزرائیل) دا دەبنە دوودەقی سەر بەخۆ کە زمان لەیەکتریان جیادەکاتەوە ، بەوەی هەر یەکێکیان ڕووبەری ئادیاری خۆی هەیەو لەناو زمان ئاشکرای دەکات ، بەواتای دەقی (عیزرائیل )نابێ بە (یادەوەری دەق ) بۆ (من و مارەکان ) ، بەڵکو پێوەندیەکانی خێزان دەبێ بەیادەوەری بۆ هەردوو دەقەکە .

<u>ژێدەر</u>

* من ومارەکان / ڕێبوار سیوەیلی

مەلبەندی لاوانی میدیا/1999 لاپەڕە (5-22)

** گەڕەکی دلەوڵەکان /شێرزاد حەسەن

(کۆمەڵە چیرۆك) چاپی یەکەم /1997 (چیرۆکی عیزرائیل) لاپەڕە (127-141 )

*** سیمۆلۆژیاله سۆسێر بۆچۆمسکی / نیهاد جامی (کتێبێکی دەست نووسە)

# کەمۆسیقا لەوێ نەبێ.. پڕاوپڕ دەبم لەگوناه

## خوێندنەوەیەکی ئیستاتیکیە بۆ سیمفۆنیای نۆیەمی بتهۆڤن

(پێشکەشە بەرەگەز رەشید کەئەو رۆژە لەتورەگەی رەنگەکانی چەپکێ رەنگی بۆ ناردبووم)

رەوشت رەشید

-١-

**هاوڕێ**.. تۆ ئەی ئەوەی تاریکی پەنجەرەکانی گرتویت، من نازانم ئێستا لەکوێی غەریبیدا وەستاویت، ناشزانم ندجەبی چەندەمی فیراقیت، وەلێ ئاگادارم هەرگیز تۆ ختمی ئەو ئنجیلی عیشقەت پێنەکرا.. دەزانم ئێستا جارنا جارێ چاوەکانت لێکدەنێیت و روخسەت لەو جەستە هیلاکەت ناخوازیت و بەناو یادەوەرییەکی پڕ لەخەفەت و وێرانی بیر لەمن دەکەیتەوە.

ئەی هاوڕێی تەراونەکردنی چیرۆکەکان.. ئێستا لەم شارە کەئیبەدا لەکونجی گەرەکێکی بێناونیشان چرایەک تاریک تاریک، بەرز بەرز، چەند هەنگاوێک لەخوارەوەی ماڵی خودا نەرم نەرم دادەگیرسێت.. ئەوە منم !

ئەگەرچی هیچمان وەکو سەردەمی منداڵی چاوەکانمان نادرەوشێنەوە، ئەگەرچی هیچ کامێکمان نەمانتوانی تروسکاییەکانی منداڵی لەسەر پەنجەرەکانمان بهێڵینەوە، بەڵام ئەگەر هاتی دەمناسیتەوە، چونکە من ئێستاش سپێتی ئەو رۆحە وێرانەی خۆمم پێنەشاردراوەتەوەو بەردەوام وەکو چرا بەدوامەوەیە، بۆیە دڵنیام دەمدۆزیتەوە.

ئەی هاوڕێی ئێوارانی باران، دەبێ غەریبی جگە لەمن و تۆ چی بێ!؟تەنیایی، تۆ بڵێی ئەگەر لەماڵی من و تۆوە سەری هەڵگرت لەکویَ ئۆقرە بگریَ؟! من ئەی هاوڕێی گێڕانەوەی سوحبەتەکانی منداڵیم، ئێستا ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ترسەکانم گەورەتر دەبن، ترسی ئەوەی ئێوارەیەك بەدواتاندا بگەڕێم و کەس نەدۆزمەوە لێی بپرسم ئێستا ساڵی چەندەمی هیجرانی بارانە.. کەسێك نەدۆزمەوە هەگبەی فرمێسکەکانم لەگەڵ بەشکا.. من زەندەقم لەوەچووە.."ئاگام لێنەبێ بمرم و کەسیش نەبێ پێم بڵێ ئەمڕۆ چەندی مانگەو سەعات چەندە."

ئیدی ئەی هاوڕێی گریانەکانی منداڵیم من توانای ئەو پەیڤە بێئومێدو ساردو سڕانەم نەماوە، ئیدی من لەو پەیمانانەی ئینسان بێزارم، من لە زمان تووڕەم، ئەوەتا تەسلیم بە باخەکانی لیمۆو زەیتون دەبمەوەو لەویَ نامەکانی ئێوە دەکەم بەدیوان و بەر لەوەی زاکیرەم پیربێ هێدی هێدی گویَ لە مۆسیقا دەگرم. گەر گویَ لەمۆسیقا نەگرین هیلاکی جەستەمان دەخواو بەلێزمە ماندوو بوون لەسیماو دڵ و دەرونمان دەباریَ. ئەوکات لەهیچ شوێنێك ئۆقرە ناگرین، هەموو شوێنێك دەبێتە شوێنی کوشتنی حەزەکانی ئێمەو ماڵەکانمان دەبنە مەنفا. بەبێ مۆسیقا پڕاوپڕ دەبین لەتاوان و مێژوومان دەبێتە کتێبی کارەساتەکان، ئەوەتا"پیاوێك کە هەمیشە لەتووڕە بووندا جوانە دەنوسێت:" گەر سەرکردەکان گوێیان لەمۆسیقا بگرتایە، هەرگیز شەڕی ناوخۆیان نەدەکرد."*

ئەی هاوڕێی غەرق بووی نێو کتێبەکانی فەلسەفە، من لەسەر زوبانی نیچەوە پێت دەڵێم"ژیان بەبێ مۆسیقا زۆر بەئاسانی هەڵەیە، ماندوو بوونە ، مەنفایە"(سمیر الحاج شاهین، روح الموسیقی، 1980، لا 42)، من لەوێوە پێت دەڵێم: ئاسەرابی مەنفاکان ڕۆحی ووشك نەکردووین دەبێ بیر لەژیانێکی دی بکەینەوە، تۆش گەر دەتەویَ بەتەنیایی بە نێو ئەم تاریکستانە گوزەر نەکەیت، گەر دەتەویَ دڵەراوکێ نەتکوژیَ، وەرە با لەگەڵ زاکیرەی سنەوبەرێك تەعاروف کەین و گویَ لەمۆسیقا بگرین..

شایەت من پیاوێکی کەئیب بم ، دوورنییە تۆش کەسێکی لەخۆم وێرانتر بیت، وەلیّ هاوڕێم مۆسیقا نورمان پێدەبەخشێ و تاریکاییەکانی ناوەوەمان ڕووناك دەکاتەوە. ئەوەتا

هێرمان هیسە باسی ئەو ڕووناکییەی نەغمە دەکاو دەڵێت:" ئەو شاعیرەی لەریتمی شیعرەکانی ستایشی جوانیەکانی ژیان دەکاتو، ئەو مۆسیقا ژەنەی دێتو ئەو شیعرانە وەکو ئێستایەکی پاراو دەلەرێنێتەوە، ئەوانە مرۆڤێکن ڕووناکی لەگەڵ خۆیان دەهێننو خۆشیو سەفا لەسەر ڕووی زەوی زیاد دەکەن، ئەگەرچی لەسەرەتا ڕەنگە بەناو فرمێسکو دڵەراوکێی پڕئازار دەستمان بگرن، ڕەنگە ئەو شاعیرەی بەشیعرەکانی سیحرمان لێدەکات پیاوێکی تەنیاو غەمناك بێت، ڕەنگە ئەو مۆسیقا ژەنەش خەون بینێکی کەنیب بێت، بەڵام سەرەڕای ئەوەش ئیشەکانیان بەشێکە لەسەفاوشادی خواوەندو ئەستێرەکان..(هیرمان هیسە ، لعبە الكريات الزجاجيە، و: مستەفا ماهر، دار المدی، 1998).

هاوڕێم : ئیرۆدا دەڵێت:" لەدونیادا چی لەدیمەنی شەمەندەفەرێك خەمناکترە کەلەبەر باران ودستابێت؟". ئەی هاوڕێی یاخیبوونەکانی هەرزەکاریم من ئێستا وەکو ئەو شەمەندەفەرە خەمناکەم، ودك ئەو شەمەندەفەرە هەموو فارگۆنەکان نامۆ دەبینمو جورئەت ناکەم سەربکەم بەماڵی هیچ وێستگەیەك ،ئیدی دەبێ تەوبە بکەم، دەبێ گوێ لەمۆسیقا بگرم..دەبێ گوێ لەمۆسیقا بگرین، چونکە هەر بەتەنها ئەو دەتوانێ لەناو ئەو هەموو گوناهە دەرمانبێنێ وبێنێتەوەی شەرمێ بکەین وەکو منداڵی، وەکو قیامەت، ڕووت ڕووتمان دەکاتەوەو دەمانکات بەسێبەری فریشتەکان.

ئەی وەکو خۆم گومڕا، دەبێ تەوبە بکەین..!

کەپاییز لەدڵماندا شین دەبێ و ئەو هەموو زێڕەمان پێدەبەخشێ کەچی سوپاسی ناگەین، گوناهبارین.کە کوندە پەپووی لەهەموومان تەنیاتر ئاوا بەقوڵی سەیرمان دەکاو لێی ناپرسین بیر لەچی دەکەیتەوە، گوناهبارین.. کە نازانین یاقووت جوانترە یان هەنار کوفر دەکەین، کە جورئەت ناکەین لەداری سنەوبەرێك بپرسین نهێنی ئەو لەگەڵ سەوزاییدا چییە تاوانبارین بۆیە ئەی هاوڕێی غەریبیم دەبێ تەوبە بکەین، دەبێ بگەڕێینەوە بۆ مەزهەبێ تیایدا بەچەمانەوە بۆ نەغمەیەکی شۆخ یان هەڵسان لەحزور ئاوازێکی بەهەیبەت دەروونی پڕ لە گوناهمان جوان جوان بشۆینو خۆمان بە جوانیەکان بسپێرین.

-2-

یەکێك لەکەموکوڕی وناتەواویەکانی بواری بیرکردنەوەو نووسینی هونەری کوردی نەبوون یان لاوازی هوشیاری هونەرییە بەگشتی و سستی لایەنێکی یەکجار گرنگە کە پێی دەڵێن مۆسیقای کلاسیك. ئەم سستیەش لەدوو رووەوە سەرچاوە دەگرێ، روێکیان لایەنی تیۆری و نووسینی مۆسیقایی و مێژووی مۆسیقایە، رووەکەی تریشیان لایەنە پراکتیکیەکانی ئەداکردن و گوێگرتن و دواجار تێگەیشتنە لەمۆسیقای کلاسیك.

من لێرەدا ناچمە سەر هۆکارەکانی ئەم لاوازی و کەم و کورییانەو ئاشکرایە کە هەر یەك لەلایەنە تیۆری وکرداریەکان کۆمەڵێك هۆکار بەدوای لاوازیانەوەیە، بەلأم ئەوەی لێرە بەگرنگی دەزانم بیڵێم ئەوەیە کە بواری مۆسیقای کلاسیك بوارێکی یەکجار گرنگی هونەرە بەگشتی و مۆسیقاش بەتایبەت و راستیەکی بەڵگەنەویستە کە تائێستاش کلاسیزم چ وەك ئەدا چ وەك تیۆریش گەورەترین سارچاوەیە بۆ داهێنان و لێکۆڵینەوەی مۆسیقایی.

هێرمان هیسە دەڵێت: "مۆسیقای کلاسیك جەوهەری رۆشنبیری رۆژئاوایە "(روح الموسیقی، لا 9)،ئەگەر مۆسیقای کلاسیك بەشێکی دانەبڕاوو هەمیشە ئامادەی ژیارو شارستانیەتی رۆژئاوا بێ و پانتاییەکی فراوانی ئەو رۆشنبیریانەی پێك هێنابێ،ئەوا بۆ ئێمەی کورد کە زۆرجار دەگەڕێینەوە بۆ سەرچاوەو بەرهەمەکانی رۆشنبیری و بیرکردنەوەی رۆژئاوا، مۆسیقای کلاسیك و مێژووی ئەو بوارە دەبێتە گرنگیەکی بەرچاو کەناکرێ تیایدا کەم تەرخەم بین، لەلایەکی دیکەشەوە وەکو مرۆڤ تێگەیشتن لە مۆسیقای کلاسیك و گوێگرتن لێی چێژێکی ئێستاتیکی تایبەتمان پێدەبەخشێ، کە ئاسایی نییە ئاوەها بەسوك و سادەیی دەست بەرداری بین.

تا ئێستا زۆر بەکەمی و پچڕپچڕی لەم لاو لەولا نوسینێك یان وەرگێڕانێك یان نەقڵ کردنێکی سادەی مێژووی ژیانی یەکێك لەهونەرمەندانی کلاسیك لە بڵاوکراوە کوردییەکان بەرچاو دەکەوێت، بەلأم لەزۆربەی حاڵەتەکاندا ئەو نوسینانە خۆماندووکردن و

بیرکردنەوەی زانستیو ئیستاتیکیان تێدا یەکجار لاوازەو ناگەنە ئەو ئاستەی پێیان بگوترێ نووسینی جیددی.

لەرووی پراکتیکیشەوە، ئەوا تیپە مۆسیقاییەکان لەم بوارەی مۆسیقاوە زۆر کەم تەرخەمنو ئەتوانم بڵێم تا ئێستا مۆسیقای کلاسیك نەبووە بە هەممێکی هونەریی یان پرۆژەیەکی جیددی.

وەك گوتم هەریەك لەم کەمو کوڕیانە دونیایەك هۆکارو مەسەلە لەپشتیانەوە وەستاوەو لێرە بواری ئەوەم نابێت بەدرێژیی باسیان بکەم. من لەم نوسینەم هەوڵ ئەدەم خوێندنەوەیەکی ئێستاتیکیانە بۆ یەکێك لە شاکارە جیهانییەکانی مۆسیقای کلاسیك بکەم کە سێمفۆنیای نۆیەمی (بیتهۆڤن)ە.دیارە ئەم جۆرە خوێندنەوانەش بەهەوڵی زۆر پێویست دەزانم بۆ ئاکتیڤکردنو پەرپێدانی لایەنی چێژوەرگرتن لە مۆسیقای کلاسیكو فراوانکردنی دونیابینیی ئێستاتیکیو بواری تێگەیشتن لەشاکارە جیهانییەکانی مۆسیقا.

لەسەدەی بیستەمدا شێوازێکی زۆر گرنگو سەرکەوتوو بۆ فراوانکردنی دونیای چێژو تێگەیشتن لە مۆسیقای کلاسیك سەری هەڵدا، ئەویش ئەوەبو لەشارە گەورەکانی ئەمریکاو ئەوروپا یەکێك لە مۆسیقازان و شارەزایانی بواری شیکردنەوەی مۆسیقا بۆ ماوەیەکی دیاریکراو لەرادیۆ یان تەلەفزیۆن یانیش لەهۆڵی نمایشە مۆسیقاییەکان قسەی لەسەر ئەو شاکارە مۆسیقاییە جیهانیانە دەکرد کە دواتر نمایشدەکران. نموونەی ئەم کەسایەتیانەش (دیمیتری کابالیڤسکی)بوو، کە بۆماوەیەکی زۆر لەمۆسکۆ لم جۆرە کۆڕانەی سازدەکرد. بەزۆری ئەم جۆرە کۆڕو راڤەکردنانە نیو سەعاتێك یان سەعاتێك پێش نمایشکردنی شاکارێکی جیهانیسازدەکرانو زۆربەی جارەکان مایسترۆی هەمان ئەو تیپەی کە شاکارەکەی نمایشدەکرد بەو کارە هەڵدەستاو، لەمیانەی شرحکردنەکەیدا باسی لە مێژووی نووسین ونمایشکردنی یەکەم و کاریگەرییەکانی ئەو بەرهەمە مۆسیقاییەی دەکردو، باسی مۆتێڤو رستە سەرەکیەکانی ئەو بەرهەمەی ئەکردو رەگەزو بنەماو ریتمو ئاوازەکانی شیدەکردنەوە. زۆرجاریش لەسەر ئامێری پیانۆ هەندێ زانیاری شەرحدەکرد، بەمەش جەماوەرو گوێگران زانیارییەکی باشیان لەسەر ئەم کارە مۆسیقاییە ئەبوو کە رێگەی خۆش

دەکرد بۆ زیاتر و باشتر تێگەیشتنی ئەو شاکارە جیهانییە.(التحلیل الموسیقی، تالیف: سیدریك تورپ دیفی، ترجمە وتعقیب: د. سمحە الخولی، 2000 ، لا 213).

هەندێ جاریش ئەو شیکردنەوەو راڤەکردنانە لەشێوەی چەند نوسینێك بڵاودەکرانەوەو لەچوارچێوەی کتێبێك یان چەند کتێبێکدا چاپدەکران و دەکەوتنە بەر دەستی هونەر دۆستان. نموونەی ئەم جۆرە کتێبانەش چەند نوسینێکی(سێر دۆناڵد فرەنسیس تۆفی)یە، کە مۆسیقازەن و مایسترۆو مۆسیقا شیکارێکی سکۆتلەندیبوو، ئەم نووسینانە لەژێر ناونیشانی "چەند وتایك دەربارەی شیکردنەوەی مۆسیقایی"بوون، کە لەحەوت بەرگدا بەچاپ گەیەنران و تیایاندا تۆفی شەرحی کۆمەڵێك سیمفۆنیا و شاکاری جیهانی دەکات کە لەچەند ئاهەنگێکی مۆسیقاییدا نمایشکراون.(هـ.س.پ، لا 213و214).

لەفەرهەنگی ئێمەدا ئەم جۆرە هەوڵانە یەکجار کەمن و پێویستیمان بە خۆماندووکردنێکی زۆر هەیە بۆ ئەوەی بتوانین لەم بەشەی هونەر دوانەکەوین و بیناگانەبین، دەکرێ ئەو نووسینە یەکێك بێت لەهەوڵە سادەو سەرەتاییەکان بۆ فراوانترکردنی بواری گوێگرتن لە مۆسیقای کلاسیك و ئاسانترکردنی تێگەیشتن و چێژ وەرگرتن لەشاکارە مۆسیقاییە جیهانییەکان.

-3-

## سیمفۆنیای نۆیەمی بیتهۆڤن

## "سرودی شادی" یان" بانگەشەیەك بۆ شادیی مرۆڤ".

زۆربەمان لەسەر ئەوە کۆکین کە مۆسیقا هونەرێکە تیایدا دەکرێ مانا بدرێتە هەست و هەڵچوونەکان و، دەتوانرێ گوزارشت لەو هەستە یەکجار ئاڵۆزانە بکرێت کە ئاسان نییە بەهۆی بوارێکی دیکەی دەربڕینەوە گوزارشتیان لێوەبکرێت.

ئیچە دەپرسێ: ئەغمەکەی دەبێ بە مۆسیقا؟ هەر خۆیشی لەوەڵامدا دەڵێ: لەپێش هەموو شتێکدا لەوپەڕی حاڵەتی شادی، یان خەمناکی ئێرادەدا، لەئاناگایی هەڵچوندا، لەناو هاواردا. هەر ئەم پەیوەندییە قوڵەی نێوان مۆسیقاو هەستیشە وادەکات لەسەر

زووبانی(دیبۆسێ)ەوە بلێین: نەغمە گوزارشت کردن نییە لەهەست، بەڵکو بۆخۆی بریتییە لەهەست. مۆسیقای کلاسیك و سەمفۆنیا بەتایبەت زۆر بەجوانی و تێروتەسەل توانیویانە بەرگری لەم پێناسەیە بکەن و وەختەبلێین سیمفۆنیا لەسەدەکانی رابردوودا لەرۆژئاوا، لەزۆربەی حاڵەتەکاندا باشترین و بەرزترین شێواز بووە بۆ گوزارشتکردن لە حاڵەتە ئینسانییەکان و، وێناکردن و بەرجەستەکردنی سیماو کارەکتەرو دیمەنە جۆراوجۆرەکانی ژیانی پڕ لە ئاڵۆزی ئەوسات. هەر بۆیەش بووە بە بەشێکی گرنگ و دانەبڕاو لە ژیارو رۆشنبیریی رۆژئاوا، بەشێك لەشارستانیەتەکان کە بەردەوام جێگەی باسکردن و شانازی کردن بووەو تائێستاش وەکو بەشێکی رووناك لەیادەوەری و مێژووی رۆژئاوا ماوەتەوەو هەمیشە ژ ودك سەرچاوە، چ وەك قوتابخانەیەکی گەورەی چێژو ئیلهام ئامادەگی هەیە.

کاتێك باس لەمۆسیقای کلاسیك و کاری سیمفۆنیی دەکرێت ئەوا کۆمەڵێك ناو لەیادەوەری مێژووی مۆسیقادا دێنە پێش و کارو بەرهەمەکانیان سەرسامان دەکەن، یەکێکیش لەو ناوانە کە حزورێکی بەردەوامی هەیەو دەتوانین بلێین مۆسیقا ژەنی هەموو سەردەمەکانە (لۆدڤیگ ڤان بیتهۆڤن)ە.

بیتهۆڤن ئەگەرچی بەدرێژایی تەمەنی لەرووی ئیشی سیمفۆنییەوە تەنها(9) سیمفۆنیای داناوە، بەڵام هەر یەکێك لەو سیمفۆنیایانە بووە بە سەرچاوەیەکی گرنگی مۆسیقای کلاسیك و شاکارێکی ئەمری پڕ لە جوانی. لەمۆسیقای بیتهۆڤندا نهێنییەك هەیە ، جوانیەك هەیە، هێزێکی کێشکردن و کاریگەری هەیە کەوایکردووە بەردەوام ئەو مۆسیقاوشاکارانە بۆ مۆسیقا ژەن و لێکۆڵەرەوەکانی سەردەمی خۆی و دوای خۆیشی ببێت بەسەرچاوەو نموونەی بەرزی داهێنان.

گرنگی مۆسیقای بتهۆڤن لەدوو سۆنگەوە سەرچاوە دەگرێ، یەکێکیان لایەنە رۆحی و دەروونییە بەهێزەکانی ئەو شاکارانەیە کە پیوەندییەکی قوڵ و پتەو لەگەڵ گوێگرو مۆسیقاژەندا دروستدەکات و وادەکات ئەو بەرهەمە مۆسیقاییانەو نوتەکانی بەردەوام بەزیندوویی لەیادەوەریدا بمێننەوە.

دووەم لایەنی بەهێزی ئیشەکانی بتهۆڤن تەکنیکە، لەرووی تەکنیك و ناوەرۆکی مۆسیقاییەوە بتهۆڤن چەند گۆڕانێکی بەسەر سیمفۆنیادا هێناو بەتایبەت لەجوڵەی چوارەمداو توانی شێوازێك دابهێنێت کەلە دوای خۆیدا بیێت بە ڕێچکەو پەیڕەو بکرێ.

دیبۆسێ دەڵێت:" لەبیتهۆڤنەوە سەلمێنرا کە ئیدی سیمفۆنیا بێهودەییە..(روح الموسیقی، لا341 ) لەلایەکی دیکەشدا ڤاگنەر دەنووسێت: ( لەگەڵ دوایین سیمفۆنیای بتهۆڤندا ، مۆسیقا چوونە نێو هونەری جیهانیی بەجێگەیاند، مۆسیقای بتهۆڤن ئینجیلێکی بەشەرییە بۆ هونەری ئاییندە، دوای ئەو هیچ پێشکەوتنێك لەتوانادانییە).(هـ.س.پ، لا 341و342).

تا لەم هەڵسەنگاندنەی مۆسیقازانە ناودارەکانی دونیاو لە تێرو تەسەلی و سیحریەتی ئاوازدانان و مانا گەیاندنی سیمفۆنیاکانی بتهۆڤنەوە گرنگی و زەروورەتی گوێگرتن و تێگەیشتن لەسیمفۆنیاو شاکارە مۆسیقاییەکانی دیکەی بتهۆڤن دێتە پێشەوە.

سیمفۆنیای نۆیەمی بتهۆڤن لەکاتێکدا نوسراوە کە ململانێ و بەربەرەکانێیەکی یەکجار توند ئەورووپایی گرتبووەوە، ئەمەش لەنێوان چینی زەحمەتکێش و ماندوونەناس و چینی دەسەڵاتدارو ستەمکار. ئەو ململانێیە بووە هۆی ئەوەی زۆربەی شاعیرو نووسەرو ئەدیبان بەشێك لەنووسین و بەرهەمەکانیان بخەنە خزمەت ئەو پرەنسیپ و ئایدیاو بەرنامانەی کە هەڵگری بوون و لەپێناویدا خەباتیان دەکرد.

شاعیری ئەڵمانی (فرێدریك چیلەر)کە هەمیشە دژی ئەو گەندەڵی و ناڵەبارییە بوو کە لەسەدەی نۆزدەهەمدا ئەورووپای گرتبووەوە، زۆریش لەژێرکاریگەری شۆڕشی فەرەنسادابوو، لەساڵی 1785دا قەسیدەیەکی لەژێر ناونیشانی( بۆ ئازادی) نوسیبوو، بەڵام بارودۆخی ئەوسای وڵات و زوڵم و ستەم و توندڕەوی دەسەڵاتەکان بە هیچ شێوەیەك هاندەر نەبوون بۆ ئەوەی چیلەر قەسیدەکەی لەژێر ئەم ناونیشانە بڵاوبکاتەوە، هەربۆیە ناونیشانی قەیسدەکەی گۆڕی و کردی بە " بانگەشەیەك بۆ شادی".

بتهۆڤن لەساڵی 1823 ئاوازی قوداسێکی بەناوی میساسۆلینیس missa solennis لەشاری (بادن) تەواو کردبوو، بۆیە هێشتا لەژێر کاریگەری تقوس و نەغمەکانی ئەو

قوداسەو كارە مۆسيقاييە ئايينيەكاندا بوو، كە تيايدا وشەو دەنگى مرۆيى رۆڵێكى گرنگو بەرچاو دەگێڕن. ئيدى هەر لەژێر ئەو كاريگەريەشدا بيرۆكەى گۆڕين و گەشەپێدانى سيمفۆنياى بەخاياڵدا هات، ئەويش بەزيادكردنى دەنگە مرۆييە كۆراڵيەكان بۆ سيمفۆنياكەو لەوێوە بيرۆكەى نووسينى سيمفۆنياى نۆيەم سەرى هەڵدا.

بيتهۆڤن لەهاوينى 1823 لەدانانى سيمفۆنياى (9) بووەوەو دواى تەواوكردنى ئەو كارە مەزنەى، نۆتەى سيمفۆنياكەى بەسەر تيپى ئۆركێسترا دابەشكردو بڕياريدا لەرۆژى (7)ى مايسى 1824 لەسەر شانۆى (كارەنتين) لە ڤيەننا نمايش بكاتو هەرخۆشى رابەرێتى تيپى ئۆركێسترا بكات.(غانم الدباغ، نزعات انسانيه في موسيقى بتهوفن، 1979، لا 44و 45).

سيمفۆنياى نۆێ بتهۆڤن لەسەر پەيژەى بچووكى دۆ واتە (D MINOR)و، لەچوار جوڵەپێك دێت،جولەى چوارەم بەشى زۆرى بريتيە لەقەسيدەكەى شيلەر كەلەلايەن كۆراڵەوە ئەدا دەكرێت. سيمفۆنياى نۆيەمى بتهۆڤن گوزارشت لەهەستى شادى و مەيلى ئازاديخوازىو خۆشگوزەرانى دەكات لەلاى مرۆڤو، تيايدا بتهۆڤن لەو كۆتو زنجيرە كلاسيكيانە چۆتە دەرەوە كە ببون بە پرانسيپ و تێكست بۆ مۆسيقارانەكانى سەردەمى خۆىو ئەو توانى شۆڕشێك لەناو سيمفۆنيادا بەرپا بكات. لەسيمفۆنياى (9)دا، ئاوازەكان، هاوشێوەى هەستو هەڵچونو حەزو ويستەكانى بتهۆڤنو سەرجەم مرۆڤە ويژدان زيندوو ئازاديخوازەكان ئۆقرە ناگرنو رووەو تەقينەوەو دروستكردنى رێرەوێك دەچن بۆ دەرچوون.

-4-

## جوڵەى يەكەم:- لخێرا

ALLEGRO MA NON TROPPO UN COPO MAESTOSO

بەشێوەيەكى گشتى ئەم جوڵەيە گوزارشت لەو ململانێيە دەكات كە مرۆڤو دونياى ناوەوەى مرۆڤ تيايدا دەژى لەپێناو گەيشتن بەشادى، ئەم ململانێيەش هەندێ جار ئەوەندە تاقەت پڕوكێن و درێژخايەنە وادەكات بێومێدبينو بگەينە ئەو رايەى كە ئيدى ناستەمە بگەين بەو شاديەى ئێمە دەمانەوێ.

ئاوازێك دێ و لەگەڵ خۆیدا تاریکی دێنێ، دواتر چەند بروسکەیەك لەناو هەورە تاریك و تەنیاکاندا دەتەقێتەوەو پارچەیەك لەرەشبینی دەبارێنن، لەم نێوەدا ئاوازەکان دەیانەوێ بێرەحمی قەدەرمان بۆ باس بکەن کە چۆن وەك میرێکی بڕیار بەدەست دەبێت بەسوڵتان بەسەرمانەوەو چۆن حەز بکات ئاوا بەرەو کەنارەکانی راپێچمان دەکات. ئەم ئاوازانە بەهۆی چەند لێدانێکی تووندو چاوەڕوان نەکراوی ئامێری کۆنترباس دێنە بەرگوێ.

لەم پارچەیەدا هەست دەکەیت بتهۆڤن دەیەوێت گەل و مرۆڤایەتی لەو خەوە قوڵە بەخەبەر بێنێ کە لەژێر باری قورسی قەدەردا تێی کەوتووەو وایکردووە چینێك لەزەحمەتکیش و بێ دەسەڵاتەکان بەردەوام بەدەست گروپێکی زۆردارو دەسەڵاتدار بتلێتەوە، ئاوازەکان مرۆڤ هاندەدەن بۆ ئەوەی بەدوای ئازادیەکاندا بگەڕێن و سووری دەکەن لەسەر ئەوەی کەبە هیچ شێوەیەك دەستبەرداری ئەو مافە نەبن کە مافی هەموو ئینسانێکە ئەویش مافی سەربەخۆ ژیان و شادی و کەیف کردنە، بەم جۆرە لەجوڵەی یەکەمدا ئاوازێکی بنچینەیی دروست دەبێت، کە ئاوازی وەخەبەر هێنانی ئینسانە.

ئەو ئاوازە دێ و مژدەی خۆشبەختی پێیەو داوامان لێدەکات شوێن پێی کەوین،ئێمەش دەکەوینە دوای و وەکو منداڵ خەون دەبینین و لەخەونماندا لەسەر لوتکەیەکی بەرزەوە دووباڵمان بۆ رووەوە رووەو ئاسۆکان لەشەقەی باڵ دەدەین. زۆر نابات لێدانەکانی قەدەر بە ئاگامان دێنن و پێمان دەڵێن :" شادی تۆ پابەندە بەحوزنی پەپولەیەك کە لەیەکێك لەئێوارەکانی پاییزدا باڵەکانی دۆراندو بەدوو دارشەقی شەلەوە گەڕایەوە" و دەبێ ئێوە لەناو حوزندا بمرن.

ئینجا مۆسیقا سەدای کەوتنی کەسێکمان دەدات بەگوێدا کە قەدەر زۆری بۆ هێناو خستی. بەڵام مرۆڤ مایل بە ویستی غەریزەکانیەتی، غەریزەکانیشمان مایل بەشادین، ئیدی هەوڵەکانمان بۆ گەیشتن بەو شادییە بەردەوام دەبن، هەربۆیەش ئەو مرۆڤە کەوتووە جارێکی دی هەڵدەستێتەوەو درێژە بەرێگای خۆی دەدات و بەدەوام دەبێت لە رۆیشتن و ماندوو چەشتندا لەپێناو گەیشتن بەئاواتەکانی، لەپێناو زاڵبوون بەسەر ئازارو خەفەت.

بەڵام ئەفسوس ، ئەغمەیەکی دی دێت و هەواڵی دۆڕانی ئەو مرۆڤەی پێیە، ئیدی فرمێسك چاوەکانمان پڕ ئەکەن و جەستەمان پڕ ئەبێ لەرەشبینی. بووقێك هەواڵی ئەو ئازارەمان پێدەسپێری و زۆر بەخەمناکی لەناو گۆڕانی ململانێدا خۆی ئەژمێنێ. لێرەدا وێنەی مرۆڤێکی بێئومێد بەرجەستە ئەبێت کەسەری خۆی داگرتووەو لەگەڵ ئاوازێکی تازیە باردا لەپێشەوەی تەرمی حەزو هیواکانی هێدی هێدی ئەڕواو، ئاوڕ لەکەس ناداتەوە.(روح الموسیقی، لا348).

لەنیچەوە فێربووین کە مرۆڤ کائینێکی خاوەن ئیرادەیەو ئەو شتەی نامانکوژێ بەهێزمان ئەکات، بۆیە ئەو مرۆڤەی پێش چەند ساتێك نائومێدی لێدەباری ، ئێستا جارێکی دی بە ئومێدەوەو هەڵدەسێتەوەو دەکەوێتە ڕێ، ڕێگاکان ئەبڕێ، ڕووبارەکان شەق ئەکات درز ئەخاتە چاوی تاریکیەوە، ئەگەرچی ماندووبوون هەموو گیانی تەنیوە، بەڵام ئەو کۆڵ نادات، ئەست بۆ هەموو شتێك ئەبات بۆئەوەی بستێك بەرزتریکاتەوە، چڵی داری، بنکە گیایی، هەموو ڕێگاکان تاقیدەکاتەوە، لەبەرزاییەکان سەردەکەوێ، گوێ ناداتە بەردو، تەپۆلکەو، دڕك ودالْ و ئەریا، ئاوڕ لەتووڕەبوونەکانی شاخ و یاخی بوونی زەریا ناداتەوە.

ئەو بەرێوەیەو ئومێد نادۆڕێنێ، ئەو بەدوای رووناکیدا وێڵە، رووناکیەك رزگاریکات لەتاریکی ئەو شەوە دوورو درێژو بێرەحمانە، زۆرنابات ئاوازێك ئەبیستێ کە مژدە بەخشەو لەدوورەوە ئەناسرێتەوە. ئەوە (بووقی) رزگار بوونە، ئەوە ئاژێری بەدیارکەوتنی ئاسۆیەکی رووناکە لەناو تاریکی شەوێکی ئەنگوستەچاودا.

بەڵام.. خۆشیەکان هیچ کاتێك تاسەر نین، بۆیە جارێکی دی تروسکاییەکان بەرەو کپی ئەڕۆن، چرایەکان ناتوانن بەرگەی ئەو هەموو تاریکیە بگرن، ئیدی تەسلیم ئەبن و لەگەڵ خۆیان ئەو مرۆڤە بەدبەختەمان بۆ وێنا دەکەن کە خەریکە لەخەفەتان ئەبێت بەیەك پارچە گریان، ئەو بەدووچاوی ئەبڵەق و بەدەنێکی شڕو ماندوو، وەك مەلێکی لەناودا نقوم بوو سەرتاپای جەستەی بەسەر^یکدا شۆڕبۆتەوەو لەقوڵی ئەروونیدا ئەنگێکی نووساو پێمان ئەڵێ بەرگری کردن بێهودەیە. بەم شێوەیە ئاوازەکان لەرێگەی ئامێرەکانی ئەفخەوە بەرەو

کپی دەڕۆن و لە کۆتایی ئەم جوڵەیەدا دوا وشە دەبێتە وشەی بێنۆمێدیو هەوڵەکانی مرۆڤ بۆ بەدیهێنانی خۆشیەکی سەرتاسەری هەرەس دەێنن.

## جوڵەی دووەم "زۆر خێرا"
**MOLTO VIVACE**

ئەوبێنۆمێدیەی لەجوڵەی یەکەمدا گوێ بیستی بووین، لەجوڵەی دووەمدا دوبارە دەبێتەوە بۆ ئەوەی فێرمان بکات کە لەناو جەرگەی تاریکیدا پێویستی بۆ رووناکی زیاتر دەبێت. بتهوڤن هەمان بیرۆکەی جوڵەی یەکەم لەجوڵەی دووەمدا دووبارە دەکاتەوەو دێت بەهۆی ئاوازەکان جارێکی دی خەباتی مرۆڤ لەپێناوی شادیو ئازادی وێنا دەکات ، دێتو ململانێی نەپساوەی مرۆڤ لەگەڵ چارەنووسدا بەرجەستە دەکات.

هەر لەم جوڵەیەدا، بەشێکی یەکجار بەچێژو جوان دەبیستین ئەویش (سکێرزۆ)یە.(SCHERZO)**. لەم بەشەدا ، وێنەی چەند کەسێکمان دێتە پێش چاو کە بێنۆمێدی تواناى لێبڕیونو بڕیاریان داوە بۆ چەند ساتێك خۆیان بیربچێتەوە، ئیدی دەست دەکەنە سەماکردن.

سەماش جۆرە زمانێکە، زۆر جار بەهۆیەوە ناوەوەمان کەشف دەکەینو هەستو ئاسۆریە پەنگ خواردووەکانی دونیای ناوەوەمان دەتەقێنینەوە. لەرێگەی سەماوە ئەو مرۆڤە ماندوو و بێنۆمێدانە دێنو خۆیان بەتاڵ دەکەنەوە، ئێمەش لەگەڵ خۆیاندا بۆ گەشتێك دەبەن کە تیایدا کەمێك لەکابوسی نەهامەتیەکانی قەدەر رزگارمان دەبێ و ئۆخژنێك بەدەروونمان دادێ دوای ئەمە ئاوازێکی هێمنو لەسەرخۆ یادەوەریمان دەباتەوە بۆ سروشت، بۆ هەواری یەکەمی یارانو عەشقی دێرینی شوانێك بۆ شمشاڵ و بێری، بۆ خەڵوەتی شاعیرێك، بۆ نهێنیەکانی دەریا و مەلو مانگەشەو، لێرەدا دەگەڕێینەوە بۆ سروشت، کە تیایدا پڕاوپڕین لە مناڵی، پڕاوپڕین لە بۆنی مێخەکو رەیحان، پڕاوپڕ لەسکون. لێرەدا دەستمان دەخەینە نێو دەستی شادیو دوور دوور دەڕۆین، خۆمان لەبیر دەکەین، چ دەبێ گەر گەڕانەوەمان بیربچێ؟

چ دەبێ گەر باوەشی شەپۆلێك هەڵمانگرێو بمانبات بۆ ئەوێ، ئەوێی باریینی رەنگەكان، ئەوێی لێواو لێو لەجوانی ، ئەوێی دووره دەستی قەدەر. لەوێ كەس ناپرسێ چ بكەین، هەموو گوڵ دەچینین. بەلأم بێهودەیەو" هەرگیز لەگەڵ موعجیزەكاندا یەكناگرینەوە"***.

زۆرنابا و سەماكار ترسی كۆتایی هاتنی سەما و شەراب و رووناكی یەخەی دەگرێ، زۆرنابات چراكان كزدادێن، شادی هەناسەی سوار دەبێ، جارێكی دی خەم دەبارێ بەسەرماندا، جارێكیدی حوزن پەنجەرەكان دەگرێو نوقمی بێئومێدیو تاریكی و غوربەت دەبینەوە.

## جولەی سێیەم (لەسەرخۆ)

ADAGIO MOLTO ECACANTABILE

لەم جوڵەیە ئاوازەكان زۆر بەخەمباری دێنە بەرگوێ، لێرە وێنەی مرۆڤێك دەبینین كە جگە لەیادەكان شتێكی دیكەی بۆنەماوەتەوە، ئەو مرۆڤە یادەوەری دەیباتەو بۆرابردوو، هەر بەتەنها رابردووی ماوە تیایدا دڵشاد بێت، ئەو ئاوڕ لەرابردوو دەداتەوە بۆ ئەوەی سێبەری خۆشەویستەكەی ببینێت كە لەژوانێكی چۆڵدا بەجێماوە. ئۆركێسترا زۆر بەهێمنی و لەسەر خۆیی ئەو هەستە كەئێبانە وێنا دەكات و زۆر بەجوانی ناخی كەسێكی بێئومێدمان بۆ دەخوێنێتەوە. ئاوازەكان لەقوڵایی دڵێكی بریندارەوە دێن، دڵێك كە خاوەنەكەی دەڵێت: دەزانم تازە هیچم بۆناكرێ ، دەزانم ئێستام لێواولێوە لەبرین وەهەر بەتەنها رابردووم ماوە، بۆی بگەرێمەوە. ئەگەرچی هەوار چۆڵەو یار نایە، بەلأم دڵی نایە ئەوێ بەجێبهێڵێ و بڕیاری یەكجارەكی دابڕان بدات.

ئەو دەڵێت: تەمەن بەسەرچوو ئیدی دەبێ لەگەڵ یادگارییەكانمدا بژیم ، تازە دەبێ ئەلبومی وێنەو دیوانی نامەی یار و خۆشەویستان بێنمەوە گۆڕێ و تێر تێر بۆیان بگریم، تازە من بەتەنها پاڵەوانی ناو ئەو ئەلبومانەم و هیچیتر ، تازە من ڕێبوارێكم ئایندەو ئێستام بریتیە لە تورەگەی كۆڵم و ، وام لەوێدا، لەوێی رۆژانی سەفاو كۆڕو مەجلیسی یاران ، لەوێی سەماو گۆرانی ، لەوێی باوەشی گەرم و ژوانی بەرمانگە شەو، لەوێی خەونی دەم

کەنارو خەیاڵاتی هەمیشە سەوز، من وام لەوێدا بەڵام پاش چی ، تازە پیربووم و هەر بەتەنها نەبەردی نێو ئەلبوم و نامەکانم.

لەدوورەوە دەنگێکی ناسك لەرێگەی ئامێری فلوتەوە دێت و دەڵێت: دەستم بگرە با بگەمە سەر ئەو کەنارەی لێی وەستاویت، منیش وەك تۆم ، منیش خەریکە سەرابی غوربەت دەمخنکێنێ . بەم جۆرە دایەلۆگێك لەنێوان دوو گەرووی غەریبدا دروست دەبێت، بەلام دوو دەنگەکە تێکەڵ نابن و ئۆرکێسترا دەکەوێتە نێوانیان. دەنگێك داوای یارمەتی دەکاتو دەیەوێت ئەو هەموو ساڵە وەریوەی خۆی کۆکاتەوە، ئەوە دەنگی خۆشەویستە ، ئەوەی تریان هەوڵ دەدات بە هاوارییەوە بچێت، ئاورێك دەداتەوەو خۆشەویستەکەی دەبینێت لەپشتەوەی هەوردەکان ، لەدووری دوورەوە زۆر بەکزی دیارە ، دەستی بۆ درێژدەکات بەلام ناگات پێی، هێدی هێدی، لەچاوانی ون دەبێت ، بەدوای دەگەرێت بەلام نایدۆزێتەوە، ئیدی دەنگەکان لەیەکتر دەترازێن وجارێکی دی ئۆرکێسترا دێتەوەو دەنگی تەپڵ و بووقەکان زاڵ دەبێتەوە، بۆ ئەوەی زاڵبوون وبەهێزی قەدەر بسەلمێنێت.

دوایئەوە مۆسیقا هێدی هێدی بەرەو لاوازی و هێمنی دەروات، بۆ ئەوەی پێمان بڵێت: تازە گەنجی نایەتەوەو دەبێ تەسلیم بەقەدەر ببین و، ئیدی تاهەتایە وەکو رێبوار بژین و چاوەڕێی وەرینی بەردەوامی رۆژەکان و بەسەر چوونی بێهودەیی تەمەن بکەین.

### جوڵەی چوارەم:(زۆرخێرا)

ئەم جوڵەیە لەم بەشانەی خوارەوە پێك دێت :

زۆرخێرا: iassa orgella

یەکجار خێرا: otserp

گۆرانی لەلایەن (باریتۆن)ەوە. )notyrab(ovitaticeR

گۆرانی لەلایەن چوارینەو کۆرسەوە- زۆر خێرا-: egro assai lla ,routauq

سروودیکۆرس بەلەسەرخۆیی و فراوانییەوە .oigada

سروودیکۆرس بەلەسەرخۆیی و ملکەچییەوە. osotseam ,etnadua :rueohC

گۆرانی لەلایەن چوارینەو کۆرسەوە، تاراددەیەك خێرا.am opport non am oigada divoto

خێرا لەگەڵ لەرینەوەی بەمێزدا .ocigrene orgella

سرودی کۆرس لەوپەڕی خێراییدا. omissitsero :rueohC

لەجوڵەی یەکەمدا دەنگێك لەقەدەرەوە دێت و مۆسیقا دووجار بەتکاکردن و ترس و تورەییەوە دەیخاتە لاوە، بەڵام بتهۆڤن لەسەر جوڵەی‌یەکەمی سیمفۆنیاکەی دەنوسێت:" نا، ئەوە جارێکی دی یادەوەریمان دەباتەوە بۆ حاڵەتی بێنومێدی". لەجوڵەی دووەمیشدا چەند ئاوازێکی سەما ئامێز دێتە بەرگوێمان و مۆسیقادیسان وەلای دەنێ بەڵام ئەمجارەیان بەلەسەرخۆیی و بەبێ تورەبوون، بتهۆڤن لەسەر نۆتەکانی جوڵەی دووەمیش دەنوسێت:" ئەمەشیان نا، ئەوە شتێك نییە جگە لە گاڵتەجاڕییەك، بەڵام تۆزێك شادی بەخشترە، شتێکی باشترو جوانترمان گەرەکە!".

ئینجا لەجوڵەی سێیەم ئاوازەکانی سۆز دەمانبەنەوە بۆ یادەوەری و خاومان دەکانەوە، بەڵام مۆسیقا بەبێزاری دەیخاتە لاوە، وەك ئەوەی غیرەی لێبکات. دەربارەی جوڵەی سێیەمیش بتهۆڤن دەنوسێت:" ئەمەشیان نا، ئەوە زۆر سۆزدارە، دەبێت بەدوای شتێکی زیندووتردا بگەڕێین".

ئەوەی بتهۆڤن و دەروونی مۆسیقارژەن دەیەویست شتێکی دیکەبوو، شتێك بوو شادی بۆ ئاخ و خۆش بەختی بۆ جەستە دەهانی. بتهۆڤن لەکۆتایی وەسیەتنامە بەناوبانگەکەیدا کە بەناوی "وەسیەتنامەی هیلیگنستاد"ەو لەکاتی تووشبوونی بەکەربوون داپڕشتووە، دەنووسێت:" ماوەیەکی دوورو درێژە سەدای قوڵی شادیی راستەقینە بەمن نامۆیە، ئاخ، کەی، ئاخ، کەی ئەی خواوەند کەی دەتوانم جارێکی‌دی لەپەرستگای سروشت و ئادەمیزاددا هەستی پێبکەم!

هەرگیز؟ نا ئەوە بۆمن زۆر سەخت دەبێ.."(روح الموسيقى، لا 355)

ئەو شادییەی بتهۆڤن بەدوایدا دەگەڕاو بۆ مرۆڤایەتی دەیخواست ئەوا لە جوڵەی چوارەمی سیمفۆنیای نۆیەمدا پێی گەیشتووەو زۆر بە باشی گوزارشتی لێوەکردووە، تەنها ئەو شادییە دەتوانێ دەروونە پڕ لە خەفەتو داچەپاندنەکان بشواتەوەو هەر ئەو بەتەنها دەتوانێ قەرەبووی ئەو هەموو ئازارە بکاتەوە کە لەدەستمان چووە.

لەم جوڵەیەدا بتهۆڤن دەیەوێت گوزارشت لەو ساتانە بکات کە تیایدا شادیو خۆش بەختی بەسەر ئادەمیزاددا دەبارێو ئازادی بۆ مرۆڤایەتی دێتەدی. ئەمەش لەڕێگای ئەو دایەلۆگە چڕو بەرزەی کە لەنێوان ئامێرەکانی ئۆرکێسترادا دروست دەبێت. هەموو ئەو ئامێرانەی لە هەرسێ جوڵەکەدا بەشداریان دەکرد، لێرەدا خۆیان دووبارە دەکەنەوە، بەڵام ئامێرەکانی فووکردن(النفخ) بەبەردەوامی بەرەوڕوویان دەوەستنو ئینجا ئامێرەکانی فووکردن مژدەی شادیو کامەرانی لێدەدەنو بەچەند هەڵهەلەیەك ڕێگە خۆشدەکەن بۆ قەسیدەی شیلەر، ئۆرکێسترا هەوڵ دەدات ڕێگەی ئەو مژدەبەخشینە بگرێ، بەڵام دەنگێکی مرۆیی لەناو کۆڕاڵەوە(کە دەنگی باریتۆنە) سەرهەڵدەداتو بەقورساییەکی زۆرەوە دەڵێت:

هاوڕێیان .. هاوڕێیان

چیدی ئەودەنگانە بەردەوام نابن

باگۆرانی برایەتی، گۆرانی شادیەکە بچڕین

ئەی شادی با سەرفرازت کەین.

ڕۆمان ڕۆڵان وەسفی ئەو ساتانە دەکات کە دەکەوێتە پێش هاتنی سروودی شادی لە جوڵەی چوارەمو دەڵێت: " ئەو دەمەی کاتی ئەوەدێت بابەتی شادی بۆ یەکەمجار لەسیمفۆنیای نۆیەمدا بەدەربکەوێت، ئۆرکێسترا بۆچەندساتێك لەژەنین دەوەستێتو سکوونێکی واباڵ بەسەر ئەو ناوەدا دەکێشێ کە سروشتێکی خودایی دەبەخشێتە دەسپێکردنی سرودەکان)(نزعات انسانیە،لا 52و53).

بیتهۆڤن کە بۆخۆی رابەرایەتی تیپی ئۆرکێسترای دەکرد لە نمایشکردنی سیمفۆنیای نۆیەمدا، بەورپەڕی حەماسەتو هەڵچوون گوزارشتی لەو حاڵەتانەی هەستکردن بەشادی دەکرد.

لە(7) ی مایسی 1824 کە سیمفۆنیاکە بۆیەکەم جار لەسەر شانۆی کارەنتیین نمایشکرا، دوای ئەوەی سەعاتو نیوێکی خایاند، کەتەواوبوو جەماوەر بۆماوەیەك بێدەنگیی نواند چونکە هێشتا لەژێر کاریگەریی ئاوازەکاندا بوو، ئینجا لەنکاوێکەوە چەپڵەرێزانو فیکەلێدان ئەوناوەی پڕکرد، جەماوەر سەرتاسەر بۆ رێزلێنانو ستایشکردنی ئەو کارەمەزنەی بتهۆڤن هەستابوونە سەرپێو چەپڵەیان لێدەدا، بەڵام بتهۆڤن هیچ ئاگای لەو چەپڵەلێدانە نەبوو، بۆجاری دوەم پەردە لەسەر شانۆ لادرایەوەو جەماوەر هەر لەچەپڵە لێدان بەردەوام بوو، بەڵام هێشتا بتهۆڤن بێئاگابوو لەم ستایشە مەزنەی جەماوەر ، بۆجاری سێیەم پەردەلەسەر شانۆ لادرایەوە، ئەمجارەیان(ئۆمیلۆف)ی مۆسیقاژەن بیتهۆڤنی لەو چەپڵەرێزانو هاندانەی جەماوەر ئاگادار کردەوە، ئینجا بتهۆڤن کە تائەو کاتەش پشتی لەجەماوەر بوو رووی کردە جەماوەرو بۆیان چەمایەوەو سوپاسی کردن، پاشان دەستی کردە گریان، گریانێك کە هەر خۆی دەیزانی چەندە کاریگەربوو، ئەو کەبینی گەل سوپاسی دەکاتو چەپڵەی بۆ لێدەدەنو ئەویش گوێی لێنابێت هەستی بەکەم وکوڕیەکی زۆرکردوو نەرم نەرم فرمێسك لەچاوانی دەهاتنەخوار، لەلایەکی دیش زۆر دڵشادبوو چونکە لەو ئیشەیدا بەراستی توانیبووی گوزارشت لەشادی بکاتو هەستی دەکرد ئیدی ئەو شادترین پیاوی دونیایە(ه.س.پ، لا 54).

## بانگەشەیەك بۆشادی

**فریدریك شیلەر**

ئەم قەسیدەیە لەلایەن کۆرێکەوە لەجوڵەی چوارەمدا ئەدا دەکرێت.(ه.س.پ، لا 56).

باریتۆن:

هاوڕێیان .. هاوڕێیان
چیدی ئەودەنگانە بەردەوام نابن
باگۆرانی برایەتی، گۆرانی شادییەک بچڕین
ئەی شادی با سەرفرازت کەین.

باریتۆن و چوارینەو کۆرس: ****
شادی، ئەی کانیاوی رووناکی نەمر..
ئەی کوڕی فیردەوس ..
بەناو ئاگردا هاتین تابگەینە کەنارەکانت
بۆ حەرەمی پیرۆزت هاتین و
بەروناکی سەفای دڵرفێنت.. مرۆڤایەتی لەکۆت و زنجیرە سەختەکانی رزگاری دەبێ.
لەهەر شوێنێک تۆ لە شەقەی باڵتدا
خەڵکی لەهەموو دونیا بران..
تۆ ئەی ئەوەی برادەرێکی بەوەفات گرتووە ... و
ئەی لەوەی دڵی ژنێکت کێش کردووە.
باهەموومان بەیەکەوە ئەو شادییە ستایش کەین
کێش رەزیلی بەدڵی دەکات
با لەئەشکەوتەکەی خۆیدا جێیبهێڵین لەتەنیایدا بتلێتەوە.
کامەرانی دەوری مرۆڤایەتی دەدات و
سەداکەی هەموو بستێکی سەرزەوی دەگرێتەوە
بۆ باش وخراپ و .. بۆهەموو شتێک لەسروشت
سادەبا مژدەی شادییەکی پاراو بلاوبکەینەوە.
شادی چێژو ئاسکیەکانی خۆشەویستیمان پێدەبەخشێ و
بەشی هەموو گەردوون دەکات..

لەو پەپولەیەی لەبەهاردا سەما دەکات،

تالەو فریشتەیەی لەنزیک عەرشی خودا دانیشتووە.

تینۆڕو کۆرس:

باخۆشی بکەین کە خۆر بەهەیبەتەوە بەنێو ئاسمانە دوورەکاندا دەخولێتەوە

لەی برایان .. رابن و خێراکەن و

باچاوەکانتان تیشکی

نەبردی وشادی و سەرکەوتن بدەن

شادی، لەی کانیاوی رووناکی نەمر..

ئەی کوڕی فیردەوس ..

بەناو ئاگردا هاتین تابگەینە کەنارەکانت

بۆ حەرەمی پیرۆزت هاتین و

بەرۆشنایی سەفای دڵرفێنت مرۆڤایەتی رزگارە دەبێت

لەهەر شوێنێک تۆ لەشەقەی باڵتدا

خەڵکی لەهەموو دونیا بران.

کۆرس:

ئەی ملیۆنەها خەڵک

هەڵسن وکۆببنەوەو

لەدڵەوە ماچی برایەتی بگۆڕنەوە،

لەو باوکەمان کە لەئاسماندایە

خۆشەویستی خۆی بەدونیا دەبەخشێ

بەوهەموو ملیۆنە لەدروستکراوەکانی خۆی..

کە لەرێگەی خۆشەویستیدا رێگەی لەو دەدۆزنەوە

بەدوایدا بگەرێن، لەوەتا لەبەرزاییەکاندا،
شوێنی والەوێیە ، لەئاسماندا لەنێوانی ئەستێرەکان

کۆرس:
شادی، لەی کانیاوی رووناکی ئەمر..
لەی کوری فیردەوس ..
بەناو ئاگردا هاتین تابگەینە کەنارەکانت
بۆ حەرەمی پیرۆزت هاتین و
بەرۆشنایی سەفای دڵرفێنت مرۆڤایەتی رزگارە دەبێت
لەهەر شوێنێک تۆ لەشەقەی باڵتدا
خەڵکی لەهەموو دونیا بران.

چوارینەو کۆرس:
لەی ملیۆنەها خەڵک
هەڵسن و کۆبنەوەو
لەدڵەوە ماچی برایەتی بگۆرنەوە،
لەو باوکەمان کە لەئاسماندایە
خۆشەویستی خۆی بەدونیا دەبەخشێ
بەوهەموو ملیۆنە لەدروستکراوەکانی خۆی..
کە لەرێگەی خۆشەویستیدا رێگەی لەو دەدۆزنەوە
بەدوایدا بگەرێن، لەوەتا لەبەرزاییەکاندا،
شوێنی والەوێیە ، لەئاسماندا لەنێوانی ئەستێرەکان.

سەرچاوەکان:

1- روح الموسيقى، سمير الحاج شاهين، 1980.

2- التحليل الموسيقى، تاليف: سيدرك تورپ ديڤى، ترجمه وتعقيب: د. سمحه الخولى، مراجعه: د. حسين فوزى، 2000.

3- نزعات انسانيه فى موسيقى بتهوفن،فانم الدباغ، 1979.

4- هيرمان هيسه ، لعبه الكريات للزجاجيه، مسطفا ماهر، 1998.

5- کاسێتی مۆسیقای سیمفۆنیای (9)یەمی بتهۆڤن.

*ئاماژەیە بۆ پەیڤێکی( شێرزاد حەسەنی چیرۆك نووس).

** سکیرزۆ: پارچەیەکی مۆسیقایی خێرایە، کە بەزۆری لە مەنوێت دەچێتو سروشتێکی سەما ئامێزی تێدا ئامادەیە.

*** دێرە شیعرێکی (بەختیار عەلی) یە.

**** چوارینە لێرەدا واتا ئەم دەنگانەی خوارەوە: سۆپرانۆ، ئالتۆ/ کۆنترائالتۆ، تینۆر، باریتۆن.

دۆستی وەرگێرانی ژمارەی ئایندەی ئەمآ لەسەر عەقلانییەت و رەهەندەکانی بونیادنانی کایەیەکی عەقلانییە لەسەرجەم بوارەکان. بەوهیوایەین بابەتی وەرگێردراو لەو بوارە بکاتە گۆڤارەکەمان.

# گفتوگۆ لەگەڵ ئەحمەدی مەلا:

# ئەمەنفا شوێنی تەحقیقکردنی خەونەکانە، ئەنیشتیمانیش ئەو دۆزەخەیە کە خەڵك لێوەی هەڵدێ

سازدانی : نما

پ1/ بەگەڕانەوە بۆ شیعری کلاسیکی کوردی، حەقیقەتێك دەبینرێت کە زۆر گرنگە، ئەویش ئەوەیە ، شاعیرانی کلاسیك توانیویانە تەواو دەربڕی زیار و شارستانیەتی سەردەمی خۆیان بن، ئەوان نەتەنها شاعیریەتی خۆیان سەرچاوەیەکی گرنگی مەعریفەو رۆشنبیری و کایە جۆر بەجۆرەکانی دیکەی زانست و تێکەیشتن بوون لەسەردەمی خۆیاندا. ئەوان لەگەڵ پێشکەوتن و بزاوتە هەمەجۆرەکانی سەردەمی خۆیان رێیان دەکرد، بەمانایەکی دی:

کاتێك ئەوان شاعیران دەخوێنیتەوە تۆ لە بەردەم خوێندنەوەی قۆناغێکی مێژوویی یان زیارێکی زۆر تایبەت و دیاریکراودایت. ئایا شاعیری نوێخواز و مۆدێرنی کوردی توانیویەتی ئەو رۆڵە ببینێت؟ ئایا ئەو توانیویەتی بە حیسابکردن بۆ ئەو پێشکەوتنە مەزنەی دونیای گرتۆتەوە پیشاندەرو زیاوی قۆناغێك لەقۆناغەکانی مێژوو بێت؟

✦ **ئەم چەمکەی** ئێوە باسی لێوە دەکەن تەنها پەیوەندی بەشیعر و شاعیرەوە نییە، بەڵکو هەموو مرۆڤێك دەگرێتەوە. بەو مەبەستەی ئایا ئەو مرۆڤە تاچ رادەیەك سوود لەرۆشنبیری سەردەمەکەی خۆی وەردەگرێت.

جابەنیسبەت شاعیرانی کلاسیکەوە، رەنگبێ ئەم مەسەلەیە ساناتر بێتە پێش چاو ئەویش چونکە سەرچاوە مەعریفییەکانیان تارادەیەك زۆر پێکدەچوون. سیستەم و پرۆگرامەکانی حوجرە لەیەکتریەوە زۆر نزیکن، ئەوەی شاعیرانیش لەیەکتر جودا دەکاتەوە ئەو مامەڵە فەردییەیە کە مۆرکی تایبەتمەندێتی خۆیەتی. تێروانین بۆ حیساباتی ژیان و چێژو گشت ئەو چەمکگەلانەی کەشاعیرێك لەیەکێکیدی جودا دەکاتەوە.

ئەوەی سەبارەت بە شیعری نوێش دەوترێت، هێشتا زۆر زووە بۆ ئێمە کە بتوانین بەچاوێکی تیژەوە هەموو لایەن و بوعدەکانی دەستنیشان بکەین. ئیمرۆ شتێك هەیە بەناوی شیعری نوێوە، بەڵام نوێ لەچیدا، ئایا مەسەلەکە تەنها فۆرم و تێکشکاندنی شکڵە یان شتی تر. بۆچی هەندێ جار بەزەحمەت دەتوانین خەسڵەتی شاعیرێکی بەحسێب نوێخواز دەسنیشان بکەین،ئایا ئەم کێشەیە ، پەیوەندی بەپێگەیشتنی ئێمەوە هەیە یان بەماناتەکامولی ئەوی شاعیر.

مێژووش وەکو دەزوولەیەکی ئاوی بەناو جەستەی شیعردا تێدەپەڕێ، جا ئەوەی دەمێنێتەوە، چۆن دەتوانین هەستی پێبکەین و بیبینین. لەرێگای شیعرەوە مێژوو ناخوێندرێتەوە، رەنگبێ هەندێ توخمی ئەو مێژووە یەکلا بکرێتەوە، پاشان شیعر خۆی بەشێکە لەمێژوو

پ2/ چونکە هاتینە سەر کۆن و نوێی شیعری کوردی، خراپ نییە گەر کەمێك لەسەر ئەم بابەتە بمێنینەوە، دوای راپەڕین رەوتێکی تارادەیەك نوێو گوزارشێکی خێرا بەسەر شیعری کوردیدا هات، کۆمەڵێك دەنگ چ لەناوەوەو چ لەتاراوگەدا سەریان هەڵداو رۆڵی گرنگیان بینی لە بیناکردنی ئەو حاڵەتەی کە ئێستای شیعری کوردی تێیدایە، هەر ئەم دیاردەیەو لەگەڵ سەرهەڵدانی کۆمەڵێك چەمکی نوێ لەدونیای مەعریفەدا وەك مۆدێرنیزمی و پۆست مۆدێرنیزم و ..تاد وایکرد لەپانتایی شیعری کوردیدا دوالیزمی سەلەفی/ نوێخواز، سەرهەڵبدات، کە دواتر ئەم دوالیزمە خۆی لەناو چەند ئەزموونێکدا دۆزیەوە.. تۆ وەك شاعیرێك کە ماوەیەکی دوورو درێژە لەتاراوگە

دەزیت و ئاگاداری ئەو پێشکەوتنە زلـەی زمـان و ئـەدەبیات و مەعریفـەی رۆژئـاوایت و لەهـەمان کاتیشدا بە ئەزموون و گوتارە شیعری و ئەدەبیەکانی کوردیش لـەدەرەوەو نـاوەوەی کوردسـتان ئاگاداریت، ئایا ئەم گوتاری سەلەفی و نوێخوازە ، یان کلاسیک و مۆدێرنە.. یان هـەر دوالیزمیکی دیکە که خۆی لەم چوارچێوەیەدا دەبینێتەوە چۆن دەخوێنیتەوەو تاچەند کاریگەر بووە بەسەر بـاری رۆشنبیری کوردی بەگشتی و شیعر و ئەدەبیات بەتایبەتی؟

✦ ئەم مەسەلەیە زۆر جار تەرحدەکرێت وەکو ئەوەی تاوەکو ئێستا نـەمانتوانیبێت کێشەی کۆن و نوێ لەیەکتر جودا بکەینەوە. مەسەلەکە پەیوەندی بەزەمەنەوە نییە هـەندەی پەیوەندی بەحاڵەتە زەینیەکانـەوە هەیـە، بەلای منـەوە ئـەوەی گرینگـە، ئەوەیـە کـە چـۆن هەمیشـە هەڵوێسـت بەرامبـەر بـەنوێ وەرگریـن و هەمیشـەش بـەچاوێکی پـڕ لەگومانـەوە تەماشای بکەین.

من ئێستا نازانم شیعری نـوێ چییـە؟ بـەڵام زۆر بەباشـی دەزانم کۆمـەڵگای کـوردی چ شتێکی نوێی پێویستە، هـەر لەناو وکارەباو تـەنزیمی شار و خۆشگوزەرانی هاووڵاتیـان و پەروەردەی دیموکراسی و راهاتن لەسەر ئازادی که مەرجو دەسکەوتێکی گرینگە کە تیایدا مـرۆڤ رێـز لـەویتر بگرێـت تـا دەگاتـە یەکگرتنـەوەی هـەردوو لەتەکـەی کوردسـتان و بەشێوەیەکی عادیلانە دەسکەوتی نیشتیمانی لەرێگای نیشتیماندا خەرج بکرێت.

راستە راپەرین لەحزەیـەکی گرینگـە لـەمێژووی میللەتەکـەمان، بـەڵام مـەرج نییـە لەگـەڵ خۆیـدا شـەپۆلێکی شیعری و فیکری نوێ بهێنێتەکایـەوە. ئازادی زۆر گرنگە بـۆ نووسـین، بەڵام تاقە مـەرجی ئیبـداع و داهێنـان نییـە، ئێمـە پێویستیمان بـە ئـەزموونی ژیـان هەیـە، لەهـەموو ئاسـتەکان، هـەر لەکتێبخانـەوە بگـرە بـۆ باخچـە، لەسـەفەرەوە بـەرەو گەیشـتن بـە وەسائیلەکانی تری گەیاندن. ئێستا خـەڵکی لـەجیاتی ئـەوەی زمانێکی تـری بێگانـە فێربن، هەندێ گەنج و مێرمنداڵ هەن عارەبی نازانن، ئەمەش زیانی زیاترە لەسوود.

ئیمرۆ مۆدێرنیزم بەنیسبەت میللـەتی کوردەوە ئەوەنییە، چەند کەسێك دوو سێ کتێب بەزمانـەکانی بێگانە بخوێننەوە، بەڵکو چۆن کۆمەڵی کوردەواری دەتوانـێ حـوار و مامەڵـە

بکات لەگەڵ جیهانی پێشکەوتوو، هەروەها چۆنیش بتوانێ ئامرازی رەخنەی پێببێ و هەموو شتێك بەکوێرانە قەبوڵ نەکرێت.

بەچ شێوەیەك کورد ئیمرۆ باس لەپۆست مۆدێرنیزم دەکات لەکاتێکدا چرا بە بەردەوامی کێشەکان روناك ناکاتەوە بۆ ئەوەی بخوێندرێتەوە . ئێمە دەبێ لەسفرەوە دەسپێبکەین ئەمەش قبوڵ بکەین.

ئەگەر بێینەوە سەر کێشەی ئەو دوالیزمەی کە ئێوە باسی لێوە دەکەن، ئایا ئەمەش لە داهێنانی رۆشنبیرەکان خۆیانە؟ ئایا بەراقیع ئەم کێشەیە وجودی هەیە؟ کوان ئەو قرتابخانانەی کەبەرگری لەسەلەفیەت دەکەن، کوان ئەکتەردکانیان، لەچ شتێکدا بەدەردەکەوێت؟

من سەلەفیەت لەناو ئەوانەشدا دەبینم کە خۆیان بەنوێخواز دەدەنە قەڵەم، نوێخواز لەسەر کاغەزو سەلەفی لەکردار و رەفتار، لەجل و بەرگ، لەشێوەی نانخواردن، تەعبیری رۆژانەو..تاد.بەرای من، ئێمە هەمیشە دەبێ بگەرێینەوە سەر ئەوانەی کە خۆیان بەنوێخوازییەوە خەریك دەکەن، هەموو کێشەکان لەوێن.

پ3/ مەنفا لە ئێستای سایکۆلۆژیایی کورددا، بووە بەحاڵەتێکی تاسەر ئێسقان نزیك و بابەتێکی زۆر جددی، کە نیشتیمان دەبێتە بازاڕ و مەرگ و ئەهامەتی دەرگاکانمان دەگرێ، تاکە فریادڕەس بۆ دەرچوون لەم ڕاڕایی و دوودڵییە ، مەنفایە. ئاخۆ ئەگەر نیشتیمان داخستنی دەرگاکانو کوشتنی خەونەکان بێت، ئەوا مەنفا کردنەوەی چەند دەرگایەکی‌نوێ و چەند خەونێکی تازەیە.

کە لەنیشتیمان دەتۆرێیت ئاکە باوەش کە وەخۆت دەگرێ یان پەنای بۆ دەبەیت ، مەنفایە، بەمانایەکی دیکە مەنفا ئەو ئاتناییە بەرجەستە بووەیە کە تیایدا خۆت لەدڵرووخانە رۆحیەکان دەشاریتەوە، بەڵام بەدیویکی دیکەدا، مەنفا ئەو واقیعە تاڵەیە کە تۆ تیایدا قەرەجێکیت و ئیسانەی غەریب وەکو مۆر بەردەوام بەنێو ئەوێڵتەوەیە، مەنفا ئەو سەر زەمینە یان و بەرینەیە تیایدا

**لەچراو خەڵک و جادە و شۆستەو بست بەبستی ئامۆیت، لەمەنفادا لۆ لەومندە بچووک دەبیتەوە دەبیت بە پنتێک و هەموو لەحزەیەکە دوورنیە لەحزەی ونبوونی لۆ بێت، دواجار مەنفا ترسێکە هەموو رۆژێ دووبارە دەبێتەوە ترسی لەوەی کە لێرە لەدەرەوەی نیشتیمان بمرم.**

**ئایا ئەحمەدی مەلا! چۆن دەڕوانێتە حاڵەتی مەنفا و تاچەند توانیویەتی مامەڵە لەگەڵ رەهەند و مەودا جۆربەجۆرەکانی مەنفاو وڵات بکات؟**

✦ ئەمەنفا شوێنی تەحەقکردنی خەونەکانە، ئەنیشتیمانیش ئەو دۆزەخەیە کە خەڵک لێودی هەڵدێ، بەرای من لەدوای راپەرینەوە، حاڵەتێکی نوێ هاتۆتە کایە، ئەویش ئاسان نییە، بەڵام راکردن و وڵات بەجێهێشتن زامەکان چارەسەر ناکات. ئەمەو سەرەڕای ئەوەی ئەوانەی دوای راپەرین ئاسنامەی پەناهەندێتی وەردەگرن، کەمیان مافی ئەوەیان هەیە، یا ئەوەتا ئەو چیرۆکانەی کە دام و دەزگاکانی ئەوێ باسی دەکەن، رەنگبێ لەواقیعەوە دوور بێت. جا چۆن ئەم حاڵەتانە ناوبنێین مەنفا. راستە بارودۆخی کوردستان زۆر جێگیر نییە، دوارۆژ زۆر روون و ئاشکرا نییە، گەلێ حیساباتی ناوچەیی ودەوڵەتی دەبێ بکرێت. بەڵام سەفەرکردن بۆ خۆشکردنی گوزەرانی ژیان شتێکەو هەڕەشەی جەستەیی و فیکریی و بیرو باوەڕیش شتێکی دیکە.

لەدەرەوەی وڵات گەلێ ئاست هەیە کە پەناهەندان تێیدا دەژین. ئێستا کوردەکان وەکو تەجەموعە تورکەکانیان لێهاتووە، لەناویەک و لەگەڵ یەک دەژین و مامەڵە دەکەن. ئەمەش وادەکات کەمتر تێکەڵی راستەوخۆی ژیانی ئەو شارە بن کە تیایدا دەژین. ئەورووپای رۆژئاوا هەموو ساڵێک پێویستی بە کرێکارێکی زۆر هەیە بۆ ئەوەی ئەو بەتاڵیەی پێ پڕبکاتەوە کە کۆمەڵگای رۆژئاوایی دروستی دەکات. بەشێکی ئەو پێویستییە دەخرێتە چوارچێوەی پەناهەندەی سیاسی، یان ئینسانیەوە.

تاوەکو کەلتوورەکان لەیەکتریەوە نزیک بن، ئەوندە تێکەڵ بوون و خۆگونجاندن لەناو کۆمەڵگای نوێ ئاسانتر دەبێت. لەسەدەی نۆزدەهەم پۆلۆنیەکی زۆر گەیشتنە فەرەنسا، بەڵام ئیمڕۆ تەنها بەناوەکانیان جودا دەکرێنەوە، چونکە گەلێ خاڵی هاوبەش لەنێوان کۆمەڵگا

ئەوروپاییەکاندا هەن. هەر لە رەنگی پێستەوە بۆ ئایین، مێژوو، زمان، رموز وعادات و نەرێتە کۆمەڵایەتیەکان. ئەمەش بەپێچەوانەی ئەو چوار ملیۆن عەرەبەی کە لەفەرەنسادا هەن، یان ئەو چەند ملیۆن تورکەی کە لەئەڵمانیادا هەن. زۆرجار بەحوکمی مەسافەی شارستانی و ئایینی و زمانەوانی، جالیەی پەناهەندە خۆی دوورە پارێز دەگرێ، لەترسی توانەوە،یان لەترسی ئافاتی بەهاو قیەمە رۆژئاواییەکان. ئەمەش حاڵەتی تەحەجور پەیدا دەکات.

ئێمە نابێ لەرۆژئاوا بترسین، پێویستە بتوانین لەگەڵی بکەوینە گفتوگۆ و دیالۆگ، ئەمەش تەنها کاتێك رووددات ئەگەر رۆشنبیری خۆمان بناسین و ئاگاداری هی ئەوانیش بین.

ئەوەی پەیوەندی بەمنەوە هەیە، هەڵبەتە من دەمێکە کوردستانم بەواقیع جێهێشتووە هەر لەساڵی 1975ەوە چومە بەغدا و گەڕانەوەم بۆ کوردستان ناوبەناوبوو، پاشان ساڵی 1981 بەیەکجاری چوومە دەرەوە، پەیوەندی من لەگەڵ ئەو وڵاتانەی کە تیایان ژیاوم، تایبەتمەندی خۆی هەیە . شاری ژنێڤ وەکو لابۆرێکبوو، منیش وەکو هەرزەکارێ، زۆر بەتەحەداو جورئەتەوە مامەڵەم لەگەڵ دونیای ئەوێدا کرد. هەر لەهەوڵدان بۆ فێربوونی زمانی فەرەنسیەوە تاوەکو موغامەرەی " زەردك" نووسین و کاری تەشکیلی و نمایشکردن لەشانۆ و ئەزموونی کردنی فلیمێك بە 8 ملم. ئەمانە ئارەوزوو و ئاداتی منالانە بوون، حەزم دەکرد موماریسەیان بکەم. ئەزموونە عاتفیەکانیش زۆرجار بوعدێکی تراژیدیان لەوێ بەمن دەدا. کۆدە کۆمەڵایەتیەکان سرك بوون وتێکەیشتن لێیان زۆر زەحمەت بوو. بەهەر حاڵ ،شاری ژنێڤ ، لابۆرێك بوو دەبوایە جێی بهێڵم.

وڵاتی فەرەنسا، دەرگا فراوانەکانی کرایەوە. لەپۆلی یەکەمی دانیشگا خۆم بینیەوە، وەکو ئەوەی تازە لەدایك بووبم. بۆماوەی نۆ ساڵ لەدانیشگا مامەوە، تاوەکو پلەی دکتۆرام وەدەستهێنا. ئەمەش ئەزموونێکی تربوو، زیاتر لەو شتانە قووڵ بوومەوە کە لەشاری ژنێڤ بەپەلەیی بەتەنیشتیاندا تێپەریبووم.بەهەرحاڵ تەجرەبەی ژنێڤ دووبارە نەبوومەوە.

ئێستاش بۆ ماوەی دوو ساڵە لە ئیسپانیام. هێشتا سەرەتایە، بابزانین ، لەوێ چم پێدەکرێ ئەم سەفەرانە زۆر سوودیان هەبوو لەوەی کە لەوڵاتێك قاڵب وەرنەگرم.

پ4/ هەر لەتەمەنی مەندالدا ، مەندا بەدەر لەمەفهومە جوگرافیەکەی و دواجار مەبەستم مەندالەکانی ناوەوەی لەحمەدی مەلان، تاچەند پەیوەندیە رۆحیەکان لۆیان لەگەڵ لەدەب و شیعردا گرێداوە..لاخۆ مەندالەکانی ناخی لەحمەدی مەلا وایانکردووە کە تێژی دکتۆراکەی لەسەر مەحوی بێت، وەک هەموو لەو کوردانەی کە دەچنە دەرەوەو لێژەکانیان لەسەر ژانەرە لەدەبیەکانی لەدەبیاتی کوردییە؟! بەدیویکی دیکەدا بۆ نەکراوە شاعیرێک، نووسەرێکی کورد نامەی دکتۆرای یان ماستەری لەسەر رامبۆییْ یان هەر شاعیرێکی دیکەی فەرەنسایی، ئیسپانیایی، ئیتاڵیایی بەدەستبێنێت؟ لانی کەم لەمەیان بۆ ئاڵوگۆڕکردنی ئەدەب و هونەر و شیعر لەنێوان خوێنەرانی گەلاندا.

✦ ژیانی شەخسی خۆم هەمیشە لەوێنەیەکدا دەتوانم پێناسەی بکەم یان ببینم ئەویش کۆچکردن و سەفەرە. یەکەم کۆچکردن دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی 1963 کەتەمەنم پێنج ساڵان بوو، حەرەس قەومیەکان گەیشتنە گوندەکەمان و باوکمیان بەزیندانی برد و ئێمەش ئاوارە بووین. ساڵێك لەناوچەی دزایەتی بووین و، پاشان گەڕاینەوە بۆ زەردك لەساڵی 1964دا بەیەکجاری لە کەرکوك نیشتەجێبووین و دوای دەساڵ دەچمە بەغدا و پاشان بەسرەو ئینجا سویسرا..تاد. زۆرترین شوێن کەتێیدا نیشتەجێبووم شاری کەرکووکە کە ئەویش تەنها (10) ساڵێکەو ئەوە بۆ بیست ساڵ دەچێت کە نەمتوانیوە گەرەکی منداڵی و قوتابخانەی سەرەتایی وئاسمانەکەی ببینمەوە.

من هەمیشە بەنیوە چڵی دەگەڕێمەوە نیشتیمان و بەنیوە چڵی وڵات بەجێدەهێڵم. ئەمانە وایانکردووە کە لەناوەوەمدا هەست بەدڕزێك بکەم کە شوێنی دروست کردووە. زۆرجار نێرەیی بەجوتیارێکی ئیسپانیا دەبەم کە مەدریدی نەبینیوەو دار زەیتوونەکەی بەرامبەری جوانترین و گەورەترین درەختە. بەڵام من هەموو شتەکان بەچاوێکی نیسبیەوە دەبینم. هیچ شتێك زۆر باش و زۆر جوان و زۆر نایاب نییە. هەموو شتەکان دەکرێ لەگۆشە نیگای جیاوازەوە ببینرێن.وڵات لەدوورەوە جوانە، بەڵام کە دەگەڕێمەوە ، ئازارم دەدات، پیسی و

پۆخڵی، نیزامی مروور، ناشارستانیەت، ناڕەزایی خەڵك لەدەست كاربەدەستان..تاد بەڵام وڵاتی خۆمانە پێویستە ئیشی بۆ بكەین، دەكرێ ئەم وڵاتە ببێتە جێگایەك كە شانازی پێوە بكەین.

هەڵبژاردنی "مەحوی" پەیوەندی نە بەمەنفاوە هەبووە، نەبەوەی كە شاعیرێكە كە زۆر تەفسیری لێكردووم. من خوێندنی دانیشگام كردە دوو بەشەوە: بەشێك لەناو ئەدەبیات و زمانی فەرەنسی خۆی دەبینێتەوە، بەشەكەی تری سەبارەت بەئەدەبی كوردی بوو. ئەمەش

- ئەو ئاڵوگۆڕە دەگەیەنێ كە رەنگبێ ئێوە مەبەستان بێ

من لەسەر مەحوی ئیشم كردووە بەڵام لەهەمان كاتدا رامبۆم تەرجەمە كردووەو ئۆكتاڤیۆباس و بۆدلێریشم تەجەمەكردووە. جیهانی ئەم شاعیرانەش لەیەكتر دوورن.

خوێنەری كوردی واش هەیە كەلەسەر ئەدەبیاتی فەرەنسی تێزەكەی چێ كردووە ، بۆ نموونە(د. فەواز حوسێنی)لەسەر نووسەری فەرەنسی (شاتۆ بەریان) تێزەكەی نوسیوەتەوە. ئەمەش نابێتە پێوەر، دەبێ ئێمە لەسەر تێزەكان قسەبكەین. (كۆربان )گەلێ كاری نایابی لەمەڕ سەهرەوەردی و ئیبن عەرەبی نوسیووە، كاری نایاب و جێی رامانە. هەروەها مسیفۆن شاكارەكەی لەسەر هەلاجە كە لەساڵی 1923دا نوسیویەتی. بەپێزترین تێز دەژمێردرێت لەمەر ئەدەبیاتی تەسەوفەوە.

ئێمە زۆر شت لەرۆژئاواوە وەردەگرین، با جورئەتی ئەوەش بكەین ، شتێكیان پێ بڵێین. با كەمیش بێت، وجوودی ئێمە تەنها لەوەرگرتندا نییە، بەڵكو لەو ئاڵوگۆڕەوەیە كە رۆشنبیری پێ پتەودەكرێت.

پ5/ لەوەی تاوەكو ئێستا لەسەر مەحوی لە لێكۆڵینەوەو ساغكردنەوەی شیعرەكانی نووسراوە تادەگاتە دوایین لێكۆڵینەوە لەكوردستاندا لەلایەن(شاهۆ سەعید) ، زێتر قسە لەسەر دونیای تەسەوفی مەحوی كراوەو كەمتریش رەگەزە فەلسەفیەكانی شیعری مەحوی بەپێی میتۆدێك بوونەتە جێگای باس،ئێستا كە ئەحمەدی مەلا دەیەوێ بەروانینێكی جیاوازەوە لەمەحوی بڕوانێ

# لەکەرنەڤالی رەنگەوە

## بۆتێگەیشتن لەمانا ودروست بوونی بابەت..

### خوێندنەوەیەك بۆ کەڤالەکانی "هێمن حەمید"*

رەگەز رەشید

رووی بڵێسە، دزراو وقووت دراو

رووی تازە لاو

گەبچاری ئەو ساڵانەی بەسەماوە وەکو تاپۆ تێپەڕین

گەبچاری رۆژگەلێکە، ئەسووڕێنەوە بەدەوری

ئەو حەوشەو حەسارەدا.

سات ئاوری تێپەر ئەبێ ورووخسارە زۆرەکانی ئاور

ئەبنە یەك روخسار

هەموو ناوەکان، ناوێکن

گشت سیماکان، سیمایێکن

گشت سەدەکان، ساتێکن و

هاتاکو سەدەهای، سەدە

جووتێ چاوو رێ بەداهاتوو دەگرێ**

**تێزی نوێی لەملا) بۆ شیعرەکانی مەحوی تاچەند خۆیان لەلایەنە فەلسەفیەکان دلوە، شیعری مەحوی لەرووی فەلسەفیەوە لەکوێی شیعرەکانیاسەعدی وحافزا دان و لەچ دونیایەکیان دادەنێت، فەلسەفین یان تەسەوفین یان هەردووکیان؟**

✦ تێزەکەی من لەسەر سێکوچکەکەی کەربانەوە هەڵزناوە. باس لە شەریعەت و حەقیقەت و تەریقەت دەکات. بارستایی شەریعەت چەندە لەسەر دونیای شیعرو ئەزموونی حەقیقەت چۆن ،تەنەمولاتی سۆفی و ئەزموونی ناوەکی دەکاتە شیعر، هەروا باسم لەل تەریقەتی نەقشبەندی کردووە بەکورتی تێزێکی فرەلایەنە، بەو هیوایەم لەو ماوەیەدا بگاتە دەست خوێنەران چونکە بەڵێنیان داومەتێ کە لە کوردستان چاپ بکرێت.

**پ6/ لەدۆنیس پێوایە شیعر و فیکر دووشتی تاسەر ئێسقان پەیوەندیدارن و لەیەکتر دانابرێن، دیارە لەمە رای زۆرێک لەرۆشنبیران و بیرمەندانی دوونیایە، ئایا لەحمەدی مەلا چۆن دەڕوانێتە لەو پەیوەندیەی فیکر و شیعر، ئاخۆ تۆ لایەنە فانتازیی و ئێستاتیکیەکان لەچ ملمڵەیەکی شیعریدا دەبینی.**

✦ زۆرجار باسی شیعر و فەلسەفەش دەکرێت، یان شیعر و فیکر. گرفتی سەرەکی لەوەدایە کە فیکر بەشیعر دەربڕین، ئەوکات دەکەوینە ناو زەلکاوی خیتابەوە، واتە زمانێک کە پڕبێت لەراوێژکاری. بەلام ئەگەر هات و وێنە ئەم کەلێنەی پڕکردەوە، ئەو کات ئیجا لەدایک دەبێت و ئاسۆی خەیاڵ و بیرکردنەوەش فراوان دەکات. باشلار دەڵێ وێنە دایکی فیکرە، فیکر ساغکردنەوەش پێویستی بەزمانێکی تر هەیە کە هەنجەت و نموونە و تێز و دژە تێز بکاتە بنەماکانی و دەروازەکان لەرووی خوێنەر دانەخات، بەلام هەندێ جار وێنەیەکی شیعری ،دونیایەک داگیرمان دەکات و بەناو خۆیا جەبسمان دەکات. ئەمەش شتێکی زۆر ئیجابییە . شیعر وێنەیەکە لەقوڵاییەکانیدا فیکر دەجوڵێتەوە.

-1-

**ئاشــكرایە** بابەت لـە ئیشـێكی هونـەریدا گـەورەترین و سـەرەكیترین بنـەمای تێكەیشتنە لـە ئێشە هونەریەكەدا، یان بەشێوەیەكی دیكە بۆ ئەوەی بتوانین لە كەڤاڵێكی هونەری تێبگـەین، دەبـێ لـەپانتایی كەڤاڵەكەدا بەدوای بابەتدا بگـەرێین.دۆزینـەوەی بابەتیش گـەڕانـە بـەدوای بەشە شاراوەكانی نێـو ئـەو كوتلـەو بەشانەی كە لەكەڤاڵەكەدا دەبینرێن، ئەمەشیان بـەهۆی كۆمـەڵێك هێمــاو گوزارشــتی ســایكۆلۆژیەوە، زۆر جــاریش بابــەت دەبێتــە گــەورەترین بنـەمای‌داهێنان، واتـە ئـەو كاتـە كـەڤاڵێكی هونـەری سەركەوت ودروست دەبێت كە بابـەت لەكەڤاڵەكەدا بوونی هەبێ. واتە بەكۆمەڵێك تەكنیكی تایبەتەوە بابەتەكە برژێتە ناو پانتایی كەڤاڵێك.

(ئیـدوارد داڵـدن جـۆل) دەبێـژێ(داهێنـان لـە ئیشـێكی هونـەریدا كاریگـەری هونـەركارە بەبابەت، یان بەوێنەیەكی زەینی تۆماركراو). وەكو لەسـەرەوەش ئامـاژەم پێدا دۆزینـەوەی بابەت لە كەڤاڵێكدا گەڕانە بەدوای ئەو هێماو گوزارشتە سایكۆلۆژیانەی كەدابەش كراونەتە سەر كۆمەڵێك بـەش و كوتلـەوە .یان بەمەفهومێكی دیكـە بۆ ئـەوەی قسـان لەسـەر كـەڤاڵێكی هونەری بكەین و بەدوای فكرە و گوزارشتەكانی بگـەرێین، دواییش بەشـەكانی شیبكەینەوە، دەبێت پشت بە كۆمەڵێك هێمای سایكۆلۆژیەوە ببەستین كە لەنێو كەڤاڵەكەدا بوونیان هەیە.

لەدیوێكی دیكەشەوە چۆنییەتی ئیشـكردنی هونەرمـەند وئاشنابوون بـەو كـەل وپەلانەی كــە بــەكاریان دەهێنـــێ و دواتریــش گەڕانــەوە بــۆ مێــژوو و فاكتــەری دروســتكردنی كەڤاڵەكە(بەچەشنێك كـە رووداوەكانی نێـو كەڤاڵەكـە وەدۆزیـن) دەبێتـە هـۆی دروستبوون وگەلاڵـەبوونی كۆمـەڵێك هەستی تایبـەت ورەنگــە لەگــەل ســایكۆلۆژییەتی هونەرمەندەكـە لەكۆمــەڵێك مانـاوە یەكبگرینـەوە.. بۆنمونـە ئەگـەر ســەیری كـەڤاڵێكی (گۆگــان) بكــەین و بـەووردی لـە ئەتمۆسـفێری رابمێنـین.. ئـەوا لەگـەڵ رەنـگ و نـامۆیی فیگـەرەكان كۆمــەڵێك هەستمان بۆ دروسـن دەبێت و تەفسیری جیاواز جیـاواز ئـەدەین بەكەڤاڵەكـە، بـەڵام كـاتێك دەگەرێینەوە بۆ مێژووی "گۆگان" كە لەپێناو ئیشكردنی هونـەریدا پێنج منداڵ وژنەكـەی و وڵاتـی فەرەنسا جێدەهێلـێ ودەچێتـە جەزیرەی (هـایتی) لەئـەمریكای باشـوور، لەرێشـەوە

تێکەڵ بەدونیایەکی تایبەت بەنیگار کێشان دەبێ.. دوایش دەکەوینە گەڕان بەدوای رووداوی هەریەک لەکەڤاڵەکانی، ئەوا هەستەکانمان تایبەتمەندتر وتەفسیرەکان سەد وەشتا پلە جیاوازتر دەبێ و ئەشێ لە کۆمەڵێک دەلالەتدا یەکتر بگرینەوە.

کەواتە چۆنیەتی ئیشکردن و گەڕان بەدوای رووداوەکانی کەڤاڵێک، تەفسیر و رەخنەی کەڤاڵەکە تایبەتمەندتر دەکا،، بەئەندازەیەک رەنگە لەگەڵ سایکۆلۆژیەتی هونەرمەندەکە یەکانگیر ببێ.

ئێستا بالەسەر ئەوە کۆکبین کە لەو دیوەوە قسان لەسەر کەڤاڵەکانی (هێمن حەمید) بکەم کە تارادەیەک ئاگاداری چۆنییەتی ئیشکردن و تارادەیەکیش ئاگاری رووداو وبابەتەکانی نێو کەڤاڵەکانم، لەوێشەوە باس لەو کاریگەریانە بکەم کەبوونەتە بابەت بەسەر ئیشەکانیەوەو دوایش بخزێمە نێو ستاتیکای کەڤاڵەکان و کەمێک باس لەهەر یەک لەو بەش و کوتلانە بکەم کە بوونەتە شێوازێکی تایبەت بە"هێمن حەمید" و بچمە نێو قسەکردن لەسەر کەرنەڤاڵی رەنگەکان. دواجاریش هەوڵ ئەدەم گوزارشتی بابەت و دیدی نێو ئیشەکان بخەمەروو وباس لەو یۆتۆپیایانە بکەم کە لەناوەوەی ( هێمن)دا بوونیان هەیە.. بەو هیوایەم لە قودسیەتی ئیشەکان کەم نەکەمەوەو کەمێکیش بێ مافی خۆی بدەمێ.

-2-

## فرانسۆ مۆریاک دیێژێ:

" بروواناکەم لەنوسینەکانمدا کاریگەری هیچ کەس و هیچ پەرتوکێکم بەسەرەوە بێت، بەڵام ئەشێ کاریگەری ئەو پەرتوکانەم بەسەرەوە بێت کە رۆژێک لەرۆژەکانی منالی خوێندومنەتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا شیعرەکانی ئارسەر رامبۆ و راسین بۆدلێر ئەخوێنمەوە"

ئەگەر لەو دیدەی مۆریاکەوە بچینە سەر کاریگەری لەهونەری شێوەکاریدا، پابەند دەبین بەهەمان ئەومەفهومەی کە ئەو پەرەگرافە ئەیدات بەدەستەوە، یان بڵێین ئەشێ کۆمەڵێک دید ونیگا لەیەکەم سەیرکردنەوە ناراستەوخۆ بچێتە نەستی هونەرمەند و دوایش لە کەڤاڵێکیدا

بەئاشکرا بەدیارکەون. بەدیوێکی دیکەدا کاتێك هونەرکارێك لەبەرامبەر کەڤاڵێکی هونەریدا دەوەستێت و بەووردی تێکەڵ بەرەنگ وفیگەرەکان دەبێت، دوایش خۆشەویستیەکی بۆ دروست دەکات (بێ ئەوەی بیەوێت بکەوێتە ژێرکاریگەریەوە)، ئەوا ئەشێ ئەو سەیرکردن و تێرامانە تەکنیك و شێوازەکانی کەڤاڵەکە ناراستەوخۆ بگوازێتەوە نەستی و لەبێئاگاییدا بکەوێتە بەر ئەنگێزی کەڤاڵەکە. ئەمەیان لەلایەکەوە، لەلایەکی دیکەشەوە بەهەمان شێوەی سەرەوە ژیانی دەرەوەو ژینگەو شوێنی هونەرمەند و کۆمەڵێك روودا وفاکتەر لەژیاندا دەچێتە ئاناگایی یادەوەری هونەرمەند ودوایش لەپانایی کەڤاڵەکەدا رەنگدانەوەیان دەبێت.

ئێستا بۆ ئەوەی زێتر دوورنەکەوینەوەو رونتر قسان بکەم باراستەوخۆ باس لەو کاریگەری و رەنگدانەوەیە بکەم کە لە ئیشەکانی هێمن حەمید بوونیان هەیەو دەبینرێن، بێگومان ئەمەشیان( هەروەك لەسەرەتاوە ئاماژەم پێدا) بێگەڕانەوە بۆ مێژوو کارێکی ئەستەم ئەبێت، جا بۆیە لێرە هەوڵ ئەدەم لەپاڵ باسکردنی ئەو کاریگەریانەی کەبەسەر کەڤاڵەکانی (هێمن)هوەن ،پشت بە رابردووی هێمن خۆی ببەستم و لەوێشەوە لەکەڤاڵەکانی‌دا ئاماژەیان بۆبکەم.

" هێمن حەمید" پێش ئەوەی بخزێتە نێو دونیای شێوەکارییەوە، نزیکەی ساڵێك دەچێتە حوجرەو تەکیەکان و لەوێوە تێکەڵ بە ئاپۆرای دەروێشەکان دەبێت و دەکەوێتە نێو ئازاردانی جەستە و تقوسە(سیرمۆنیا) روحییەکانەوە، پاش ئەوەی کە لەو تقوسانە دادەبڕێت راستەوخۆ دەچێتە نێو دونیای شێوەو رەنگەوە، ئیدی ئەو حەشامەتە دەبێتە مەزنترین یۆتۆپیا ودیدی(هێمن) ودەبێتە گەورەترین بابەت لە کەڤاڵەکانیدا، ئیدی دواجار ئەستەم دەبێت خەیاڵەکانی لەو تقوسانە بباتە دەرێ و بەئاسانی ناتوانێت لەو یۆتۆپیایانە رزگاری ببێت. بۆیەش ئەو تقوسانە رەنگدانەوەیەکی گەورەیان دەبێت لەنێو کەڤاڵەکانی "هێمن"دا لەلایەکی دیکەشەوە لەسەرەتای تەمەنی هونەرییەوە خۆشەویستیەکی گەورەی بۆ ئیمپرێشنالیزم(الانطباعية) دروست دەبێت و دوایش ئەو ووربوونەوەو تێرامانە دەچێتە یادەوەری (هێمن حەمیدە)وەو، دواجار لەچەند شوێنەوە ئەو بیرەوەریانە ئەگوازرێتەوە بۆ نێو دونیای ئیشکردنی هێمن و ئەشێ لەنێو رەنگ و پانتایی کەڤاڵەکانیدا دەریانبهێنێ..

ئەمەشیان ئەوە ناگەیەنێ کە (هێمن) لە نیشەکانیدا پابەندە بەکاریگەرێتی(التاثیریة) ، یان ناگایانە کەوتبێتە ژێر کاریگەریانەوە. بەڵکو تەکنیکی رەنگ و دانانی پانتایی و رووبەرە دەچێتە بیرەوەری‌ودوایش ناناگایانە و بێ ویستی خودی خۆی لە تەکنیکیانەوە نزیك نەکەوێتەوە.. ئەشێ ئەم نزیك بوونەوەیەش لەسەربەستی رەنگ و دانان ونیشکردنی رووبەرییەوە سەرچاوەبگرێت( کە یەکێکە لەخاسییەتەکانی نیشکردنی هێمن حەمید) . دوایش لەپانتایی کەڤاڵەکانیدا بەدیارکەوێت.

(3)

"هێمن حەمید" لەو کەڤالانەیدا( کە تایبەتە بەشێوازی خۆی) بەسێ قۆناغدا گوزەر ئەکات کە لەکۆمەڵێك رەگەزدا یەك دەگرنەوە.. سەرەتا واتە قۆناغی یەکەم بەکۆکردنەوەی پارچە کاغەزی رەنگاو رەنگ و دوایش چەسپکردنیان بۆ سەر پانتاییەك، (لەشێوەی کۆلاژ) و بە ریتمێکی تایبەتەوە دەست پێدەکات. قۆناغی دووەمیش رەنگ نامێزی بە بۆیەی گواش‌و قۆناغی سێیەمیش پاستیل ولەسەر کارتۆن و بەهەمان ریتمی پێشو کۆتاییان دێت.. واتە سەرجەم کەڤاڵەکانی بۆسێ شێواز دابەش دەبن.. هەرچی بۆیەی روونی و کەل و پەلەکانی تری نیشکردنە لە نێو کەڤاڵەکانی هێمندا بوونیان نییە..( جا ئەگەر لەپەراوێزدابن یان نمایش نەکرابن ئەوەیان کاری من نییەو لێرەوە باسیان ناکەم).

ئەوەی لێرەوە شایەنی ئاماژە بۆکردنە لەهەرسێ شێوازە تەکنیکیەکانی "هێمن حەمید" کۆمەڵێك رەگەز و تایبەتمەندی هەن کە پێکەوە گرێیان ئەدات، بۆنموونە لەهەرسێ شێوازەکەدا واتە کۆلاژ، پاستیل، گواش کەلە سەر کارتۆن دەنەخشرێن، هێڵی ستونی خەسڵەتی گەورەی پانتاییەکانن، واتە لەهەرسێ شێوازدا هێڵی ستونی لەپانتایی کەڤاڵەکاندا بەئاشکرا دەبینرێن، لەلایەکی دیکەشەوە رووبەر بەشی گەورەی کەڤاڵەکە پێکئەهێنێت‌و وردەکاری لەپانتایی کەڤاڵەکەدا ون‌و فەرامۆشکراوە.

ئەگەر بەوردی لە ئەتمۆسفێری رەنگەکانی نێو کەڤاڵەکان رابمێنین دەبینین رەنگی پرتەقاڵی و سەوز "رەنگی ئۆکەریش وەکو رەنگی ناوەراستیان" دەبێتە سەرەکیترین رەنگ

لەنێوانیاندا. لەلایەکی دیکەوە زاڵ بوونی رەنگی شین و مۆر لەنێو رەنگەکانی دیکە خاسیەتێکی دیکەی کەڤاڵەکانن و تایبەتمەندی دیکە ئەدەن بە ئەتمۆسفێری ئیشەکان. نەبوونی(بۆشایی/فراغ)یش لە نێو کەڤاڵەکانی هێمن (ئەگەر هەشبێ بەکەمی شوێنێکی گرتووە) زەرورەتێکی دیکەی باسکردنن و ناتوانین وابەئاسانی بەتەکیدا تێپەرین ، ئەمەشیان دەگەرێتەوە بۆ تێکەڵکردنی دوو رەنگی جیاواز لە رووبەرێکدا. یان بەدیدێکی دیکە چارەسەرکردنی ئەو بەشە بەدانانی کۆمەڵێك رەنگی کۆنتراست بەریتم و هارمۆنیاییێکی رێك کە دواجار دەبێتە هۆی جەنجاڵ بوونی شوێنەکە، لێرەشەوە"بۆشایی" جەوهەریەتی خۆی لەدەست دەدات و جوانییەکی تری رەنگ نامێز ئەدرێت بەکەڤاڵەکە.

خاسییەتێکی دیکەی کەڤاڵەکان، کە جێگای ئاماژە بۆکردنە، زۆرجار رەنگیکاڵ ومردوو لەهەندێك بەشی نێو پانتاییەکان دەبینرێن(لە کاتێکدا ئەگەر بەیەك کوتلە وەربگرین) بەلام کاتێك وەرگر (متلقی) بەچاوەوە تێکەڵ بەباکگراوندو فۆرگراوندی کەڤاڵەکە دەکات و دەبێتە کوتلەیەکی گەورە ، واتە هەموو بەش و کوتلەکانی دیکەی کەڤاڵەکەیلەگەڵ وەردەگرین، دەبینین ئەو کوتلە رەنگییەی کە لەسەرەتادا سیفەتی مردوویێتی وەرگرتبوو، سیفەتی مردووکاڵی لەدەست دەدات و سیفەتێکی زیندوو رەنگێکی جوان بەرجەستە ئەبێ، بەشێوەیەکی دیکە ئەو کوتلە رەنگییەی کە لەسەرەتادا بەتەنیا بەمردووکاڵی دەبینرا، لەکۆتاییداو لەنێو پانتایی کەڤاڵەکەدا دەبێتە زیندوێکی گەورەو دەوڵەمەند.

(4)

پاش ئەوەی قسەمان لەسەر چەمکی کاریگەری کردو باسمان لەو کاریگەریانە کرد کە رەنگدانەوەیان لەسەر ئیشەکانی "هێمن حەمید" دا هەیە، دوایش خزاینە نێو ستاتیکاو کەمێك باسمان لەهەریەك لەو بەش و کوتلانە کرد کەبوونەتە شێوازێکی تایبەت بەئیشەکانی وقسەمان لەسەر کەرنەڤاڵی رەنگەکان کرد، ئێستا کاتی ئەوە هاتووە باس لەو ماناو بابەتانە بکەم کە لەکەڤاڵەکانی "هێمن"دا بوونیان هەیە، یان بڵێین ئەو گوزارشتانە بخەینەروو کە "هێمن" بەکۆمەڵێك هێماوە باسیان لێوە ئەکات، واتە ئەو مەفهومانە لەرەنگ و هێڵی نێو

پانتایی کەڤاڵەکانی"هێمن" بۆ وشە بگوازمەوە.. بەرهیوایەم کەمێکیش بێ لەگەڵ ماناکاندا یەکبگرمەوە.

کەڤاڵەکانی "هێمن حەمید" بە سێ شێوازدا گوزەر ئەکەن ، لەوشێوازانەشدا فۆرمێکی گوزارشتی (التعبیری) دەگرنەخۆ. بێگومان ئەو گوزارشتانەش (هەروەك لەپێشتر ئاماژەم بۆکردن) رەنگدانەوەی(انعکاس) دەوروبەرە بەسەر هێمندا. ئەمەشیان ئەوە ناگەیەنێ کە ئەوکاردانەوانە نەگۆڕن، یان بڵێین دابەزینی ناوەوەی (هێمن)ە بۆسەر پانتایی و بەس، بەڵکو منی وەرگر(متلقی) بەو مەفهومەوە وردبمەوە کە ئەو پەیوەندییە وەدۆزم کە لەنێوان هەردوو جیهانی"هێمن حەمید" هەن، جیهانی دەرەوە وەکو دەوروبەر، جیهانی ناوەوەش وەکو هەڵچون وداچوونەکانی ناوەوەی (هێمن).

"هێمن " لەو کۆمەڵە ئیشانەیدا کە بابەتەکان بابەتی جەستەو رۆحن( هەروەك لەپەرەگرافی کاریگەری باسم لێوەکردن) بۆ دوو هۆکار دەیانگێڕمەوە، یەکەمیان هەستکی خودی خۆی بەرامبەر ئەو ساتانەی کە جەستە ئازار بەخشە. دووەمیش یادەوەری.. لێرەشەوە "هێمن حەمید" دەیەوێ بڵێ لەرۆژهەلاتدا هەردەم رۆح بەکۆمەڵێك میتافیزیکاوە گرێدراوەو جەستەش هەمیشە کوتلەیەکی ئازار بەخشە، رۆژهەلات شوێنی دروستکردنی بۆشایی و پەککەوتن و نەمانی بەخشینە، غەریزە هەردەم ئەکوژرێ..تاد.

دۆزینەوەی شێواز و بابەتیش لەئیشەکانی هێمندا بۆ دوو فاکتەر دەگەرێتەوە:

1-هێزێکی گەوەری ناوەکی (خودگەرایی).

2- کاریگەری بۆ هونەری نوێ و گەڕان بەدوای داهێنان.

(یوسف عوسمان) لەکلێشەی یەکەم پێشانگای "هێمن"دا دەنوسێ ( لەم کەرنەڤاڵە نێرگسیەدا هەژموونی رەنگ لەکەڤاڵەکانیدا بەرجەستەدەکرێ، تێکەڵاوێکی لەبوارەکانی غلۆربوونەوەی تارمایی منی بالا، هیچ لەم کەڤاڵانە دنیای خەیاڵە بۆ هەڵگەڕانەوە لە کارە واقیعیەکان کە دنیایەك لەبەرانەتی هێمن سەرقاڵەی ئەو هێز و بیر و حاڵەتە دەروونییە کە ئەیدەهێنێت رەنگەکان لەکەڤاڵەکانی ئۆقرە بگرن، ناچار لەناو مەملەکەتەکەی هێمندا مەودایەك بۆ دروستبوونی رووخان ناهێڵێتەوە بەڵام متمانەو ئارامی ئەدات بەخودی هونەر).

لەلایەکی دیکەشەوە بەشی زۆری کەڤاڵەکانی هێمن فۆرمێکی ستونی دەگرنە خۆ، جاچ لەدانانی هێڵ بێت یان فیگەر یان رەنگ (هێڵی ستونیش گوزارشتە لەهێمنی و سادەیی).. ئیدی لەوێشەوە هێمن حەمید بەئارامی دەکەوێتە حونجەکردنی رەنگەکان و تەفسیری ژین بەماناکانییەوە دەخرێتە سەر رووبەر.

داروبەرد و ..فیگەرەکانی دیکەی نێو کەڤاڵە سروشتییەکان لەبنەرەتدا واهیمەن کەدواجار یەك دونیا گوزارشت ئەدەن بەدەست و یەك دونیا پرسیار جێدەهێڵن سروشت یەك دیوی هەیە، ئەویش جوانییە، ئەوجوانیانەش دواجار بەکۆمەڵێك رەنگەوە گوزارشتیان لێوەدەکرێ..لەلایەکی دیکەشەوە گوزارشتی کچەکان لەنێوکەڤاڵەکاندا گوزارشتی نامۆن.. کچەکان لەبنەرەتدا هەموویان لەیەك ئەچن و لەدەمامکەوە جیاوازن..هەروەك لەکەڤاڵی (ململانێ)دا ئەبینرێن(کە هەر پێڵاوێك دێت و پێڵاوێکی دیکە رەتدەکاتەوە، بەئەندازەیەك کەڤاڵ دەبێتە یەك پارچە پێڵاوی رەتکراوەو یەك دونیا دەمامکی نوێ).

بەم چەشنە هێمن حەمید گوزارشت لەدەرەوەی خۆی وپێناسەی ژیان ئەکات، ئیدی لەکۆتاییدا (هێمن حەمید) جگە لەرەنگ و کەڤاڵ هیچیتر ناناسێ و بێ بوونی رەنگ قسەی بۆناکرێ وبوونی نابێت.

*ئاماژەیە بۆ ئەوکەڤاڵانەی کە لەیەکەم پێشانگای تایبەتی "هێمن حەمید" نمایشکران، لەهەردوو شاری هەولێر دهۆك، سالی 2000.

*ئۆکتاڤیۆ پاز، کۆپلەیەك لەقەسیدەی(بەردی هاتاو) وەرگێڕانی لەفارسییەوە، یونس رەزایی، ژ/8ی گۆڤاری سەردەم،ل78.

سەرچاوەکان:

1-جوزرج _ا_ فلاناجان، حول الفن الحديث، ترجمةوتاليف_ كمال الملاخ، مراجعة، صلاح طاهر ،دار المعارف بمصر.

2-د. محمود امهز، الفن التشكيلي المعاصر، التصوير.

3-هربرت ريد، جوجان المصرور الاديب، الفنان ل عصر العلم ومقالات اخرى، ترجمه، فواد دواره، ص 154.

4-كبار الكتاب كيف يكتبوون، و: كاظم سعالدين.. دار الحرية للطباعة ،1986.

# رونکردنەوە

سەرەتا بەوە دەست پێدەکەین کە ئەم ژمارەیە ئەختێك لەکاتی دەرچوونی دواکەوت، ئەمەش لەبەر تەسکبوونەوەی کاتی برادەرانی دەستەی نووسەران و هەوڵدان بۆ بەجیدی کردنی پرۆژەکان کە پێویستیان بەچەندین جار گفتوگۆو هەڵسەنگاندن و بەرنامەڕێژی هەبوو بۆ سەرجەمی ئۆرگانەکانی سەنتەری نما کە گرنگی بە لێکۆڵینەوەو داهێنانی فیکریی و ئەدەبی دەدا، بەوشێوەیە وەك دەبینن لەستافی نوسیندا بەشێك لەهاوڕێیان نەماون و بەشێك جێگای کاریان گۆڕاوەو کاردابەشیەك ئەنجام دراوە، لەلایەکی دیکەوە ئەم ژمارەی گۆڤاری نما خاوەنی دۆسیێی تایبەت بەهیچ باسێك نییە بەمەبەستی پشووێیەك و، لەژمارەکانی ئایندەیدا دۆسیێی تایبەت لەسەر مەسەلە فەلسەفی و فیکرییەکان دەکاتەوە، بەیەکجاریش گۆڤارەکە ئەخاتە بازنە فیکر و فەلسەفەوەو لایەنە ئەدەبی و هەوڵەکانی ئەو بوارە دەبەخشێتەوە بەگۆڤاری (شیعرنما) کە زیاتر گرنگی بە ئەدەب دەدا، جا چ لێکۆڵینەوە یان دەقی ئەدەبی بێت. بەمشێوەیە لەگەڕی دووەمی کارەکانیدا سەنتەری نما بەشێوەو گۆڕانێکی ئیجابی کە بەو هیوایەین خوێنەران هەستی پێبکەن بەردەوام دەبێت بەنیازە دەروازەکانیان والآتر بکات.

# هانا ئارێنت: نەریتی شاراوە

ن: رامین جیهانبەگلو

و: موراد حەکیم مزووری

**نزیکەی** چل ساڵ لەمەوبەر ، ریمون ئارۆن لە گۆڤاری (critiqur )ی چاپی 1954دا، بەرهەمەکانی (هانا ئارێنت)ی بەنێوەندی رۆشنبیری فەرەنسی ناساند.بەڵام چەندین ساڵ تێپەڕین تاوەکو شوێنی خۆی لە وتووێژە رۆشنبیرییەکانی فەرەنسادا بینیەوە. لەدەسانی رابردوودا شایەدی وەرگێ... ...ەوە جۆراوجۆرەکانی ئەوین لە نوسینەکانی ئارێنت و ئێستاش بەبڵاوبوونەوەی کۆمە... ...دیەکی ئەم نووسەرە لەژێر ناوێکی سەرنج راکێشی وەك(نەریتی شاراوە) (la tradition cachee ) بەرهەمە فەرەنسییەکانی ئارێنت دەوڵەمەندتر بوون.

ئامانجی سەرەکی (هانا.) لەم کتێبەدا گێڕانەوەی جەوهەری یادەوەری یەهودییەکانە لەبەرانبەر مێژوو وراستەقینەیی لە پیوەندیاندا بەستراتیژییەتی ئامێری تۆتالیتاری نازییەوە. بۆ ئەم مەبەستە ئارێنت بەلێکۆڵینەوە لە ژیان و بەرهەمی چەند ئەوەیەکی زانا یەهودییەکان ئەوە بەدەربەخات کە بەچ شێوەیەك لەنێوانچارەنووسی سامناکی خۆیان وەکو پاریا( paria) و ئەزموونی ئەم وەزاوی " ئارەزووی رزگار بوون" یاخود" بەدەستهێنانی یەکسانی بوون لەشوناسدا" لەگەڵ کۆمەڵگای رۆژئاوادا سەرگەردانن. هانا ئارێنت بەسەرنجدان لە نەریت (ترادسیۆن) ئەو یەهودییانەی کە کاریگەرن بەسەردەمی رۆشنگەری، لەئەزموونی ئاوارەکانی قوربانی نازیزم جیادەکاتەوە کە گرفتاری گەشبینییەکی پوچەڵ ببوون و پێویستیان بە ئازایەتی ... ئە بۆ هەموارکردنی باردۆخی کۆمەڵایەتی و مافیان

خەبات بکەن.دیدی مێژوویی ئارێنت ناچارمان دەکات بگەڕێینەوە بۆ ئەو بیرۆکەیەی کە بەچ شێوەیەک" لەناوچوونی جیهانیانەی ئەو یەهودییە سەرگەردانانەی وەك هەموو گەلە پاریاکان، هاوبەندییەکی تایبەتی لە نێوان هەموو ئەندامەکانیاندا هێنایەکایەوە." بەم شێوەیە هانا ئارێنت بەروانینی لە ئەزموونی تاکە کەسی خۆی وەك نموونەی یەهودییەکی ئاوارە" بۆ دۆزینەوەی جەوهەری مرۆڤایەتی مرۆڤ وژیان، کەسایەتی خۆی دەخاتە بەرانبەر مەترسی فەزای گشتی" لێرەشەوە بەخستنەرووی لێکۆڵینەوە لە چارەنووسی تراژیدیای پاریا، دەستپێدەکات. بۆ ئەم مەبەستەش بەتوندی کەوتە دژایەتیکردنی خەیاڵچنی یەهودییەکان ، کە لەمێشکیاندا پەرە بە بیرۆکەی ئازادی پاریا دەدەن." بە بڕوای ئارێنت ئەم تێگەیشتنە"بێ مانا وبێ ئامانج بوو، چونکە پەرۆشی مرۆیی لە بەئەنجام گەیاندنی مەبەست و ئامانجێك لەم جیهانە فانییەدا بێبەرپرسیاریەتی لەبەرانبەر ژیان، نابینا دەردەخات". لەگەڵ ئەوەشدا ڕەخنەگرتن لە تێگەیشتنی مێژوویی یەهودییەکان بەو مانایە نییە کە مەبەستی بێ ئەم مێژووە لەئاستی ڕووداوە پەراگەندەو داماڵراوەکان لەهەر جۆرە مانایەکی کەلتووری وسیاسی بهێنێتە خوارەوە. بەپێچەوانەوە ئەو لەپشتی هەر فەردانیتیکی مێژوویدا بەدوای" یادەوەری نەتەوەیەکدا بۆ سەردەمێکی کۆن دەگەڕێتەوەو پابەندە بە پرەنسیپ و نەریتەکانی خۆی" و بۆی دەگەڕێت.بەڵام پێویست بە وەبیر هێنانەوەیە کە ناتوانین سەرنج لە توێژینەوەی هانا ئاێنت بەشێوازی مێژوونووسی ستایشی زێدەڕۆییانە دەربارەی نەتەوەی یەهود بدەین.(هانس جۆناس) فەیلەسوفی بەناوبانگی ئەڵمانی و نووسەری کتێبی(ئەسڵی بەرپرسیارێتی).لەبارەی هانا ئارێنت دەنووسێت:" هانا بووە هۆی بەرزکردنەوەی ئاستی باس و گفتوگۆ لەبواری تیۆری سیاسیدا و شێوە لێکۆڵینەوەکەشی لەمەڕ ئایدیا و چەمکەکان بەسەر نێوەندی ڕۆشنبیریدا سەپاند". ئەتوانین ئەو شێوە لێکۆڵینەوە ڕەخنەییەی ئارێنت لەوەڵامێکدا ببینین کە ئەو سەبارەت بەدادگایکردنی(ئاشمن) لەنۆرشەلیم و بەگرشوم شولمیدای و هانا لەوەڵامی شولمدا پشتیوانی نەکردنی ئەو لەنەتەوەی یەهودی بەتوندی دەخاتە ژێر ڕەخنەو دەنووسێت:" من هەرگیز لەژیانمدا نەتەوەیەك یاخود کۆمەڵە خەڵکێکم خۆشنەویستووە، ئێستا چ ئەڵمانییەکان بن، چ

فەرەنسییەکان، چ پرۆلیتارەکان و ... تاد لەراستیدا من تەنها برادەرەکانم خۆشدەوێن و لەتوانام دانییە بەجۆرێکی دیکە مەیلم دەبخەم. هەروەها لەوێوە کەمن یەهودیم ، خوشویستنی یەهودییەکان بە بۆچوونی من کارێکە گومانی تێدایە. من خۆم و هەموو ئەوەی کە جەوهەری ئێمەی یەهودییەکان پێکدێنێت خۆشم ناوێن.. بەلآم تەنیا لەبوارێکدا لەگەڵتان تەبام، ئەو نادادپەروەرییانەی کە بەهۆی نەتەوەکەمەوە شێوە دەگرن زیاتر لەو نادادپەروەرییانەی کە بەهۆی نەتەوەکانیتر ئەنجام دەدرێن ئازارم دەدەن." کۆی وێستگەکانی دیدی ئارێنتیش ئەوەیە کە مانای مێژووی یەهودییە پاریاکان بەشێوەیەکی جیاو تەنها لەبەرچاو ناگرێت، بەڵکو لەنێو مێژوویەکی فراوانتردا واتا لەمێژووی غەیرە یەهودی رۆژئاواییدا شەن و کەوی دەکات. بەم شێوەیە بەنیشاندانی نەزموونە هەمە جۆرەکانی ئەم نەتەوەیەلە بەشدار بوونیان لە مێژووی ئەوروپا سەرنجی خوێنەر بۆ راستی دەردناکی ئەم( لەجیهاندەرکردنە)ی پاریای کۆمەلآیەتی یەهودی رادەکێشێت.کەواتە هانا ئارێنت بۆ زیاتر روونکردنەوەی ئەو دیاردەیە (فینۆمینۆ)یە، روخسارە مێژوویەکانی نوکیسگان و پاریاکان بەیەکەوە هەڵدەسەنگێنێ وجیاوازییەکانی نێوانیان نیشان دەدات. بەبۆچوونی ئارێنت(دیاردەی نوکیسەی کۆمەلآیەتی، بەرهەمی سەدەی نۆزدەیەمی ئەوروپایە، بەهەمان شێوە کە پاریای سیاسی لەرووخسارە تەوەرییەکانی سەدەی بیستەمە." ئارێنت بەروونی ئەوە دەردەخات کە چ جۆرە رێکخراوێکی کۆمەلآیەتی پێویستی بەبوونی نوکیسگانی سەدەی نۆزدەیەمە.( بۆنموونە یەهودییە دەربارییەکان) کە" لەمێژووی یەهودیدا لەسیمای پاریاکان زیاتر دیارن." لەوانەیە پێویستی بە وەبیر هێنانەوە نەبێت کە بەگوتەی ئارێنت"مێژووی یەهودییە مۆدێرنەکان کە یەهودییە دەربارو ملیۆنێرەکان و یەهودییە خێرخوازەکان دەستی پێکردووە، ئاراستەیەکی تری لەم نەریتەدا بەفەرامۆشی سپاردووە کە نوێنەرەکانی ئەو خەڵکانی وەك" هایرنش هاین و راهل وارنهاگن، شولم ئالاشیم، بێرنار لازار و فرانتس کافکا، یاخود تەنانەت چارلی چاپن .. بوون"ئارێنت دەڵێت ئەم تاکانە ناسێنەری نەریتی کەمایەتییەکی یەهودییەکانن کە بەروو وەرگێران لەنوکیسەگان پایەی( پاریایە هوشیارەکان)یان پەسندکرد. بەبۆچوونی ئارێنت هەموو ئەو

شایستەییانەی کە بەسیمایان دەزانن وەك میهرەبانی ، مرۆڤدۆستی، گاڵتەجاڕیو هۆشمەندی بەبێ دوو دڵی بەشێکن لەخەسڵەتی پاریاکان. بەپێچەوانەی هەموو کەم و کورتییەکانی تری یەهودییەکان وەك بێ ئەدەبی، نەزانی‌سیاسی، گرێی سووکاسەتی، کەم و کورتی هەموویان خەسڵەتی نوکیسەگانن. بوێرانە دەتوانین بڵێین کە رەسەنایەتی و وردی لێکۆڵینەوەی ئارێنت لەمێژووی یەهود، سەرنجی تایبەتی خۆیەتی لەکاروباری گشتیو دژاەتییە لەگەڵ ئەزموونی تاکەکەسی رزگاربوون؛ چونکە بەگوتەی ئەو" خەمبارترین رەگەزی مێژووی یەهود لەم خاڵدا شاراوەیە کە تەنیا دوژمنەکانی، نەك دۆستەکانی ئەم شتەیان زانیوە کە مەسەلەی یەهودییەکان مەسەلەیەکی سیاسییە". بێگومان بەزیاد لەپێویست جەختکردنە سەر لایەنی سیاسی ترسی ئەوەی هەیە کە گرنگییەکی کەم بە بەهای فەلسەفی و فیکری لێکۆڵینەوەی ئارێنت بدرێت. بەڵام لەوێوە مەبەستی ئێمە لەنووسینی ئەم وتارە داواکردنە لەخوێنەران بۆ خوێندنەوەی بەرهەمەکانی ئارێنتو، تەسەور دەکەین کە ئاشنایی لەگەڵ کتێبی (ئەریتی شاراوە) ببێتە هۆی ئەوەی کە جارێکی تر ئەوانەی بەرهەمەکانی هانا ئارێنتیان خۆش دەوێت تایبەتمەندی ئەم نووسەرە دووبارە نیشاندانەوەی رووداوە مێژووییەکان لەرەهەندی فەلسەفیدا بدۆزنەوە.

سەرچاوە: مۆدێرنێتە، دیموکراسی و رۆشنفکران
رامین جیهان بەگلو ، لا 130-133 .

# خۆشەویستی ئەوکاتە دێت کەخۆی دەیەوێ
# ژنو.. ژیانی بلیمەتەکان

ن: هاشم سالح

و: رەوشت رەشید

**بەم دواییانە** لەپاریس کتێبێك دەرچوو باسی رۆڵی ئافرەت دەکات لەجولاندنی پرۆسەی ئەفراندن لەلای پیاوی داهێنەر، بەتایبەتیش لەلای پیاوە بلیمەتەکان.

دەکرێ بگوترێت کە بلیمەتەکان دوو جۆر هەڵوێستیان هەیە لەئاست ژناندا، یان هەڵویستی گرنگی پێدانی زیاد لە پێویست، یانیش هەڵوێستی پشتگوێخستنی زیاد لە پێویست، واتە بلیمەتەکان هەمیشە بەپێچەوانەی خەڵکی ئاسایی زیادەڕۆیی دەکەن لە هەڵوێست نواندنیاندا. ئەگەر سەیری ژیانی گەورە فەیلەسوفانی وەك دیکارت یان کانت بکەین، دەبینین ئافرەت رۆڵێکی وا نابینێت کە جێگەی باسکردن بێت. دیکارت ژنێکی ساوێلکەی هێنابوو کە لە کارەکەر دەچوو، هیچ رۆڵێکیشی لەژیانی گشتی دیکارت "واتەژیانە فیکرییەکە"ی نەبینی.

هەرچی جان جاك رۆسۆشە ئەوا بەدرێژایی ژیانی لەگەڵ ئافرەتێك ژیا کە خۆشی نەدەویست، ئافرەتێکی خۆشویست کە تاکە رۆژێکیش لەگەڵیا نەژیا، بگرە دەستیشی پێنەکەوت. بەڵام ئەمانوئێل کانت، لەبارەیەوە نەزانراوە کە هیچ پەیوەندییەکی لەگەڵ هیچ ئافرەتێکدا هەبووبێت، بەجۆرێك ژیانی دوورو درێژی خۆی خستە خزمەت بەرجەستەکردنی

ئەو فەلسەفەیەی کە بەدرێژایی دووسەد ساڵو تا ئێستاش زاڵ بوو بەسەر عەقڵی ڕۆژئاوایی.

دەگێرنەوە کانت خوازبێنی ئافرەتێکی کرد، بەڵام دوایی بەهۆی سەرقاڵ بوونی بە نووسینی یەکێك لە کتێبە گرنگەکانی ئافرەتەکەی بیرچووبوەوە، کاتێکیش بیری هاتەوەو ویستی بۆی بگەڕێتەوە ،ژنە چەند لەمێژ بوو شووی کردبوو، یەك دوو منداڵیشی هەبوون.

کاتێکیش بەساڵاچوو لەچل و پەنجا ڕەتی کردو ناوبانگی دەرکرد، یەکێك لەو شتانەی کە زۆر تەریقی دەکردەوەو تووشی ئیحراجی بوونی دەکرد ئەو پرسیارە بوو"مامۆستا کانت بۆچی ژنت نەهێناوە؟" ئەویش هەمیشە بەم شێوەیە وەڵامی دەدایەوە، : کاتێك کە لاو بووم هەژار بووم‌و نەمدەتوانی ئەرك وپێداویستی‌یەکانی خێزان لەئەستۆبگرم. کاتێکیش بەناوبانگ بوومو دەسەڵاتی ئەوەم پەیداکرد کە ژن بهێنم، ئەوا چیدی هەوەسی ئافرەتانم نەمابوو، چونکەپیر ببوومو شەمەندەفەر جێی هێشتبوم. هەرچی شاعیرو هونەرمەندان و پەیوەندییەکانیشیانە بەئافرەتانەوە ئەوا بارێکی دیکەیە. دیکەوە.. چونکە لە ڕاستیدا دەگمەن ژیانی شاعیرێك دەبینیت کە خاڵی بێت لە خۆشەویستیەکی توندو عەشقێکی شێتانە، زۆر جاریش ئەو خۆشەویستییە ڕۆڵێکی گەورە دەبینێت لە ئیلامی شاعیرو کرانەوەو تەقینەوەی بلیمەتی و کپی شاعیر. لێرەدا چیرۆکی ریلکەو ئەو کچە شۆخە ڕووسیە"لواندەر یاسالومی" بەنموونە دەهێنینەوە، کە پێشتر هەمان کچ ئەندێشەی (نیچە)ی داگیر کردبوو. ریلکە کاتێك تەمەنی 20 ساڵان بوو سالۆمی ناسی و ئەمیشیان کامڵە ژنێکی چل ساڵان بوو، کە دواتر ببوە هۆی ئەوەی گرێ دەروونیەکانی ریلکە بکاتەوەو وەکو ئاگر بلیمەتی ئەو پیاوە دابگیرسێنێ .

هەروەها چیرۆکی (ئەلفرێد دومۆسێ)مان هەیە لەگەڵ ئەو کچە نووسەرە بەناوبانگەو سەربەستەی کە ناوێکی پیاوانەی بۆخۆی دانابوو: جۆرج ساند، دومۆسێ ئەو کچەی زۆر خۆشدەویست ،کچە لەسەرەتا ئەمی خۆشویست، بەڵام زۆری نەبرد دومۆسێی جێهێشت و ڕووی کردە پیاوێکی دی، بەمەش ئاگری بەردایە ناخی دۆمۆسێی شاعیر، دومۆسێ بەدرێژایی ئەو شەوانە چاوەڕێی ئەو کچەی دەکرد تا ئەو دەمەی کچە لەشەوە سوورەکانی

تەواو دەبوو و نزیك بەرەبەیان دەگەڕایەوە، دوموسێش شەونخونی بۆدەکرد و جوانترین قەسیدەی لەشیعری رۆمانسی سەدەی(19)ەیەمی بۆ نووسی کەنا وی(شەوانی موسن)یە، بەم جۆرە ئازاری خۆشەویستی بەسوودە بۆ هونەرمەندو، بلیمەتەکان دەتەقێنێتەوە. بگرە زۆرجار سەرکەوتن لەخۆشەویستی لەوانەیە مەترسی بێت بۆ سەر ئەفراندن، دەکرێ درێژە بەم بابەتە دڵگیرە بدەین و زیاتر قسەی لەسەر بکەین، بەڵام با تۆزێك لەبەردەم ئەم کتێبە نوێیە بوەستین کە نووسەرەکانی دوو کەسن نەك یەك. یەکەمیان مێژوونووس و رۆماننوسێکی فەرەنسییەو دوومیشیان نووسەر و دیبلۆماتێکی رووسییەو بەیەکەوە کتێبێکی گرنگیان دەربارەی ئەو کچە رووسییە جوانانە کۆکردۆتەوە کە دوای شۆرشی بەلشەفیك و پێش ئەو شۆرشەش بۆ گەڕان بەدوای ئارامی و ئاسایش ودواتریش بۆ گەڕان بەدوای خۆشەویستی و ناوبانگ و بلیمەتیان رووەو فەرەنسا کۆچیان کردبوو.

دوای روخانی شیوعیەت، ئەرشیفی رووسیەکان لەبەردەم ئەم دوو نووسەرەدا والاکراو، بگرە توانیان بگەنە ئەرشیفەکانی(ك.خ.ب) لەو ماوەیەدا، کە پڕ بوو لە زانیاری دەربارەی زۆر لە کەسایەتیەکان لە هونەرمەند ونووسەر و شاعیر و فەیلەسوفان لەگەڵ کچە نەشمیل و دڵرفێن و سەرنج راکێشەکانی رووس، بەجۆرێك هەندێك لەو کچە قەشەنگانە رۆڵێکی سیاسی و بگرە "سیخوریشیان" بۆ بەرژەوەندی دەزگا روسیەکان دەبینی.

بۆکەس نێهنی نییە کە (ئیلیزا) عەقڵ و دڵی (ئەراگۆن)ی داگیرکردبوو،(سیبیت)یش لەلایەن نێوەندە فەرەنسییەکانەوە بەوە تاوانبار کرابوو کە بەکرێگیراوێکی روسیاییە، لەراستیشدا ئەو مێردی خۆ خستنە نێو حیزبی شیوعی و هەر خۆیشی وایلێکرد پەیوەندیکردنی بە سەربازگەی رووسی ئاشکرابکات لەسایەی جۆزێف ستالین. بەڵێ خۆشەویستی چاوەکان نابیناو، گوێیەکان کەڕ دەکات؟!! ئەوەی سەرنجی هەردوو نووسەری ئەم کتێبەی راکێشا ئەوەبوو کەوا زۆربەی بلیمەتە فەرەنسییەکان لەسەرەتای ئەم سەدەیەدا لەرووی سۆزدارییەوە پەیوەندیدار بوون بە ئافرەتە رووسیاییەکانەوە. بۆنموونە ئۆلغا کە شووی بە پیکاسۆ کرد و (گالا) کە (ئیلیوار)ی خۆشویست پێش ئەوەی بکەوێتە تۆڕی سلفادۆر دالییەوە.

هەروەها (ئیلیزا) و(ئاراگۆن) هەن کە دیوانە بەناوبانگەکەی بەناوی (شێتی ئیلیزا) لەسەر نوسی و چیرۆکی خۆشەویستیان لە نێوەندە ئەدەبیەکان بەرادەیەك ناوبانگی دەرکرد کە دەکرێ بەراورد بکرێ بەچیرۆکی(مەجنون لەیلا) لە ئەدەبی عەرەبیدا.هەروەها "لیدا" هەیە کە هونەرمەندی ناودار" ماتیسیس"ی پەرێشانکرد.

هەروەها (مایا)ش کەدڵی(رۆمان رۆلان)ی بەرێدابردبوو، بەجۆرێك رۆلان نەچووە ژێر باری پێشکەشکردنی گوێڕایەڵی و ستایشکردن بۆ ستالین. هەروەها پێویستە رێبەری ئێگسیستانیالیزمی(وجودیوتی) فەرەنسی"جان پۆل سارتەر" لەبیر نەکەین، چونکە ئەبەردی زۆری دەبوو، لەوانە چیرۆکێکی خۆشەویستی کپکراو یان نیمچە نهێنی لەگەڵ جوانێکی روسیدا بەناوی: لینا زوینان دەبوو، هەر بۆ ئەویش کتێبی بەناوبانگی"وشەکان"ی پێشکەشکردووە کە بەشێوەی گێڕانەوەی ژیانی خۆیەتی، بەڵام لەپێشکەشکردنەکەدا تەنها ئاماژەی بە پیتی یەکەمی ناوی کچەکە کردووە، لەترسی ئەوەی نەکا تووڕەیی (سیمۆن دووبۆڤوار)ی بەسەردا ببارێ. هەربۆیە لە پێشکەشکردنە کورت و تەماوییەکەی گوتویەتی"بۆ خاتوو ..ز.." رەخنەگر و کۆمێنتسازەکان زۆر بەدوای راڤەکردنی ئەم پیتە بوون بۆ ئەوەی بزانن ئەم(ز)یە، چیی دەگەیەنێت بەڵام نەگەیشتنە هیچ ئەنجامێك، بەجۆرێك سارتەر سەرکەوتوو بوو لە پاراستنی نهێنی پەیوەندییەکەی و، لەگەڵ خۆشەویستەکەی تەنها لەکەنارەکانی رووباری بەلتیك نەبێ بەیەك نەدەگەیشتن، یانیش لەگۆشەو سوچەکانی پایتەختی سۆڤییەت کە جارجارە دەچووە سەردانی مۆسکۆ و یاوەری یەکتریان دەکرد، وەك ئەوەی هیچ رووینەدابێ..بالێرەدا بەدرێژی لەسەر دوو پەیوەندی بوەستین:یەکەمیان پەیوەندی (گالا) بە(پۆل ئیلیوار) و دواتریش بەسیلڤادۆر دالی و، دوومیشیان پەیوەندی (ئیلیزا) بە( ئاراگۆن).

کاتێك گالا لەساڵی 1918 گەیشتە پاریس بۆ ئەوەی شو بە پۆل ئیلیوار بکات و تاهەتایە لەفەرەنسادا بگیرسێتەوە، وڵات تازە لەشەرێکی وێرانکار هاتبووە دەرێ.

ئيليوار خۆيشى لەشەڕەكەدا بەشداربوو، هەر بەجلى سەربازييشەوە هاتە كلێسا بۆ ئەوەى ئەو كچە رووسياييە مارە بكات كە خۆشيدەويست. بەلام وەكو سەرجەم نەوەكانى سەردەمى خۆى شەڕى جەرگبڕ دەروونى وێرانكردبوو.

بەدەگمەن ماڵێكى فەرەنسيت دەدۆزييەوە كە كوژراو يان بێسەرو شوێنێك يان بريندارێكيان نەبێت و دەكرێ بگوترێ بزوتنەوەى سورياڵى فەرەنسى كە (ئەندرێى بريتۆن) رابەرايەتى دەكرد شتێك نەبوو جگە لە كاردانەوەيەكى ئەو شەڕەو مەرگەساتەكانى.

گەنجانى فەرەنسا ئەوكاتە دەيانويست دڵنەوايى خۆيان بدەنەوە، هەناسە بدەن و، مەرگەساتەكانى شەڕو ئەو كاردساتانە لەبير بكەن كە لەگۆڕەپانەكانى شەڕدا بينيبويان، بۆيە هيچ رێگايەكيان لەبەردەم خۆياندا نەدەدۆزييەوە جگە لەپڕژانە نێو بزوتنەوەيەكى هونەرى سورياڵى ئازاديخواز.

سورياليزم ئەو بوارەى بۆ هونەرمەند رەخساند" شاعير، يان ئەديب، يان رۆماننوس..تاد" كە تۆزێك خۆى لەبير بچێتەوە، نوقمى خەون وخەياڵات ببێت و لەواقيعەوە بەرزبێتەوە بۆ سەرووى واقيع" كە ئەمەماناى حەرفى وشەى سورياليية" . سورياليزم پێويستيەكى مێژوويى جێبەجێ كرد چونكە لەكاتى گونجاودا هات و يارمەتى داهێنەرە فەرەنساييەكانيدا كە رزگاريان ببێت لەو رق و كينەو تورەهاتييەى كە فشارى دەخستنەسەر، لە دۆزەخى ئەو واقيعەى كە رەحم بەكەس ناكات. بەم جۆرە رێگەياندا بە وزەو تواناكانيان، بتەقێتەوەو بەهەموو ئاراستەكان و چۆن حەز دەكات ئاوا گوزەربكات. هەروەها رێگەيان بەزماندا كە لەكۆت و زنجيرەكانى ئازاد بێت، واتە لە مانا قاموسيى و شەرعيەكان، بۆئەوەى ماناى ديكە وەربگرێت و قۆزاخەكانى بشكێنێت. بواريان بەزماندا كە سنورى خۆى ببڕێت و گوزارشت نەوەك هەر لەمانا بەڵكو لە بێمانايى و، پوچى و نامەعقوڵيش بكات. ئەوان بينيان كە واقيعيەتى راست ئەوەيە كە ناواقيعى بيت! ئايا شەڕ واقيعى يان ماقوڵ يان خاوەنى هيچ مانايەكە؟ ئايا دەكرێ بەزمانێكى لۆژيكيانەى، فەرهەنگيانەى موحافيزكار گوزارشت لە عەبەسيەتى شەڕ بكرێت؟

ئایا پێویست نییە لەسەر هونەر کە گوزارشت لەشێتێتی واقیع بکات بەزمانێکی لەخۆی شێتتر؟ هەر لێرەوە مەسەلەی تەقینەوەی زمان سەری هەڵدا، کە لەشەستەکاندا گواسترایەوە نێو پانتاییەکانی شیعری عەرەبی هاوچەرخ.

ئەوانە هەندێك لەهۆو پاڵنەرە قوڵەکانی سەرهەڵدانی بزوتنەوەی سوریالیزم بوون، لەسەرەتاکانی ئەم سەدەیەدا"سەدەی بیستەم". پاشانیش فراوان بلاوبوەوە بۆ ئەوەی ببێتە بزوتنەوەیەکی هونەری بەقەبارەی دونیا، وەك هەموو بزوتنەوە رەسەنەکانی دی کە لەپایتەختی روناکی و ئازادی :( پاریس) سەریان هەڵدا.

بەلام دواتر سوریالیزم لەمامەڵەو گوزارشتکردنیدا زیادەرۆیی کرد تاوەکو لەسەر دەستی هەندێك لەشوێنکەوتووە بچووکەکانی ، ئەوانەی هیچ داهێنانێکیان نەبوو گەیشتە ئاستێك لە ئابڕوچوون و وڕێنەبازی. بەهەرحاڵ"گالا" دونیای پۆل ئیلیواری داگیرکردبوو، ئیلیوار ئەم چەند دێرەی لەچامەیەکیدا بەناوی" گۆرانیەك بۆ گالا" نوسیبوو:

لەژیانم کەسم خۆشنەویتووە جگە لە گالا ..و
ئەگەر ئافرەتانی دیکە هەموویان رەتکەمەوە،
ئەوا بۆتۆ دووپات دەکەمەوە کە لەدونیا ئافرەتێکم نەدۆزییەوە
جگە لەگالا
کە مەیلێکی کەم بۆ ژیان و
مەیلێکی زۆر بۆ مردن ئەدات..

بەم شێوەیە ئیلیوار وگالا چوونە ناو بازنەی سوریالیستەکان و چوونە ریزی ئەندێی بریتۆن و لویس ئاراگۆن و فیلیپ سوبول و رینێە شار و ئەوانەی دی.

ئیدی بزوتنەوەی سوریالیزم، پێشەنگی داهێنانی رۆشنبیریی ئەوکاتی لە فەرەنسا پێك هێنا، ئەو پێشەنگەی دەیەوێت ژیان بگۆڕێت. ئەندرێی بریتۆنیش وەکو سەرۆکی بزوتنەوە یان رابەری عەسابەیەك هەڵس و کەوتی دەکرد و گەرەکی "ئەلمۆنبارناسی" لەپاریس

بهەموو قاوەخانەکانیەوە کربىوو بە پایتەختێك بۆ ئەو بزوتنەوەیەی کە دەیەوێت جیهان ببڕێت.

بەڵام گالا لە گۆڕان وهەڵچون و داچرون و شێتییە سوریالییەکەی ئیلیوار ماندوو ببوو، لەوەش گرنگتر ، خۆشەویستی بۆ خۆی ماندوو ببوو، مەلەل گرتی، چونکە خۆشەویستی لەسەرەتاوە وەکو گەردەلول بەهێز دەست پێدەکات، پاشان بەتێپەربوونی رۆژ و ساڵەکان هێدی هێدی هێور دبێتەوەو بەرەولاوازی دەچێت، هەر خۆشەویستیەك بگاتە ئەنجامێکی پوزەتیڤ و حوکمی بەرەو نەمان بۆ خۆی دەر دەکات. ئەمە سوننەتی ژیان و سروشتی شتەکانە.

بەتەنها دووری و بێبەشی والەکات خۆشەویستی پتەوو بەهێز بێت و بەریەرەکانی "رکابەرێتی" زەمەن بکات. بەڵام بەیەك گەیشتن، بەتایبەتیش لەگەڵ یەکتر ژیانی هاوبەشی بەردەوام، دەبێتە هۆی دامرکانەوەی کڵپەی خۆشەویستی و کوژانەوەی خۆشەویستی، یان بڵێین هەڵوەرینی خۆشەویستی. بەداخەوە کە دەکرێ بڵێین خۆشەویستی وەکو گوڵە جوانەکان وایە، وەك چۆن گوڵەکان دەوەرن ئەویش هەڵدەوەرێ. بەم جۆرە دوای چەندین ساڵ خۆشەویستی و نزیکی و دواتر تۆران، پەیوەندی نێوان گالاو ئیلیوار کۆتایی هات. ئیدی کچە نەشمیلی روسیایی لەناخیدا بەدوای پەیوەندییەکی تازەدا دەگەڕا، یان بڵێین بلیمەتێکی تازە، ئەوەبوو کەسێکی دیکەی کە شێتی و بلیمەتیکەی ئەگەر زیاتر نەبێت کەمتر نەبوو لە هی ئیلیوار دۆزییەوە، ئەویش سیلڤادۆر دالی بوو. بەڵام ئەوکات دالی ، ئەو دالیە ناودارە نەبوو کە ئێمە دەیناسین، بەڵکو گەنجێکی خەیاڵاوی بوو کە تەمەنی لە 25 ساڵ زیاتر نەبوو، ئەو هاتبووە پاریس بۆ گەڕان بەدوای ئیلهام و ناوبانگ و دەوڵەمەندی. چونکە کوڕێکی هەژاربوو، وەك هاوڕێکانی دەیانگوت لەدووری سەدان کیلۆ مەتر بۆنی هەژاری لێدەهات. گەنجێکی ئیسپانی بوو بەدرێژایی ویانی شەقامەکانی پاریس دەسوڕایەوەو شتێك لەگیرفانەکانیدا نەبوو، جگە لەبلیمەتیە کپ بووەکەی.. گالا هات بۆئەوەی بیلەرزێنێ و بروسکەی بلیمەتی تێدا دەربخات.

کاتێك دەربارەی هۆی هەڵبژاردنی گەنجێکی هەژار پرسیاریان لەگالای نەشمیلکرد، لەوەڵامدا وتی: " چونکە یەکسەر درکی ئەوەم کرد کە دالی بلیمەتە" گالا وەکو کچانی دیکەی رووسی کچێکی بەتەماح بوون ،بەدوای ناوبانگ و بلیمەتی دەگەڕا ، ئەو بەتەنها لەترسی شەڕی ناوخۆ وشۆڕشی بەلشەفیك وڵات و خێزانی خۆی جێنەهێشتبوو، بەڵکو بۆ دووپاتکردنەوەی خودێتی خۆی و ، کردنی شتێکی گەورەی وەهابوو کە قەرەبووی لەدەستدانی وڵات و کەس و کار و خۆشەویستیان بکاتەوە. بەم جۆرە گالا بەدرێژایی ساڵانی پڕ لەزەحمەتی یاوەری دالی کرد، ساڵانی بێبەشی و هەوڵی گەیشتن، گالا کاری بۆ ئەوە کرد دالی بخاتە نێو کۆمەڵی سوریالیەکانو هەموو هەوڵێکی بەخشی بۆرازی کردنی بریتۆن.

بەم شێوەیە چووە ریزی سوریالیەکانو شاکارە یەکەمینەکانی خۆی پێشکەش کرد، شان بەشانی دەرهێنەرێکی سینەمایی بەناوبانگی بەرەچەڵەك ئیسپانی کە ئەویش "بۆنویل"بوو.

هێدی هێدی دالی لەترسی درێژخایەنی لەهەژاری دەهاتە دەردوەو تا دواتر ناوبانگی دەرکرد و، هێشتا تەمەنی لە 35 ساڵی رەتی نەکردبوو، بوو بەیەکێك لە دەوڵەمەندترین هونەرمەندانی دونیا . کەڵالەکانی‌دالی بەسەدان هەزار لەپارە لەپاریس و نیۆیۆرك و پایتەختەکانی دیکەی دونیا دەفرۆشان. بەڵام کاتێك دالی گەیشتە ئەوەی دەیەویست ئیدی زیادەرۆیی لەشێتی خۆیکردوو، گەیشتە ئاستێك کە ستایشی هیتلەر و فرانکۆ بکات. لەو کاتەشدا لەلایەن (بریتۆن)ەوە بەخراپترین شێوە لە نێو ریزەکانی سوریالیستەکان دەرکرا.

## ئاراگۆن لەچاوانی ئێلیزالدا

کەی یەکەم جار ئاراگۆن ئێلیزای بینی؟ یان چاکترە بڵێین کەی ئێلیزا ئاراگۆنی بینی؟ چونکە ئێلیزا بەدوای ئەودا دەگەڕا،دەیەویست و، شوێن پێی هەڵدەگرت.

ئەراگۆن ئەوکات لەهەرەتی لاوی‌و لوتکەی شاعیریەتی دابوو، ئەو شای شاعیران بوو، کوڕێکی درێژ و جوان ، ئافرەتان لەهەموو جۆرو دەنگێك بەسەریدا دەباریین‌و بۆ ئەو کچە ئەشمیلە روسیاییەش ئاسان ئەبوو ئەو هەموو ریزانە بیڕێت‌و بگاتە ئاراگۆن و دڵی داگیر بکات. جگە لەمە ئەراگۆن تازە لەچیرۆکێکی گەورەی خۆشەویستی هاتبووە دەرێ ئەویش

لەگەڵ خانمێکی ئەمریکیدا کەناوی: نانسی کۆنار بوو. خۆشەویستی پێشووش بەئاسانی لەدڵ دەرناچێت، ماوەی دوای خۆشەویستیش لەوانەیە درێژخایەن بێت یان کورت خایەن، زۆرجاریش لـەدوای خـۆی ئەشتەروبرینی وا جێدەهێڵێـت کـە سـارێژبوونی ئاسـان نییـە. خۆشەویـستی مـەزن دەگمەنـەو باجەکەشـی گرانـە. خۆشەویـستی بەپێچەوانـەی ئـەوەی زۆربەمان لێیتێگەیشتووین مەسەلەیەکی ترسناکە، راستە لەسەرەتا تامی هەنگوینی هەیە، بەلام لەوانەیە دواتر یەکجار تاڵ بێت. زۆر لـە شاعیرو هونەرمـەندان لەسـایەی چیرۆکێکی خۆشەویستیدا ئاژیان کوشتووە. بەلام ئەراگۆنی ناسراو بەجوانی و گـ ـجی وبلیمەتیەکەی

ناکرێ ئاوا بەئاسانی لەگەڵ یەکەم لێداندا بکەوێت،دوارۆژی لەبەر... ـەو هەوڵیشی لەبەردەمدا زۆرن کنش دەزانێ" لەوانەشە خۆشەویستی لەشوێنێکەوە بیـ کە پێی بزانین یان پێی نەزانین. لەزۆربەی حاڵەتەکانیشدا پێینازانین.

خۆشەویستی ئەو کاتە نایەت کەئێمە دەمانەوێت وەدەیخوازین، خۆشەویستی ئەو کاتە دێت کەخۆی دەیەوێ و بەناناگایی شوێن و زەمەن و رەنگە لەشوێنێکەوبێت ئێمە نەمانەوێ، یان هـەرگیز باوەڕ نەکەین. بـەلام کاتێك دێت وەکو شایەکی شەپۆلدار خـۆی دەسـەپێنێ و قابیل بە دەمەتەقێ و گەڕانەوە نییە.

لەو ئێـوارە جوانـەداو، لەیـەکێك لـەجوانترین قاوەخانـەکانی پاریسـدا کـە دەکەوێتـە ناوەراسـتی رێگـای نێـوان (ئـەلمونبارناس)و(ئـەلبۆر رۆیـال) لویـس ئـارگۆن لەگـەڵ خۆشەویستیدا لـەژوان بـوو، لەگـەڵ گـەورەترین چیرۆکی خۆشەویـستی لـەژیانیدا. کاتێك لەقاوەخانەکەی"لاکلوزری دی لیلا" چووە ژوورەوە ئیلـیزا تریـۆلێ دانیشـتبوو وەك ئـەوەی چاوەڕوانی ئەو بکات. بەیەکگەیشتنێك بوو لەرێگەی رێکەوت، بەبێ رێکخستن و ژوان، بەلام بەجۆرێك دەستی پێکرد وەك ئەوەی چەندین ساڵە ئامادەباشـی بۆدەکرێـت. هـەندێك ژوان هـەن نهێنین، نایزانین و پێیـان نازانین، لـەدەرەوەی ویستی ئێمـە دەبەسـترێن و وا پێدەچێـت کەزیاتر لەژوانە راستەقینەییەکان رێکخراو و ئامادەباشیان بۆکراوەبێت. بـەجۆرێك دەستی قەدەر بمانەوێ یان نا بۆ ئەوێمان پەلکێش دەکا. لەم جۆرە ژوانانەش ئەم بەیەك گەیشتنەی نێوان ئەراگۆن وئیلیزایە.

ئەراگۆن کە لەگەڵ دوو هاورێی سوریالیستی لەو گەڕەکە خەریکی پیاسەکردن بوون، گوتی: بۆ ئەچینە ژوورەوەو شتێك بخۆینەوە؟ ئیلیزاش کە بە مانەوەی لەپاریس بێزار ببوو ،هەستی بە بێ ئومێدی و بێتواناییەکی زۆردەکرد و بگرە خەریك بوو بگەڕێتەوە بۆ مۆسکۆ، ئەمیشیان لەژوورەکەی خۆی لەیەکێك لەهوتێلەکانی ئەلمۆنبارناس هەڵسایە سەر پێ و هەنگاوەکانی بەبێ ئاگایی خۆی گەیاندیانە ئەو قاوەخانە جوان و بەناوبانگە. دەیەویست لەوێ دڵی خۆی بداتەوەو خۆی بەتاڵ بکاتەوەو بیر لەچارەو دوارۆژی خۆی بکاتەوە.

گوتمان ئەو قاوەخانەیە بەناوبانگە، چونکە کاتێك تۆ لەسەر کورسیەکانی دادەنیشیت و سەیری مێزەکەی پێش خۆت دەکەی دەبینی ناوی گەورە شاعیرو هونەرمەندانی فەرەنسا لەسەر دارەکە هەڵکۆڵراو ' سێرە ڤیلین وبۆدلێر دانیشتوون ولەوێش جیرارو دۆنرڤ ، ڤیکتۆر هۆگۆ دانیشتوون.لەشوێنێکی دیکەشدا ئەندرێ بریتۆن و لویس ئاراگۆن و پۆل ئیلیوار، ئیدی ئەم قاوەخانەیە تائێستاش هەیەو دەکرێ ئەگەر بۆتکرا سەردانی بکەیت و ئەو کون و قوژبنانە بناسیتەوە کە گەورە شاعیرو نوسەرانی فەرەنسای تێدا دانیشتوون.

ئەراگۆن لەپارچە شیعرێکیدا دەربارەی ئیلیزا دەنوسێت:

"نهێنیەکی گەورەت پێدەڵێم: زەمەن تۆیت
زەمەن ژنێکە پێویستی بەپیاوێکە پیای هەڵبڵێ و
گەورەی بکا.
زەمەن وەك شیعرێکی چڕی شەپۆڵدار
بێکۆتاییە
نهێنیەکی گەورەت پێدەڵێم: من لێت دەترسم
لەو شتە دەترسم کە ئێواران بەرەو پەنجەرەکانت دەبا
دەترسم لەبزاوتەکانت
لەئاماژەکانت
لەو وشانەی کە ناگوترێن.

لەزەمەنی خێراو لەسەرخۆ دەترسم.

لەتۆ دەترسم

نهێنیەکی گەورەم بۆ ئاشکرا کردیت

ئیدی دەرگاکان داخە

ئاسانترە بۆ مرۆڤ بمرێت لەوەی خۆشەویستی بکات.

هەربۆیەش وامن ئەستەم دەژیم

ئەی خۆشەویستی من

**سەرچاوە:**

قراءة في الفكر الاوربي الحديث، هاشم صالح، 1994، ل 55

# گۆرانیەك بۆ شەو!

**زۆراب**

**رەنگ** و بۆیەگرتنەوە مێژووەکەی دوورو درێژە. هونەرمەندان و عاشقانی هونەریی دەزانن مێژووی ئەو رەنگ وبۆیەی ئێستا لەبەردەستدایە چەند سەیرو سەمەرەیە. هەندێك لەهونەرمەندان رەنگ یان بۆیەی تایبەتی خۆیان هەبووە.ئەمەش زیاتر هونەرمەندانی وەك داڤینشی وپێشینەکان دەگرێتەوە.

تا ئەو کاتەی ڤانکوخ خولیای شەوو تاریکایی چووە ناخییەوە کەسێك، هونەرمەندێك نەبووە، توانیبێتی وەکو ئەو لەتاریکاییدا رەنگەکان بەکاربهێنێت. بەڵگەشمان بۆ ئەمە

تابلۆکانیەتی،بڕوانە (شەوی پڕ ئەستێرە)،( قاوەخانە لەئێوارەدا)و تابلۆکانی تری کە بەشەو بەرهەمی هێناون. دەڵێن ڤانکوخ شەپقەیەکی قامیشی یان لاسکەی لەسەردابووە، لەرووی پێشەوەی قەراغی شەپقەکە مۆمێکی داگیرساوی دانـاوەو بـەو جـۆرە سـتافییلەکەی رۆشنکردۆتەوە، یان بلێین پالێتەکەی رۆشنکردۆتەوە تاوەکو بتوانێ مۆتێڤەکانی سەر خام وبۆیەکانی سەر پالێتەکەی ببینێت.

هەندێك جار وا دێتە خەیاڵم لەخۆم بپرسم تۆ بڵێیت چاوی ڤان کوخ تایبەتمەندی خۆی نەبووبێت؟ ئەی چۆن توانیویتی ئەو رەنگە شەوەکیانە بەو شێوە رەسەنە ببینێت؟ یان، چۆن توانیویتی لە تاریکیدا رەنگەکانی تاریکی و شەو لەسەر خامەکەی زیندوو دووبارە بکاتەوە؟

نازانرێت چۆن بووە، ئەوەی بەڵگە نەویستە ئەوەیە ڤانکوخ کاتی زۆری بەشەو لەدەرەوە بردۆتە سەر. کێ دەڵێت هاو دەردییەکەی ڤانکوخ لەگەڵ مانگەشەوو ئەستێرەکان، هەمان هاودەردییەکەی بێکەس لەگەڵ مانگ نەبووە؟!

هەندێکجار وای بۆدەچم ڤـانکوخ هێنـدە تەماشـای ئاسمـانی کـردووە ئەسـتێرەو هەسارەکانی هەموو ناسیوون، یان تەنانەت موعجیزەکانیشی دیون. تۆبڵێیت یەزدان هێندە بەزەیی پێداهاتبێتەوە موعجیزەی پیشان دابێت!؟ نازانین، ئەوەندە هەیە کە لەتابلۆی( شەوی پڕ ئەستێرە ) ورد دەبمەوە دۆش دادەمێنم. ئەو جوڵەو خرۆشانەی دەبینرێت جێگەی سەرسوڕمان ولێخوردبوونەوەیە.

باپێکەوە بزانین (ئینگو بێف ڤاڵتەر) چی نوسیوە، بڕوانە لاپەڕە(105_ 107)ی کتێبی ڤانکوخ کە بەندە لەسویدیەوە وەریگێڕاوە:

( لە " ئەستێرە شەو"دا، کە یەکێکە لەگرنگترین و سەیرترین کارەکانی ڤانکوخ، هەردوو جۆرە فۆرمە هێڵییەکان لەیەك وێنەدا یەك خراون، دووبارە، زیاد لەجارێك، نیگارکردنی شەو تێماو بابەتی وێنەکەیە، بەڵام لەمەیاندا لەهەل و مەرجێکی تەواو جیاوازدا ، ئەمە یەکێکە لە ئیشە دەگمەنەکان کە ڤانکوخ تیایدا لەسروشتە راستەوخۆکە لادەدات و، رەنگ و فۆرمیوا دادەهێنێت بۆ ئەوەی بەتەواوی بەیارمەتی خەیاڵ کەش و هەوایەکی تایبەتی"بخاتەڕوو" و

بیهێنێته پێشەوە. یارییەکی گەردوونی ، زۆر دراماتیکی لەئاسماندا ڕوودەدات. دوو نێبو لە (تەم و مژی)ی گەورە دەرژێنە یەکەوەو، یانزە ئەستێرەی زۆر گەورە کراو بەخولگەی ڕووناکییەکەیانەوە دەرژێنە ناو تاریکی شەوەو،مانگێکی نائاسایی ڕەنگ پرتەقاڵی وادەردەکەوێت ببێت بە خۆر ،)

پاشان دەڵێت:

(چونکە ڕووداوی ڕاستەقینەی وێنەکە لەسەر زەوی ڕوونادات بەڵکو لە ئاسماندایە، لە تابلۆی (ئەستێرە شەودا)، (کە لەوانەیە وێنە-رونیا-یەکی ئاخر زەمانی بێت)، ڤانکۆخ هەوڵی داوە خۆی لەهەست و سۆزی بالادەست ئازاد بکات . لەهەمانکاتدا پێویستە وێنەکە وەکو هەوڵێك سەیر بکرێت کە وێنە ئاسا ئارەزوو خولیای بۆ بێکۆتایەتی سروشت دەردەبڕێت.)

ئیمە دەزانین ڤانکۆخ قەشەبووە، ئاگاداری ئینجیل وتەورات بووە، بەلام نازانین قورئانی خوێندۆتەوە یان نا. دەشزانین لەلای هونەرمەندانی ئەوروپا بۆنەو گێڕانەوە ئاینییەکان کراون بە تابلۆ ، نمونەشمان (دوا شێو)،(العشاء الاخیر)ە. داڤینشی ، دالی و زۆر هونەرمەندی تر، هەریەکەو بەشێوەی خۆی لەرێگەی نیگارەوە تەرجەمەیان کردووە.. نازانین ئایا (شەوی پڕ ئەستێرە) تەرجەمەکردنێکی لەو جۆرەیە یان نا بەلام هەروەك (ڤاڵتەر) ژماردوونی ئەوا ( یانزە ئەستێرە و مانگ کە پێدەچێت خۆریش بێت) دیارن، ئاخۆ ئەمە هەمان شت نییە کە (یوسف) بەباوکی دەڵێت و بۆی دەگێڕێتەوە!؟ بۆ ئەمە بڕوانە: الكتاب المقدس، العهد القديم،(الاصحاح السابع والثلاثون ) لە (سفر التكوين)دا، ظهرس (8_9):" فقال اني قد حلمت حلما ايضا واذا الشمس والقمر واحد عشر كوكب ساجد لي. وقصه على ابيه وعلى اخوته.)

دواتر گەر سەیری قورئانی پیرۆز بکەین ئەوا لە (سورە یوسف)دا، ئایەتی (3) دەخوێنینەوە:" اذ قال یوسف لابیە یاابت اني رايت احد عشر كوكبا والشمس والقمر رايتهم لي ساجدين".

**ناوی کتێب: ڤان کوخ**

**نوسینی: نینگۆنیف والتەر**

**وەرگێرانی لەسویدییەوە:زۆراب**

**بۆسویدی: پیتەر گۆکسام**

**لەبلاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم.**

"ناتوانم هیچ بکەم-خەتای من نییە_ کەتابلۆکانم نافرۆشێن بەلام رۆژێک دێت خەلکی بۆی دەرئەکەوێت کە لەپارەی رەنگەکانیان بەنرخترن".

ڤینسیت ڤانکوخ

راناني: رەگەز رەشید

**کتێبی** ڤانکوخ هەلبژاردەیەکە لەکەڤال و ژیاننامەی هونەرمەندی مۆنەندی "ڤانکوخ 1853–1890 "، کەنوسەرو وەرگێری بەرێز و بەخشندە (زۆراب) لەبەرگێکی قەشەنگ و رێک و پێکدا لەزمانی سوێدییەوە وەریگێراوەتە سەر زمانی کوردی، شایەنی گوتنە چوار کەڤالی ڤانکۆخ پانتایی بەرگەکەیان گرتووەو ناوەوەی کتێبەکەش (75) کەڤال و(17) وێنەی

فۆتۆگرافی تایبەت بەشوێن و ژیانی ڤانکۆخ شانبەشانی نوسینەکان ئەروات و نوسەر هەولیداوە زۆربەی کەڤالەکان بگەرێنێتەوە بۆ رووداوو لایەنە ستاتیکیەکانیان بخاتەروو، شایەنی گوتنیشە لە (75) کەڤالەکانیش، چواریان لەناوناخنی کتێبەکە بەرەنگ ئامێزی دێنە دیتن. لەلایەکی دیکەشەوە لەگەڵ ئەو نووسین و کەڤالانە یاداشت و نامەکانی ڤانکۆخ بۆ"تیو"ی برای و خوشکەکەی بەشێکی نوسینەکە داگیرئەکەن.

ناوناخنی کتێبەکە دابەش ئەبێتە سەر پێنج بەشەوە لەبەشی یەکەمەوە بەناوی(نیوەی کەشیش نیوەی هونەرمەند، سالانی سەرەتای لە هۆلەندا 1881-1885 ".نوسەر بەودێرانە دەست پێدەکات "ژیانە ئەو تاکە تێکشکانێکی گەورەبوو، لەهیچ کام لەو شتانە کە بۆسەردەمەکەی بایەخداربوون سەرکەوتوونەبوو، ئەیتوانی خێزان پێک بهێنێت، خۆی بژێنێت، بەلام لە نیگارکێشاندا توانی ئامرازێك بدۆزێتەوە، ئامرازەکەی خۆی بەهۆیەوە" بتوانێت" بەرپەرچی پشێوی واقیع بداتەوە". هەرلەوبەشەدا (10) کەڤالی ڤانکۆخ بەناوو رووبەروو شوێنەوە نمایش کراون..دواییش دەچێتە سەر ئەو دڵەراوکێ و ناسۆرییانە کە لەپانتایی نامەکانیدا بۆ "تیو"یبرای و یادشتنامەکانی دەبینرێت .. کۆتایی هێنان بەو بەشە کۆتایی هێنانە بەکەشیشی و ژیانی رابردووی ، قسەکردنە لەسەر کەڤالی "ستیل لایف و کتێبی پیرۆزی کراوە" بە ئەندازەیەك دەیگەێنێتە سەر ئەو گوزارشتانەی کە ڤانکۆخ ژیانی رابردوو جێ دەهێلێ و بەهۆی ئەو کوتلە و بەشانە جارێکی دیکە لەسەرەتاوە دەست پێدەکات.

بەشی دووەمی ئەو کتێبەش"سالی خوێندن لەپاریس و ئەنتوێرپێن و پاریس 1885-1888" سەرەتایی دەسپێکردنی بەپەیڤێکی ڤانکوخ دستپێدەکات کە دەبێژێ" من پێم باشترە مانگی سەد فرانکم هەبێت و ئازادبم لەوەی چی لەو پارەیە بکەم، لەوەی دوسەد فرانکم هەبێ بەبێ ئەو ئازادییە" دواییش راستەوخۆ دوای ئەو پەیڤە بۆیەکەم جار لە(ئەنتوێرپێن) ئەدست بەئەنجامدانی تاقیکردنەوەکەی دەکات، بەلام خۆی دادەبرێنێت لەگشت ئەو لاسایی کردنەوە میکانیکانەو بەشێوازی تاکانەی خۆی دەست دەکات بە نیگارکێشان.

ووڕنکی چۆڵ جگە لەڕەنگ هیچی‌تر ناناسن، لەو کاتەشەوە نامەیەک بۆ خوشکەکەی
هنووسێ و دەڵێ( هەروەها لەدەرونیشدا، لەهەوای ئازاددا ، لەدوای شالآوی نەخۆشیەکەوە
ێنندە هەست بەتەنهایی دەکەم، کەئیتر ناوێرم بچمە دەرەوە).

کۆتایی هێنان بەو بەشە قسەکردنە لەسەر کەڤاڵە کۆتاییەکانی ڤانکۆخ و خستنەرووی
وانامەی تەواونەکراوی ڤانکۆخ کە بۆ "تیو"ی برای نوسیبوو. تائەو کاتە خەمۆکی و
ئامۆیی سەرتاپای ڤانکوخ دەگرێ وێنوارەیەک لەکێڵگەیەکی چۆڵ بەدەمانچەیەک کۆتایی
ەژیانی دێنێ.دوا دێرەکانی ئەم بەشە قسەکردنە لەسەر" رەنگ و هێڵ و دارشتن" لە
کەڤاڵەکانی ڤانکوخدا و نوسەر گرێیان دەداتەوە بەژیان و ئاسۆریەکانی هونەرمەند و
هنوسێ" ئەو لەم جیهانەدا ئاسۆری چەشت و لەلایەن جیهانیشەوە لەت و پەتکرا.. لەرێگای
ونەردکەیەرد جیهانێکی ردنگاو رەنگی پڕ جوڵەی بڕخۆ خولقاند، ئەو جیهانەش هەموو ئەو
ڕانیارییانەی تیابوو کە ئەو لەباری ـبوون ـدوە دەیزانی". شایەنی ئاماژەیە ئەوبەشە (20)
کەڤاڵ دەگرێتەخۆ. بەشی کۆتاییش لەسەر ژیان و بەرهەمی ئەو کەڵە هونەرمەندەیە لەیەکەم
ۆژی لەدایک بوونی تا ئەو کاتەی دەمرێ.. لەپاڵ ئەوەشدا وێنەی فۆتۆگرافی(ڤانکوخ) و
تیو)ی برای و کۆمەڵێک لەو شوێنانەی کەتێیدا گوزەراوە وەکو" ژووری لەدایک بوونی،
ژوورەکەی خۆی، ژوورەکانی گەلەری هونەری کەڤانکۆخ تیایدا فێری کڕین و فرۆشتنی
کەڤالی هونەری دەبێت ، خانووی قەشییەتی لە نیونێن، ژوورەکەی لەنەخۆشخانەی
هرونی ، ئەو ژوورەی کە خۆی تیایدا مردووو، دوایش هەردوو گۆڕی"تیو" و ڤانکوخ و
چەندان وێنەی دیکەی تیایە".

ئەوەی جێگای باسە وەرگێڕانی ئەو کتێبە بۆ کتێبخانەی کوردی ئەوەک هەر کارێکی کەم
نییە،بەڵکو زۆریش پێویستە،لەلایەکی دیکەشەوە (زۆراب) ئەوە دووەم کتێبیەتی کە
ەزمانێکی تیۆرییانەی شێوەکاری وەریاندەگێڕێتەسەر زمانی کوردی کە پێشتر کتێبی
ێکاسۆشی بەهەمان شێوە خستەبەردیدی خوێنەرانی کورد، بەم زووانەش کتێبێکی دیکەی
شێوەکاری سەبارەت بە هونەرمەندی ئیسپانی (سیلڤادۆر دالی ) کە لەسویدییەوە
ردوویەتی بەکوردی دەکەوێتە بەردەستی خوێنەر.

هەر لەو بەشەدا ڤانكوخ ئاشنايەتی لەگەڵ "هێنری دو تۆلۆز لۆتریك وئێمیل بێرنارد و كامیل پێسارۆ و گۆكان" پەیدا دەكات و پێشانگای خۆی لە رێستورانێكی خیابانی لەگەڵ "تۆلۆز و بێرنارد و لویس ئەنكوێتلین"دەكاتەوە، بەڵام هیچ لەو كەڤالانە نافرۆشێن.. ئیدی لێرەوە نەفرۆشانی كەڤاڵی ڤانكوخ دەبێتە كێشەیەكی گەورە بۆی.

هەر لەو بەشەدا ڤانكوخ لەپاریس زۆر شت فێر دەبێت وەكو" كاركردنی ئیمپرەشونیزم لەگەڵ رووناكی و هەڵوەشانەوەی رووبەرەكان لە ستراكچەری گرافیكی‌داو رووبەرە زەخرەفییە یابانیەكان و..تاد" ئیدی بەتەواوی لەكۆتایی ئەو بەشەدا روو لە ئەكادیمیەكان و میكانیكیەكان وەردەگێڕی وئەو رێگایە دەگرێتەخۆ كە پێشتر پۆل سیزان پیایدا رۆیشتبوو.. پاشان سەفە بەرەو ئارڵ دەكات. ئەم بەشەش (12) كەڤاڵی لەخۆگرتووە.

لەبەشی سێیەمدا بەناوی" تەقینەوەی رەنگەكان 1888–1889" بەكەڤاڵی "دوانزە گوڵەبەرۆژەكە لە گۆزەدا"دەستپێدەكا، كە یەكێكە لە كەڤاڵە هەرە بەناوبانگەكانی ڤانكۆخ. لەئارڵ ڤانكۆخ كێشەی (مۆدێلی) توش دێت و دەست دەكات بەدروستكردنی سروشت. دوابەدوای ئەوەش ڤانكۆخ كۆمەڵێك مۆدێلی دەست دەكەوێت و رەسمیان دەكێشێ. هەر لەو ساتەوە ڤانكۆخ لەگەڵ گۆكان لەژوورێكدا نیشتەجێ دەبن وەك دوو هاوڕێی شێت و نامۆ پێكەوە دەست دەكەن بەرەسمكردن، بەڵام هەردووكیان هەمیشە پێكەوەو توڕە لەیەكدی دەژیان، بۆیەش گۆكان بڕیاردەدات جێی بێڵێ، تائێوارەیەك ڤانكوخ لەو نامۆییەدا تورەیی دەیگرێ وبەچەقۆیەك گوێچكەیەكی دەبڕێ ، دواییش لەناو زەرفێكی دەنێ و دەیبات بۆسۆزانیەك لەسۆزانیخانەیەكدا، دوای ئەوەی لەبیمارستان دێتە دەرەوە ناوی خۆی بۆنەخۆشخانەیەكی دەروونی دەنوسێ، لەكۆتایی بەشەكەشدا بۆ(سانت رێمی ) دەگوازرێتەوە. ئەم بەشەش (28) كەڤاڵ دەگرێتەخۆ.

پێنجەم بەش بەناوی( نیگاركردن ژیانە/ سانت ریمی ونۆڤەر 1889 1890) ، بەكەڤاڵی كڵێسای ئۆڤەر دەست پێدەكات. دوا بەدوای ئەو كەڤاڵەش چەندەها نامەو قسەكردن لەسەریان دێنەپوو، لێرەشەوە تەواو نامۆیی و خەمۆكی ڤانكوخ دەستپێدەكات.تادێ نامەو كەڤاڵەكانی رەشبینتر دەبن.. هەر لەو بەشەدا نەخۆشی جارێكی دیكە دەیگرێ ودەیباتە

## ئازاد بەرزنجی ،روناکبیر و وەرگێڕ:
## کاری جوانو بەپێزو هوشیار گەرا لەنێوەندی رۆشنبیری کوردیدا

دوای وەرگێڕانی چەندین کتێبی بەپێزەمەر لەرۆمانی چاوەکان وکۆمەڵە چیرۆك و چەند وێسگەیەکی فیکری و ئەدەبی و تریفەی تەنیای سوهراب و لەبارەی تورکیا و ..تاد، لەم دواییەدا کۆمەڵێك وتار وەرگێڕدراوی لە کتێبێك بەناوی ( لەگەڵ عەقڵی خۆرئاوادا ) بەخوێنەرەکانی گەیاندن لەگەڵ عەقڵی خۆرئاوادا، کۆمەڵێك وتاری فیکری و فەلسەفی و ئەدەبی و راو بۆچوونی چەندین نوسەروبیریاری بێگانە لەدونیادا لەخۆدەگرێت کە لەبلاوکراوەنی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەمە، بەو هیوایەی کاك ئازاد بەرزنجی خوێنەرە تایبەتەکانی لە بەرهەمەکانی بێبەش نەکات و لە هەڵبژاردنی بابەت و تێز و بوارەکانی بیرکردنەوەدا بەهەمان شێوەی ئێستا سەرکەوتوو بێت.

**نەوزاد ئەحمەد ئەسوەدو دوو كتێب:**

*** شيعرييەتى دەق و هەنگوينى خوێندنەوە، ناوى كتێبى يەكەمى نوسەرو وەرگێڕ كاك نەوزادە كە لەتوێى (200) لاپەڕەدا كەوتۆتە دەستى خوێنەران و تيايدا چەند دەقێكى شيعرى كەهى(ئازاد صبحى و دانا صۆفى و دلاوەر قەرەداغى و ئەحمەدى مەلان )و چەند چيرۆكێكيش كە هى چرۆكنووسان( رەئووف بێگەردو ئەحمەد محەمەد ئيسماعيل و جەليل كاكەوەيس و جەبار جەمال غەريب و خۆرخێ لويس بۆرخێس)ن ، خوێندنەوەيان بۆكراوەو لەرووى رەخنەييەوە خراوەنەتە بازنەى توێژينەوەى رەخنەيى و خوێندنەوە هەنگوينيەكانى كاك نەوازد، دەقەكانيش لەپاشبەندى كتێبەكە وەك شيعرو چيرۆك بلاْوكراونەتەوە. ئەم كتێبە وەك دەق و رەخنە بەشدارى لە كتێبخانەى كوردى كردووە، كە لەلايەن چاپخانەى رەنج لەسلێمانى بەچاپ گەيانراوە.**

*** كتێبى دووەمى نەواز ئەحمەد ئەسوەد كە بەم دواييانەوە كەوتە بەرديدى خوێنەران لەژێر ناوى (بيريى رەخنەيى هاوچەرخ) بووكە كۆمەلێك وتارى وەرگێرداوى لەخۆ گرتووە، وتارەكانيش هى بيريار و ئەديب و شاعيرە عەرەبەكانى وەك(ئەدۆنيس و جابرى و سەعيد غانمى و د. محەمەد بەرادەو ئيدوارد سەعيدو د. عەلى حرب..تاد)ين جێى ئاماژەيە ئەم كتێبەى كاك نەوزاد كەوەرگێڕدراوە بەسەرچاوەيەكى گرنگ دەزانرێ و ئاشنايەتيمان لە سەر بوارو بيريى رەخنەيى هاوچەرخ لەروانگەى بيريارانى عەرەب پێدەبەخشى و جێگاى سود لێوەرگرتنە، ئەم كتێبە لەدووتوێى (226) لاپەڕدا دەزگاى چاپ و بلاْوكردنەوەى موكريان لەهەولێر بەچاپى گەياندووە.**

## * رەنووف بێکەرد و زۆربا لەباوەشی حەزەکاندا:

یەکێك لەباشترین رۆمانەکانی () زۆربایە کە بەم دواییانە لەلایەن مامۆستای خۆشەویست (رەنووف بێگەرد)ەوە ، بەشیرینترین شێوەی وەرگێڕان کرا بەکوردی، جیالەوەی کە کتێبخانەی کوردی پێویستی بەدەیان وەرگێڕانی لەم شێوەیە هەیە، زۆربا بەکوردی گرنگیەکی زۆری هەبوو بەتایبەت بۆ ئەو نەوەیەی دوای راپەرین کە کەمتردەتوانن لەزمانەکانی تردەوە سود لەبوارو ژانەراکانی تری ئەدەب و رۆشنبیری وەربگرن، زۆربا و سەرۆك هەمیشە وێنەکانی ژیان و سەراب و وێرانییەکانی گێڕانەوەیەکن کە ناکرێ پێیانەکەنین و نەگرین و لێیەوە فێرنەبین ، زۆربا لەرووی زمانەوە بەپێی راپرسەکانی ئێمە وەکو (نما) بەشێوەیەکی زۆر چاك وەرگێڕدراوە، دیارە ئێمە ئەو زمان شیرینی و جوانی بەخشینەی مامۆستا رەئووفیش بەوەرگێڕانەکە، هەم بۆ ئەوە دەگێڕینەوە کە شارەزاییەکی فرەی لەزمانەکانی (فارسی و عەرەبی) هەیە کە وەك خۆی ئاماژەی پێداوە لەهەردوو دەقەکە سودی وەرگرتووە بۆ بەکوردی کردنی، هەم بۆ ئەو ئەزموونە دووورو درێژەی کە مامۆستا لەبواری چیرۆك نووسیدا هەیەتی و شیرین زمانی کردووە.

## *** (دیموکراسیەت .. جیاوازی و پێکەوە ژیان )

ناوی شەشەمین کتێبی سەنتەری نمایە کە بەم دواییانە وەك کۆمەڵێك وتاری نووسین و وەرگێڕدراو لەدوو توێی (203) لاپەڕەدا، کەوتە بەردیدەنی خوێنەران کە لەنوسین و وەرگێڕانی (ئیسماعیل کوردە) بوو.